ئەنوەر سوڵتانی

# لاهووتی کرماشانی

## شاعیری شۆڕشگێڕی کورد



بنکەی ژین
سلێمانی ٢٠٠٦

٩٢٨
س ٣٧٢ سوڵتانی، ئەنوەر.
لاهووتی کرماشانی شاعیری شۆڕشگێڕی کورد / نووسینی ئەنوەر سوڵتانی _ سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٦.
٢٩٩ل، (١٤,٥ × ٢٠,٥ سم).
پاشکۆ: (ل ١٧١-٢٨٩).
١- مێژووی ئێران ٢- مێژووی کورد ذ- ناونیشان
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی پێرست و پۆلێنی سەرەتایی ئامادە کردووە

سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

زنجیرە: ٢٩

کتێب: لاهووتی کرماشانی شاعیری شۆڕشگێڕی کورد

نووسەر: ئەنوەر سوڵتانی

بابەت: مێژوو

تایپ: شەهلا سابیری

مۆنتاج: ڕێنوار

بەرگسازی: قادر میرخان

خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید

تیراژ: ٧٥٠

شوێنی چاپ: سلێمانی-چاپخانەی شڤان

ژمارەی سپاردن: ١٧ی ساڵی ٢٠٠٦

لە بڵاوکراوەکانی

بنکەی ژین

بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی

هەرێمی کوردستانی عیراق- سلێمانی، گەڕەکی ١٠٤ ئاشتی، کۆڵانی٣٩، خانووی ژمارە ١٠،
( بەرامبەر بە قوتابخانەی سەرەتایی ئەردەڵان )
تەلەفۆن: ٣١٢٣١٠٥ مۆبایل: ٠٧٧٠١٤٨٤٦٢٣ یان ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ ژمارەی سنووقی پۆست: ١٤
E.mail: bnkaizhin@yahoo.com

پێشکەش بەو کەسەی وا
بۆ یەکەم جار
لە ڕێگەی شیعری لاهووتی‌یەوە
ئاسیاوی ئەدەبی شۆڕشگێڕانەی کردم،
پێشکەش بە مامۆستا و برام

عومەر سوڵتانی (وەفا)

# پێڕست


سپاسنامە ٧

سەرەتای نووسەر ٩

بەشی یەکەم: بەسەرهات ١٥

بنەماڵە ١٦

منداڵی و مێرمنداڵی ١٧

ساڵانی جەندەرمری ٣٠

جەندەرمری شاری"قوم" ٣٣

حیزبی سۆسیال دیموکراتی ئێران ٤٩

لاهووتی، شەرەفخانەو سمکۆ ٥٣

بەرەو یەکیەتی سۆڤیەتی ٧٥

ژیانی لاهووتی لە یەکیەتی سۆڤیەتی ٧٩

وتاری حەسەنی قزڵجی ٩٣

بەشی دووەم: شیعر ١٠٧

شیعری لاهووتی ١٠٧

خۆشەویستی وڵاتی سۆڤێت و ڕێبەرەکانی ١٢٩

خۆشەویستی ئێران ١٣٠

کرماشان لە شیعری لاهووتیدا ١٣١

لاهووتی، وەك باوکی شیعری نوێی فارسی ١٣٢

شیعری ئایینی ١٣٧

چەشنایەتی شیعرەکانی ١٣٨
تەئسیرهەڵگرتن لە شاعیرانی پێش خۆی ١٣٩
تەئسیری لاهووتی لەسەر شاعیرانی ئێران ١٤٠
تەئسیری ژیان و شیعری لاهووتی لەسەر شاعیرانی کورد ١٤٣
بەشی سێهەم: کارە ئەدەبی و هونەرییەکانی تر ١٥٥
شیعر بۆ گۆرانی ١٥٨
لاهووتی و شانامە ١٥٩
ئۆپێرای "کاوەی ئاسنگەر: ١٦٣
وشەی نوێ ١٦٥
کرۆنۆلۆجی شوێنی ژیانی لاهووتی بەگوێرەی تەئریخی شیعرەکانی ١٦٧
بەشی چوارەم: پاشکۆکان ١٧١
یەکەم: سەبارەت بە خۆم- لاهووتی ١٧١
دووهەم: کورد و کوردستان- لاهووتی ١٨٥
سێهەم: شیعرە کوردییەکان- لاهووتی ٢٥٧
چوارەم: ئەبولقاسمی لاهووتی- سەعید نەفیسی ٢٦٥
پێنجەم: لاهووتی- مونیبور رەحمان ٢٧٧
شەشەم: لاهووتی- حەسەن قزڵجی ٢٨٢
حەوتەم: وەرگێڕاوی کوردی چەند شیعری لاهووتی ٢٨٩

# سپاسنامه

نووسەر بە ئەرکی خۆی دەزانێت سپاسی ئەم بەڕێزانە بکات کە هەرکام بە شێوەیەك یارمەتی بەرهەم هاتنی لێکۆڵینەوەکەیان داوە: بەڕێزان محمدعەلی سوڵتانی، محەممەدی مەلا عەبدولکەریم، عومەری سوڵتانی (وەفا)، رەسووڵ قادری، نەسرین برنا، نەجات عبدالله، ژالە ئیسفەهانی، د. محمد رەزا شەفیعی کەدکەنی (م. سرشك)، عەلی کەریمی، سەباحی غالب، سلێمان چیرە (هێرش) سەرنووسەری گۆڤاری گزنگ چاپی سوید کە سێ بابەتی پاشکۆی ئەم کتێبەی یەکەم جار لە گۆڤارەکەیدا بڵاوکردەوە، کاك عەتا موفتی و بەڕێوەبەرانی رۆژنامەی پەیام چاپی لەندەن کە کورتەی هەر ئەم بابەتەیان سەرەتا وەك پاشکۆی رۆژنامەکە بڵاوکردەوە، دوکتۆر جەبار قادر و چاپەمەنی گلارا لە هۆڵەند ـ کە ئیجازەی بڵاوبوونەوەی وەرگێڕاوی وتاری کورد و کوردستانیان پێدام و منیش کردمە پاشکۆی ئەم وتارە (پاشکۆی دووهەم). سپاسی زۆرم ئاراستەی دوکتۆر ئەمیر حەسەنپوورە کە بەشێکی بەرچاو لە سەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەی بۆ پێك هێنام.

# سەرەتا

ناسیاویی من لەگەڵ لاهووتی و شیعرەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ١٩٥٢ و ٥٣ واتە سەردەمی پێش کودیتای ٢٨ی گەلاوێژی ئێران دژ بە حکوومەتی میللی دوکتۆر محەممەدی مصدق. لەو ساڵانەدا کاشیبەندی رژیمی شا گەلێك شل و شەوێق و چالاکی ناحەزانی رژێم و لە ژوور هەموانەوە جەبهەی میللی و حزبی توودەی ئێران لەوپەڕی خۆیدا بوو. کاکم ـ عومەری سوڵتانی (وەفا)، ئەودەم نوێنەری رۆژنامەکانی تاران بوو لە بۆکان و بەگشتی لەبەر هەڵوێستی چەپ و پێشکەوتنخوازانەی خۆی، تەنیا چاپەمەنیە پێشکەوتنخوازەکانی دەفرۆشت. من، لە تەمەنی ٩ و ١٠ ساڵاندا بووم و نەك هەر رۆژنامەکانی کاکم دەگەیاندە دەست مشتەریەکانی و تەنانەت بە دنەدانی کاکم، بەزۆر بەسەر ئاغاوەتی زاڵمی گوند و بەتایبەت شاری بۆکاندا دەبڕی، لەو کۆڕ و کۆبوونەوە و باس و خواسانەشدا بەشداریم دەکرد کە خوێندەوار و رووناکبیری ئەودەمی بۆکان، رۆژانە لە دووکانی کاکم دەیانبەست ـ دیارە بەشداریکردنێکی نەچالاك و تەنیا بە شێوەی گوێڕاگرتن و شت فێربوون. کاکم زۆری هەوڵ دەدا بابەتی چەپ و پێشکەوتنخواز بخوێنمەوە و شیعری شاعیرانی وەك لاهووتی و

ئەبووتوڕابی جەلی لەبەر بکەم. شیعری لاهووتی کە زۆربەیان دژ بە شا و مەلا گوتراون، تەنیا لە دوو دەرفەتی مێژووییدا دەرەتانی بڵاوبوونەوەی ئازادیان لە ئێران پەیدا کرد: یەکەم لە ساڵانی پێش کودیتای ٢٨ ی گەلاوێژی ١٩٥٣ و دووهەم لە ماوەیەکی کەمی دەوروبەری شۆڕشی ساڵی ١٩٧٩ی گەلانی ئێران. لە هەموو ماوەکانی تردا، دیوان و شیعر و بەسەرهاتی لاهووتی بڤەیەکی ئەوتۆ بووە کە سەری گەلێك خەڵکی لەسەر بە فەتەڕات چوە. شیعرێکی بەم شێوەیە، کە بە هەزارانی لە دیوانی لاهووتیدا بەرچاو دەکەوێت، چۆن دەتوانێ لە بارودۆخی دیکتاتۆریەتی پێشوو و ئێستای ئێراندا مەجالی بڵاوبوونەوە پەیدا بکات ؟

من و آنزمان که کشان کشان، به یتیم های ستمکشان
شـــه و شـــیخ را بدهم نشـــان که ستمگران شما، هلا !
(با ئەو سەردەمە بێت کە من: شاو مەلا نیشانی
هەتیوانی زەحمەتکێشان بدەم و بڵێم زاڵمانی ئێوە ئەمانەن ! )

کاکم کە خۆی شاعیر بوو ــ وەك زۆر شاعیری دیکەی کورد، لاسایی شیعرەکانی لاهووتی دەکردەوە و بۆ برادەرانی خۆی دەخوێندنەوە. بەداخەوە هیچکام لەوانە ئێستا نەماون و هەموویان سووتێنرا ون و لەناو چوون. هەرچۆنێك بێت، خۆشەویستی لاهووتی لە دڵمدا چەسپابوو هەتا ئەوەی بووم بە خوێندکاری زانکۆی ئەدەب لە زانستگەی تاران. ساڵی ١٩٧١ بوو، مامۆستای ئەدەبی هاوچەرخی فارسیمان شاعیری جێگەی رێزی خۆراسانی دوکتۆر محمد رەزا

شەفیعی کەدکەنی (م.سرشك)، ڕۆژێك ناوی هەرکام لە شاعیرانی هاوچەرخی فارسی دەدایە یەکێك لە خوێندکارانی و داوای لیٚ دەکرد لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات هەر گەیشتە سەر ناوی لاهووتی، گوتی: "کرمانشاهیها !" واتە کرماشانیەکان بۆ دەنگ ناکەن ! (ئێرانییەکان هەندیٚ جار ناوی "کرماشانی" لەجیاتی ناوی "کورد" بەکار دەهێنن و کرماشانی لەلایان وەك چەمکی گشتی کوردە). من دەستم بەرز کردەوەو لاهووتی بوو بە ماڵ لەسەرم !

سەردانی هەموو کتێبخانە گشتییەکانی تارانم کرد. لە کتێبخانەی زانکۆی ئەدەبیات نوسخەیەکی یەکەم دیوانی چاپکراوی لاهووتی کە محمد لوی عباس لە ساڵی ١٩٥٢ دا لە تەورێز چاپی کردبوو پارێزرابوو، نوسخەکەم وەرگرت. هەروەها نوسخەیەك لە کتێبی تەزویری "شرح زندگانی من" کە بە ناوی لاهووتی‌یەوە بڵاوکرابووەوە لە کتێبخانەی مەجلیسی شورا یاخود لە کتێبخانەی بچووکی "بنەماڵەی فەرمانفەرما" لەناو زانکۆ، کەوتە دەستم. بابەتێکم لەسەر لاهووتی نووسی و دامە مامۆستاکەم. دوای مانگێك، مامۆستا نووسراوەی خوێندکارەکانی هێنایەوە و گەڕاندیەوە دەستیان بەڵام نووسراوەکەی منی پیٚ نەبوو.

هەندێك ترسام. ئەودەم من لە کوردستان شاربەدەرکرابووم و زۆریش لە گیرانی خۆم دەترسام ـ ئەو بەڵایەی وا دووساڵ دواتر هاتە سەرم ! پاش ماوەیەك مامۆستا هاتە نزیك من و بە ئەسپایی گوتی دوای تەواوبوونی دەرسەکە وەرە بۆ لام. چووم، گوتی وەرە با بڕۆین، بابەتەکەی تۆم نەویست بهێنمە ناو زانستگە، وا لەناو ترومبیلەکەمدایە

با بچین بتدەمەوە. لە ڕێگا هەندێ قسەی لەگەڵ کردم کە هەر ئەوە بوو بە هۆی ناسیاوی دواترمان لەگەڵ یەکتر. ئینجا لە دەرەوەی زانستگە لەسەر شەقامی "تخت جمشید" نامیلکەکەی داوە دەستم و هەندێ تێبینی بە قسە پێگوتم، چونکە بە سەلاحی نەزانیبوو کە دەستخەتی بەسەر نووسینە توندوتیژەکەی منەوە بمێنێت. منیش کە بارودۆخەکەم دەناسی، هیچ بەوە دڵگیر نەبووم. دواتر نازانم کەی و چۆن نووسینەکەم فەوتا و ئیتر نەمدیتەوە، بەڵام مەسەلەی لاهووتی لای من هەرمایەوە، هەتا هاتمە دەرەوەی وڵات و لێرە، لەسەرەتاوە دەستم کرد بە خوێندنەوەی شیعر و دۆزینەوەی سەرچاوە لەمەڕ لاهووتی.

لە ساڵی ١٩٩٧ دا کورتەی نووسراوەکانی خۆم لەمەڕ لاهووتی پێشکەش بە برادەرانی ڕۆژنامەی پەیام ـ چاپی لەندەن کرد و ئەوانیش بە دڵفراوانییەوە وەك نامیلکەیەکی سەربەخۆ کردیانە پاشکۆی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەکە. ناوی نامیلکەکەم نابوو "هێلکەی دۆڕاو" لەبەر ئەوەی دەمزانی لاهووتی کورد بووە بەڵام تەنیا بە فارسی شیعری گوتوە و گەلێکش بەوە دڵگیر بووم. من لاهووتیم بە مریشکێکی هێلکەکەر دەزانی کە هێلکەکانی لە ماڵی دراوسێ دەدۆڕێنێ و تەنیا شتی تر دەهێنێتەوە ماڵی خاوەنی ! لاهووتیش وتارێکی گەلێك سەلبی لەسەر کورد نووسیوە کە لەو شتە زیاتر نەبێت کەمتر نییە !

ئەم بۆچوونەم دوای بڵاوبوونەوەی نامیلکەی گۆڕین، هەر ما، بەڵام زۆر بەدوای سەرچاوەی نوێدا دەگەڕام بۆ ئەوەی بابەتێکی کوردی لە لاهووتی بدۆزمەوە. ژیننامەکەی خۆی و وتارێکی سەعیدی نەفیسی و

بابەتێکی ناو دائره المعارف اسلامم وەرگێڕایه سەر زمانی کوردی که لە گۆڤاری گزینگ چاپی سویددا بڵاوبوونەوە. (بڕوانه پاشکۆی ١ و ٤). دواتر، د. جەبار قادر وتاره بەناوبانگەکەی لاهووتی به ناوی "کورد و کوردستان"ی وەرگێڕایه سەر زمانی کوردی و بڵاوی کردەوە، هەروەها کاك محمد عەلی سوڵتانی و کاك کاوەی بەیات هەندێ بابەتی نوێیان لەسەر ژیانی لاهووتی نووسی، گەرچی له هیچکامیاندا باسێك له شیعری کوردی لاهووتی نەکرابوو.

هەتا ئەوەی له ساڵی ٢٠٠٠ دا، کاك محمد عەلی سوڵتانی بەرگی سێهەمی "حدیقه سولتانی" چاپ کرد که تایبەت به شیعری شاعیرانی کرماشانییه و لەوێدا شیعرێکی کوردی لاهووتی بڵاوکردەوە. ماوەیەك دوای بڵاوبوونەوەی شیعرەکە، مامۆستای بەڕێز کاك محەممەدی مەلاکەریم له نامەیەکدا (ساڵی٢٠٠٢) بۆی نووسیم که له ژماره ٢٥ی ساڵی پێنجەمی گۆڤاری ژین چاپی ئەستەموولدا شیعرێکی لاهووتی له لاپەڕه ١٨ تا ٢٠ دا بڵاوبۆتەوە و ناوی "لاهووتی خان"ی لەژێر نووسراوە. ئیتر من شاگەشکه بووم ! حەجم بۆ هاتبووە سەر لەج ! ئەوەی له ئاسمان بۆی دەگەڕام لەسەر زەوی دۆزیبوومەوە. شیعرەکە، بەڕێز د. جەبار قادر له ڕێگەی کاك سەباحی غالبەوە بۆی ناردم. ئیتر کاری من کەوته برەوە، حەق گەیشتەوە دەستی حەقدار و ماڵی براو گەڕایەوە دەست خاوەنی ! هەردوو شیعرەکەم بەسەرەتایەکەوە له گۆڤاری گزینگدا چاپ کرد. (ژماره ٣٩و ٤٠، هاوین و پایزی ساڵی٢٠٠٣).

<u>ئەم کتێبەی که ئێستا لەبەردەستی خوێنەردایه، مێژوویەکی وا دووروودرێژی لەپشتەو خۆشحاڵم که ئەو شاعیره ناوداره جیهانییەی که</u>

بەگوێرەی شیعرە فارسییەکانی وەك شاعیری فارس و ئێرانی دەناسرا، ئێستا دێتە ناو مێژووی ئەدەبی کوردییەوە ـ باوەکوو ئەویش وەك زۆر ئەدیب و شاعیری دیکەی کورد شیعرە سەرەکییەکانی بە زمانی بێگانە گوتبێت. لاهووتی نەك هەر جێگەی شانازی کوردە بەڵکوو کەسایەتییەکی خزمەتکاری مرۆڤایەتییە و هەتا چەوسانەوە و ناتەبایی چینایەتی لە کۆمەڵگای مرۆڤدا بمێنێ، وەك داژدار و خەمخۆر و لایەنگری چەوساوە و زەحمەتکێشانی جیهان ناوی لاهووتی هەر دەمێنێ. ئەگەر منیش توانیبێتم ئەو کەسایەتیە گرشەدارەی کورد بە گەلەکەی خۆی بناسێنم، ئەرکی خۆم بەجێ‌هێناوە و گەلێکیش شانازی پێوە دەکەم.

نووسەر

لەندەن

٢٠٠٥/١/١٢

# بەشی یەکەم

## بەسەرهات

"میرزا ابوالقاسم لاهووتی کرماشانی" ـ شاعیر، نووسەر، وەرگێڕ، ڕۆژنامەگەر و چیرۆکنووسی شۆڕشگێڕی کورد، لە ڕۆژی ٤| ١٢| ١٨٨٧ی زایینی لە شاری کرماشان هاتۆتە دنیا (ڕەحمان، مونیبور). زۆربەی سەرچاوەکانی بەردەست ساڵی ١٨٨٧ بە ساڵی لەدایکبوونی لاهووتی دەزانن (نەفیسی، سەعید، ١٩٤٦، مەردۆخ، عەبدوڵڵا، ١٩٩٥، هـ ، موشیری، بهروز ٧)، بەڵام هەندێ سەرچاوەی تر قسە لە ساڵی ١٨٨٥یش دەکەن (قزلجی، حەسەن). سێ سەرچاوەش هەن، کە ساڵی لەدایکبوونی لاهووتییان بە ١٣٠٥ی کۆچی مانگی داناوە (بەیات، کاوە،١٩٩٧، ١٦، بەشیری، ئەحمەد، ١٩٧٩، پانزدە، ئاریەن پوور، یحیی، ١، ١٦٨). ئەم ساڵی ١٣٠٥ـەش بەرانبەرە لەگەڵ سێ مانگ و سێزدە ڕۆژی کۆتایی ساڵی ١٨٨٧و هەشت مانگ و ١٨ ڕۆژی ساڵی ١٨٨٨ی زایینی.

## بنەماڵە

باوکی لاهووتی ـ میرزا ئەحمەدی ئیلهامی، بە بنەچەك فارس یا لوڕ و خەڵکی دەوروبەری "بهبهان" بوو لە باشووری ئێران. ئیلهامی، لەگەڵ باوکیدا سەرەتا چووبووە ئیسفەهان و پاشان تویسرکان، ئینجا

گەیشتبووە کرماشان" و لەوێ حاوابووەوە و ژنی هێنابوو (موشیری، ئەحمەد، هفت). دایکی لاهووتی لە هۆزی سەنجابی بوو و بە شێوەی ئاسایی بەشێك لە ژیانی منداڵیی کوڕ، لەناو هۆزی دایکیدا تێپەڕ بوو، تەنانەت دواتریش لەسەردەمی چالاکی سیاسی خۆیدا هەر پەنای بردەوە بەر ماڵی خاڵوانی و بە یارمەتی خانانی سەنجابییش بوو کە لە ئێران چوە دەرەوە.

باوکی لاهووتی بە بەر پینەچیەتیەوە شیعری دەگوت و دووکانەکەی بووبووە مەکۆی شاعیران و ئەدیبان و هەروەها مۆڵگەی "ماسۆن"ـەکانی "مجمع ئادەمیت"ی شاری کرماشان (لاهووتی، سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی١). ئەو هاتوچۆ و پێوەندەییانەی ماسۆنەکان لەگەڵ باوکیدا بوو بە هۆی گۆڕانی چارەنووسی لاهووتی و چوونی بۆ تاران و پێوەندیگرتن لەگەڵ هێزە سوسیال دیموکرات و چەپەکان، کە درەنگتر زیندان و ئاوارەیی و ژیانی ئەستەمووڵ و تاجیکستان و مۆسکۆ و مردن لە دوورە وڵاتی بەشوێندا هات. ماسۆنەکان خەرجی چوونە تارانی لاهووتییان دابین کرد، لاهووتیش لە دووشوێندا دەست نیشانی ئەم راستیەی کردووە کە دواتر باسی لێوە دەکەین.

## منداڵی و مێرمنداڵی

ئیلهامی ـ کە خۆی دواتر بوو بە شاعیرێکی ناسراوی کرماشان و دیوانی شیعرە فارسییەکانی چاپ کرا، هەر زوو ئەبوالقاسمی ناردە بەر خوێندن و بەرەسمی سەردەم بەرگی فەقێیەتی لەبەر کرد. بێچوە مراوی

هەر لەو تەمەنانەدا دەستی بە شیعر گوتن کرد و لە وتارێکدا، کە دەکرێ بڵێین ژیننامەی خۆیەتی، لەم بارەیەوە دەڵێ: منیش لاسایی پاڵەوانی قەدیمم دەکردەوە و بۆ شەڕەگەڕەکی منداڵان"رەجەز"م دەگوت، ئەم شیعرانە یارمەتی هەواڵەکانمی دەدا باشتر بجەنگن" (لاهووتی، سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ١).

من دواتریش دەگەڕێمەوە سەر باسی ئەم "رەجەز"انە و دووری نازانم هەموو یا بەشێکیان بە کوردی گوترابێتن لەبەر ئەو هۆ ئاشکرایەی کە دیارە منداڵانی کرماشانی دانیشتووی گەڕەکێکی هەژارنشینی کرماشان (ئاوشوران)، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا بەگشتی کورد بوون و زمانی پێوەندگرتنیشیان لەگەڵ یەکتر هەر کوردی بووە، بەم پێیە، "رەجەز"ی لاهووتی دایە کوردیش کە بۆ هاندانی ئەوان گوترابێت هەر دەبێ بە کوردی بووبێت. لە قۆناغێکی دواتردا، دڵی پڕ لە هەست و سەری زیادەخوازی لاهووتی بردوویەتە ناو کۆڕی دەروێشانی"نعمت اللهی"یەوە. وێدەچێ لە کۆمەڵگای داخراوی ئەوەدەمی کرماشاندا ــ کە، تان و پۆی بە ئایین چنرا بوو، دەروێشایەتی تاقە دەرەتانگەیەك بووبێت بۆ دەربازبوون لە نیزامی ویشکی ئایینی ــ کۆمەڵایەتی ئەودەم، بەتایبەت کە شارەکە مەنزڵگەی ئەو زیارەتکەرە ئێرانییانە بوو وا جەم جەم و پۆل پۆل بەرەو نەجەف و کەربەلا دەچوون یا کاروانی مردوویان لە هەموو شوێنێکی ئێرانەوە بەرەو عیراق دەبرد و لە "عەتەبات" دەیاننناشتن. سەبارەت بە ئایینی بنەماڵەی لاهووتی زانیاری راستەوخۆ بەدەستەوە نییە، بەڵام وا هەیە بە یارمەتی هەر ئەو وتارەی وا بە ناوی "سەبارەت بە خۆم"ەوە دواتر

له سۆڤیەت نووسی، هەروەها بە یارمەتی هەندێ لە شیعرەکانی، بتوانرێ بگوترێ ئایینی دایك و خاڵوانی "یارسان" (علی اللهی) واته کاکەیی بووە لەکاتێکدا میرزا ئەحمەدی باوکی وێدەچێ"بەهایی"بووبێت. ئەوەی بێگومانە، لاهووتی خۆی سەرەتا علی اللهی بووە و بۆ ماوەیەکی کەم بۆتە بەهایی و دواتریش هەر بە گشتی ئایینی ناوە بە تاقەوە و بە توندی دژکاریی کردووە. سەبارەت بە "علی اللهی"بوونەکەی لە شیعرێکدا بە ڕاشکاوی دەڵێ:

من خود علی الاهیم　　　حق داده این آگاهیم

**(شیعری "اکسیر"، دیوان، ل ٨١٤).**

لەمەڕ بەهاییبوونی باوکیشی لە وتاری "سەبارەت بە خۆم"دا باسی ئەوە دەکات کە چۆن باوکی بردوویەتە "مەحفیل"ی بەهاییانەوە و بۆ ماوەیەکی کەم بۆتە بەهایی، بەڵام پاش ئەوەی کەرامات و موعجیزەی چاوەڕوانکراو، سوودیان نەبەخشیوە ئەویش هەڵگەڕاوەتەوە و وازی لە بەهائیەت هێناوە (بڕوانە وتاری "سەبارەت بە خۆم"، پاشکۆی١).

وەك گوترا، لاهووتی لە قۆناغێکی ژیانی خۆیدا دەچێتە ناو کۆڕی دەروێشانی "نعمت اللهی"یەوە. سەرەتا و کۆتایی ئەو دەروێش بوونەی لاهووتی وا هەیە نەتوانرێ بە روونی دیاری بکرێت، بەڵام هەرچی هەیە، هی سەردەمی دوای مێرمنداڵی و پێش چوونی بۆ تارانە. لەم قۆناغە تایبەتەی ژیاندا، لاهووتی دەبێتە مورید و سەرسپێردەی مورادێکی خاوەن ڕێز و ئیعتیباری ناوچەکە بە ناوی"سید محمد صالح حەیرانعلیشای ماهیدەشتی".

شیعری دوای تەمەنی ١٥ ساڵی لاهووتی کە لێرە و لەوێ چاپ بوون مۆرکی هەستیاری و بەرپرسیایەتی کۆمەڵایەتییان پێوە دیارە. سەعید نەفیسی دەڵێ یەکەم شیعری لە ١٩ ساڵیدا چاپ کردووە (نەفیسی، سەعید، ١٩٤٦، پاشکۆی٣). دەگونجێ کە چەرمەسەرێی ژیان و ناتەواوی و هەژاری، گەلێك زوو تۆوی پرسیاری گەورەی لەمەڕ ژیان و چارەنووس لە مێشکیدا چەندبێت و کردبێتیە ناسیاوی ئەرك و کاری کۆمەڵایەتی. ئەم یەك دوو نموونەیەی شیعرەکانی ئەو سەردەمەی لاهووتی پەسندی بۆچوونێکی ئەوتۆ دەکەن:

"اگر چه طفلم، لیکن ز یمن پیر مغان
دلم به مکتب وحدت معلم جان است"

**(شیعری "عرش حقیقت"، دیوان، ٧٨٧)**

منکه بینی نهال پر ثمرم
عشق بیغ است و صدق برگ و برم
کودکی بیش نیستم، اما
رهبر صد هزار ها نفرم

**(شیعری "فرشته"، دیوان، ٨٤٣٥).**

هەر ئەو هەڵوێست گرتن و هەست بە بەرپرسیایەتی کردنەیە کە دەبێ بردبێتیە کۆڕی دەروێشایەتی "حەزرەتی حەیران عەلیشا"وە:

روان من، دل من، دو دیده من
زتو است روشن ای سید نکو فرجام

**(شیعری "ستایش پیر"، دیوان، ٧٥٠).**

خط راه تواست قطب العارفین و واصلین،
سید صالح شعار و عارف نیکو خصال

(شیعری "خضر راه"، دیوان، ۸۳۸).

واهەیە هەر لەژێر تەئسیری ئەم دەروێشایەتیەشدا بووبێت کە میرزا ابولقاسم نازناوی خۆی لە "ئیلهامی"یەوە کردبێتە "لاهووتی"، کە واتای وشەکە لەگەڵ بیرو بۆچوونی دەروێشایەتی ئەو دەمیدا دەگونجێت. دەبێ هەر لەسەروەندی ئەو دەروێشایەتیەدا بووبێت، کە لاهووتی بۆ ماوەیەکی کەم سەر لە کۆڕ و "مەحفیل"ی بەهائیان دەربێنێ بەلام کاتێ کە هەست دەکات وەڵامی پرسیارەکانی ژیان لەوێش وەرناگرێتەوە، هەر زوو بەجێیان دەهێڵێ وئیتر سۆراغیان لێ ناگرێت. ئاشکرایە کە بیری تیژو ڕۆحی تینووی لاهووتی بەوە ڕاناوەستێ و بەدوای دەرەتانی گونجاوتردا دەگەڕێت، دەروێشایەتی نەیدەتوانی بیری بەرزەفڕی لاهووتی تێراو بکات، وەك نەیشیکرد.

بەگوێرەی سەرچاوەیەك، شوێنی یەکەم شیعرە چاپکراوەکانی لاهووتی لە مانگی چواری ساڵی۱۹۰۰ لە ڕۆژنامەی "تربیت" چاپی کرماشاندا هەڵدەگیرێت (بەشیری، ئەحمەد؛ بیست و شەش)، بەلام سەرچاوەیەکی تر (تاریخ ادبیات، یحیی، ۲، ۱٦۸)

دەڵێ یەکەم شیعری لە ڕۆژنامەی "حبل المتین"ی مالکوڵم خانی ئەرمەنی چاپی کەلکەتەی هیندستاندا بلاوکراوەتەوە و تەنانەت ناوی ڕۆژنامەی "ایران نو"و "شەرق"یش وەك شوێنی چاپ بوونی یەکەم شیعرەکانی لاهووتی دەست نیشان دەکرێن (مونیبور، ڕەحمان، پاشکۆی ٥، قزلجی، حەسەن، پاشکۆی ٦). بەم پێیە، لاهووتی دەبێ

توانایەکی بەرزی شاعیری هەبووبێت کە لە تەمەنی ١٣ یا ١٥ساڵیدا شیعریان لە کرماشان یا کەڵکەتە بۆ بڵاوکردبێتەوە، گەرچی وا هەیە دەوری ماسۆنەکان و ئەوی هەرەمەزنیان مالکۆم خانیش لەبەرزکردنەوەی ناوی ئەندامێکی خۆیاندا سەرەکی بووبێت. ئەوەی کە توانای شاعیریی لاهووتی دەسەلمێنێ ئەوەیە کە لە تەمەنی ١٩ ساڵیدا یەکەم دیوانی شیعرەکانیشی لەژێر چاپ هاتۆتە دەرێ (رائین، اسماعیل، ١، ١٩٧٨، ٦١٩).

بەکورتی، ژیانی کرماشانی لاهووتی بە چەند رووداو دەنەخشێنرێت: چوون بۆ قوتابخانە، رەجەزگوتنی سەردەمی منداڵی، فەقێیەتی، دەروێشایەتی، بە بەهاییبوون و لێی پەژیوان بوونەوە، و هەروەها چاپی شیعر و دیوان. جگە لەو رووداوانە و تاقە رووداوێکی تر، کە لێرەدا باسی لێوە دەکەم، هیچ شتێکی گرنگ لە ژیانی سەردەمی مێرمنداڵی و لاویەتی لاهووتی لە کرماشان نازانرێت، ئەو رووداوەش خاوەنی گرنگایەتی تایبەتە. ماسۆنەکانی کرماشان (یا بەو جۆرەی وا لە ئێران ناودەبرێن: "فراما سۆنەکان")، لە سێ قۆناغی جیاواز و لەژێر سێ ناوی جیا جیادا چالاکییان نواندوە: یەکەم بە ناوی "فەرامۆشخانە" لەسەردەمی حوکمی امامقلی میرزای عمادالدولەدا، دووهەم بە ناوی "مجمع ادمیت" و سێهەم "جامع ادمیت". (سوڵتانی، محمد علی، ١٩٩٩، ١، پەراوێزی لاپەڕە ٦١). بەگوێرەی نووسینی محمد علی سوڵتانی (هەمان) ، لاهووتی و باوکی ئەندامی "مجمع ادمیت" بوون لەکاتێکدا کە ئیسماعیل رائین، ناو لە "جمعیت ادمیت" دەبات (رائین، اسماعیل، ١، ١٩٧٨، ٦١٩).

هەرچۆنێك بێت، لاهووتی لە وتاری "سەبارەت بە خۆم" دا بە ڕاشکاری دەڵێ: "ئەنجومەنی ماسۆنەکان ناردمیان بۆ تاران بۆ دەرس خوێندن" (پاشکۆی ژمارە ١).

روون نییە لەو ماوەیەدا لاهووتی چی بۆ ماسۆنەکان کردووە بەڵام هەر ئەوەی کە لە ماوەی ژیانی سۆڤیەتی خۆیدا بە ڕاشکاوی و نەترسییەوە باسی ئەندامیەتی ماسۆنەکان دەکات، دەبێ کارو چالاکییەکی ئەوتۆی بۆ نەکردبێ. هەرچۆنێك بێت، ئەوەی جێی گومان نییە ئەوەیەکە لاهووتی گەنج، بە پیتاکی ماسۆنەکان روو دەکاتە تاران و لە قوتابخانەیەکی گرنگی شەقامی "لالەزار" ناوی دەنووسێت، بەڵام کوڕە پینەچییە کرماشانیە خاوەن هەستەکە، لەناو کوڕە دەوڵەمەندی تارانیدا هەڵناکات و قوتابخانەکە بەجێ دەهێڵێت (سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ١). ماوەی ژیانی لاهووتی لەنێوان جێهێشتنی قوتابخانەکەی لالەزارو چوونە ناو رێکخراوەی تازە دامەزراوی "جەندەرمری دەوڵەتی"دا، تارادەیەك تاریك و نادیارە. دەزانین کە کرماشانی لە ساڵی ١٩٠٤ دا بەجێهێشتوە رچۆتە تاران، دەشزانین لە ساڵی ١٩١١دا چۆتە ریزی "جەندەرمری دەوڵەتی"یەوە، بەڵام لە ماوەی ٧ ساڵی نێوان ئەو دوو تەئریخەدا لاهووتی بەچییەوە خەریك بووە؟ ئەوە جێگەی باسی ئێستامانە.

رووداوی هەرە گرنگی مێژوویی نێوان ئەو دوو تەئریخە، بزووتنەوەی مەشرووتەخوازی، هەڵبژاردنی نوێنەرانی یەکەم پەرلەمانی ئێران، "استبداد صغیر" واتە داخرانی مەجلیس و حوکمی دیکتاتۆری محمد عەلی شا، شەڕی رەشت وتەورێز، هەڵاتنی محمد عەلی شاو دامەزرانەوەی سەرلەنوێی مەشرووتە و پەرلەمانە.

بزووتنەوەی مەشرووتەخوازی ئێران لە ساڵی ١٩٠٥ دا دەستی پێکرد و لە ئۆگوستی ١٩٠٦دا، بە دەرچوونی فەرمانی مەشرووتیەت لەلایەن موزەفەردین شای قاجارەوە گەیشتە ئەنجام. دوای پێنج مانگێك، موزەفەردین شا مرد و محمد عەلیشا هاتە سەر حوکمی ئێران. ئەو هەر لەسەرەتاوە لە مەشرووتە و مەشرووتەخوازنی هەڵپێچاو لە ئەنجامیشدا مەجلیسی شۆرای دایە بەر تۆپ و قفڵی لە دەرگاکەی دا. ئاگری خەباتی شۆڕشگێڕان دژ بە هەڵوێستی شاو لایەنگرە رووسەکانی لە هەموو ئێران، بەتایبەت لە هەندێ شوێنی وەك تاران و رەشت و تەورێز هەڵگیرسایەوە. محمد عەلیشا هەڵات، ئەحمەد شای منداڵ گەیشتە سەر تەخت و مەشرووتیەت و پەرلەمان سەرلەنوێ دامەزرایەوە (١٩٠٨).

لاهووتی لەو ماوەیەدا لەبەرەی مەشرووتەخوازیدا خەبات دەکات و بە قەڵەم و قەدەم دژ بە هێزی ئیسیبداد دەوەستێت. پاش دژایەتی کردنی محمد عەلیشا لەگەڵ مەشرووتیەت (استبداد صغیر)و کاتێ کە سەنگەری مەشرووتەخوازان لە تاران لەژێر زەبری کۆنەپەرەستاندا چۆڵ دەکرێن،خەباتکاران هەمووی دەگیرێن و دەکوژرێن یاخود هەڵدێن. لاهووتیش روو دەکاتە شاری رەشت لە باکووری ئێران، بەڵام لە رێگە دەگیرێت و لە شاری "کەرەج" لەگەڵ خەڵکانێکی زۆری دیکە، لە "تەویلە"یەکدا زیندانی دەکرێت. . لە ئوتۆبیۆگرفیەکەیدا، لاهووتی باسی ئەو تەویلەیە دەکات و دەڵێ سەربازێکی کورد، شەوێك لە بەندی رزگار کردم، ئینجا لەوێوە بەناو بەفر و سەرمادا رۆیشتم هەتا خۆم گەیاندە دەوروبەری رەشت (سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ١)،

وەك پێشتر گوترا مێژووی ئەو ساڵانەی ژیانی لاهووتی هەندێك تاریك و نادیارە و بە روونی نازانرێ لاوە کرماشانیەکەمان لەو ماوەیەدا بە چییەوە خەریك بووە. بەڵام لە شیعرەکانی وا دەردەکەوێت کە هاوخەباتی شۆڕشگێڕان بووبێت. ئەحمەدی بەشیری لەسەرەتای دیوانی لاهووتیدا دەنووسێ: "شوێنی لاهووتی لە شەڕی نەتەوەییدا دیاربوو ـ هەندێ جار لەناو مەشرووتەخوازان و هەندێك جاریش لەناو سوپای ئازادیبەخشی گیلاندا، رۆژێك لەگەڵ سالارالدوله و یار محمد خانی کرماشانی لە کرماشان، رۆژێکیش لە کاتی ئابلووقەدرانی تەورێز، لەناو شەڕکەرانی ئازەربایجانیدا" (بەشیری، ئەحمەد، حەفتاوشەش). بۆچوونەکانی بەشیری کە محمد عەلی سوڵتانیش دووپاتی کردوونەتەوە (١، ١٩٩٩، ١٢٨) پێویست بە هەندێ روونکردنەوە دەکەن. یەکەم، "یارمحەممەد خان" لە قۆناغێکی خەباتی خۆیدا نێوانی لەگەڵ لایەنگرانی مەشرووتە تێك دەچێت و دەچێتە بەرەی سالارالدولەی کوڕی محمد عەلیشاوە کە لە کوردستان و کرماشان و لوڕستان سوپای کۆدەکردەوە بۆ ئەوەی بیانباتە تاران و هێزی مەشرووتەیان پێ بشکێنێت.

سەبارەت بەوەی کە ئایا لاهووتی دوای هەڵاتن لە زیندانی کەرەج لەگەڵ ئەو تاقمە کەوتووە یان نا، زانیارییەکی تر جگە لە قسەی بەشیری بە دەستەوە نییە و خۆیشی باسی ئەو مەسەلەیەی نەکردووە. دەزانین کە سوپای سالارالدوله لە رێگەی هەمەدان ـ تاران تێك شکاو ئاسەواری بەر بەرەکانی ئەو شازادە شەڕانخێوە نەما. وا بزانم بەشیری ئەو بۆچوونەی خۆی لەسەر بنەمای شیعرێکی لاهووتی دەربڕیوە کە دواتر باسی لێوە دەکەم.

دووهەم، ناوبراو شیعرێکی دیکەی لاهووتی کردۆتە ئەساسی بۆچوونی لەمەڕ بەشداریکردنی لە "بزووتنەوەی جەنگەڵ"[٢]. شیعرەکەش گەلێك بە ڕوونی مەسەلەی ئەو بەشداریکردنە دەردەبڕێت. ئەوەی ئاشکرابێت، بزووتنەوەی جەنگەڵ بە ڕێبەرایەتی "میرزا کوچك خان" و احسان الله خانی دۆستدار" ماوەیەکی ٧ تا ٨ ساڵەی کێشاوە واتە لەپێش سەرهەڵدانی شەڕی یەکەمی جیهانییەوە هەتا سێ ساڵ دوای شەڕ- کە بە حیسابی ژمارە، دەکاتە نێوان ساڵانی ١٩١٣ و ١٩٢١. ئەم ساڵانە کاتێ بەرانبەر بە ڕووداوەکانی لاهووتی دابنرێن، لەگەڵ ناوەرۆکی زەقی شیعرەکە و بەشداریکردنی ڕاستەوخۆی لاهووتی لە بزووتنەوەی جەنگەڵدا یەك ناگرنەوە، مەگەر پێش چوونی لاهووتی بۆ ناو جەندەرمری رووی دابێت.

هەرچۆنێك بێت، لاهووتی، لە دوو پارچە شیعردا باسی بەشداریکردنی خۆی لە بزووتنەوەی مەشرووتە و جەنگەڵدا دەکات:

یەکەم، بەشداریکردن لە بزووتنەوەی مەشرووتە:

در ایران چون بضد ظلم شاهی    بپا شد بیرق مشروطه خواهی ...
که منهم رهبر یک دسته بودم    براه خلق پیمان بسته بودم

(شیعری "دوستم"، دیوان ، ٥١٠)

دووهەم: بەشداریکردنی لە بزووتنەوە جەنگەڵ ـ کە بەشیری دەڵێ لە ساڵی ١٩٠٨ دا بووە (بەشیری ، ئەحمەد، هفتاد و هفت):

به رشت از قوه های انقلابی    خبر آمد زفتح و کامیابی ...
قشون ما، شده آنجا سه دسته    بروی این یک، آن یک راه بسته....
بگفتیم این زمان وقت جدل نیست    به کار ما بتر از این خلل نیست...
دوباره بانگ شادی بر فلک شد    قوای مختلف گردیده، یک شد ...

قد خود، خم زروی اسب کردند    نشان بر سینه ما نصب کردند...
(شیعری "دونشان"، دیوان، ۳۶۶ تا ۳۷۹).

ئەم شیعرە، وەك لەناوەکەی دەردەکەوێت، باسی دوو میداڵیا دەکات کە لە ماوەی تەمەنی لاهووتیدا خەڵاتی کراوە، یەکیان لە ساڵی ۱۹۰۸ کاتێ کە دووبەرەکێ و سێبەرەکێ کەوتبووە ناو ریزی شۆڕشگێڕانی مەشرووتەوە لە رەشت و گیلان، لاهووتی هەوڵی ئاشت بوونەوەی لایەنەکانی داوە و لە کاری یەکگرتنەوەی هێزەکاندا، سەرکەوت و دەستکەوتی هەبوە. سێ بەرەی لێکهەڵبڕاویش بەگوێرەی شیعرەکە، بریتی بوون لە خەباتکارانی فارس و ئازربایجانی و ئەرمەنی. لە ئەنجامی یەکگرتنەوەکەدا دووسوارەی فارس و ئازەربایجانی هاتوون ومیداڵیایان لەسەر سینگی لاهووتی داوە و ئەوەش بە دەربڕینی ئاشکرای شیعرەکە، لە ساڵی ۱۹۰۸دا بووە، واتە ساڵی هەرەسی مەشرووتە و سەرهەڵدانەوەی خەبات دژی محمد عەلیشا. بەشی دووهەمی شیعرەکە، پێوەندێکی بەم رووداوانەوە نییە و لە ساڵی ۱۹۳۵ دەدوێت کە ستالین میداڵیای لێنینی لەسەر سینگی لاهووتی داوە و بەم شێوەیە، لاهووتی یەکەم کوردێك بووە کە میداڵیای لێنینی وەگرتبێ (دەزانین لە ساڵانێکی درەنگتردا، مامۆستا عەزیز محەممەد سکرتێری یەکەمی حیزبی شیوعی عیراقیش ئەو میداڵیایەی خەڵات کراو بووە دووهەم و دوایین کوردێك کە میداڵیای لێنینی پێدرابێت).

هەرچۆنێك بێت، لاهووتی لە ساڵی ۱۹۰۸ دا لە گیلان و لە ریزی خەباتکارانی مەشرووتەی گیلاندا بووە. لێرەدا خاڵێکی گرنگ هەیە کە

ژیننامەنووسانی لاهووتی نەیانگرتۆتە بەرچاو. سەرەتا دەبێ بڵێین کە ساڵی ١٩٠٨ پێش سەرهەڵدانی بزووتنەوەی جەنگەڵ بووە و بەم پێیە، دەبێ قسەکانی بەشیری کە باسی بەشداربوونی لاهووتی لە بزووتنەوەی جەنگەڵ دەکات هەڵە بن، مەگەر میرزا کوچك خان و هاوڕێیانی، پێش بزووتنەوەی ناسراو بە جەنگەڵیش لە کاری خەباتی ئازادیخوازانەدا بووبێتن و لاهووتی لەو سەردەمانەدا بووبێتە هاوسەنگەری خەباتی مەشرووتە (نەك جەنگەڵ). ئەم گرێ پووچکەیە وا هەیە بە یارمەتی نووسینەکانی ئەحمەدی کەسرەوی بکرێتەوە. کەسرەوی مێژوونووسی ئازەربایجانی لە کتێبی "تاریخ هیجدە سالە ئازەربایجان"دا دەنووسێ:

"میرزا کوچك خان لە مرجاهید [خەباتکار]انی گێلان بوو و لە تێکۆشانی ساڵی ١٢٨٨ (١٩٠٨) و گرتنی قەزوێن و تاران، هەروەها لەو شەڕانەدا بەشداریی کرد کە ە ساڵی ١٢٩٠ (١٩١١) لە مازندەران لەگەڵ تاقمی محەممەد عەلیشا بەڕێوە چوو (کەسرەوی، ئەحمەد، ٩٩٢ ٨١٢). بەم پێیە، لاهووتی لە ساڵانی نێوان ١٩٠٤ و ١٩١١دا بە گەرمی چووبووە ریزی خەباتکارانی مەشرووتەی ئێرانەوە ولە تاران یا رەشت یا کرماشان، خەباتی دەکرد. بۆشایی ناو رۆژژمێری ژیننامەکەشی بەو خەباتکارییانە پڕدەبێتەوە. بەڵام ئەم بۆچوونە خۆی پرسیارێکی دیکەمان لەبەردەم قوت دەکاتەوە: لاهووتی شاعیری دەروێش، کە ماسۆنەکان هێنایانە تاران و لە قوتابخانەیان دانا، چۆن چوە سەر پشتی ئەسپ و لە شەڕی مەشرووتەی کرماشان و تاران و گێلاندا ئازایەتی نواند؟ ئەم "استحالە"یە چۆن رووی دا ؟ کێ بەرەو ئەولایەنەی برد ؟

هیچ سەرچاوەیەك نییە باس لە تاقەکەس واتە کەسایەتییەکی تایبەت بکات کە شوێنی لەسەر لاهووتی دانابێت. بەڵام وا هەیە بتوانین دەست نیشانی سێ "دیاردە" بکەین کە لاهووتییان بەرەو ڕێبازێکی ئەوتۆ برد: یەکەم، فەزای شۆڕشگێڕانەی ئەودەمی ئێران و تاران کە لاهووتی لەوێ دەژیا، دووهەم، دۆست و برادەری وەك احسان الله خان و یار محمد تەقی خانی پەسیان، سێهەمیش، دەوری ماسۆنەکان. سەبارەت بە ماسۆنەکان دەبێ بڵێین گەرچی فەرامۆشخانەو "جامع ادمیت" هەردوکیان میرزا ملکم خانی ئەرمەنی بنیاتی نابوون و سەری پەتیان بەدەست "لۆژی فەرانسە"وە بوو بەڵام ڕێکخراوە ماسۆنییەکان لە کۆتاییدا هەموویان دەچنەوە سەر بنەما ئینگلیزییەکەیان و لەوێوە سەرچاوە دەگرن.

سیاسەتی ئەودەمی ئینگلیزیش بۆ ئەوەی بتوانێ دەرباری شاهانی قاجار لەژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی ڕەقیبەکەی واتە ڕووسی قەیسەری دەربهێنێت، نەك هەر پشتگیری مەشرووتەخوازانی دەکرد و هانی خەڵکی بەرەو مەشرووتە دەدا، بەڵکوو دوور لە ڕاستی نییە ئەگەر بگوترێ بیری مەشرووتەخوازی، ئەوان هێنایانە ناو گەلانی ئێران [وعوسمانیش]ـەوە. کەوابوو دوور نییە هاندەری سەرەتایی لاهووتی بەرەو بیری مەشرووتەخوازی هەر ماسۆنەکان بووبێتن بەڵام گومانم نییە کە فەزای گشتی سیاسی ئەودەمی ئێران و هاوڕێ و برادەرانی لاهووتیش دەوری سەرەکییان لە کێشانی ئەو بەرەو جەرگەی خەباتی ئازادیخوازانەی ئەو سەردەمەدا گێڕاوە و ئەوەش گونجاو نەدەبوو ئەگەر خۆی خوازیاری مەسەلەکە نەبوایە، ئامادەیی بۆ وەرگرتنی

بیرەکەی تیدا نەبوایە و"هۆی دەروونی" یارمەتی وەرگرتنی هۆکارە دەرەوەییەکانیان نەدایە. لاهووتی خۆی خاوەنی رۆحێکی زیادەخواز و نائارام بەڵام لایەنگری زەحمەتکێشان بوو. لە ئوتۆبیۆگرافیەکەیدا، کاتێ باسی سەردەمی منالّی خۆی دەکات، لەوە دەدوێت کە چۆن دژ بە زولّم و ستەمکاریی وەستاوە و ئاواتی یەکسانی و بەرانبەریی خەلّکی خواستوە (بڕوانە ڕووداوی مانگی محەڕ ڕەم لە کرماشان، سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ١).

بەشداریکردنی لاهووتی لە خەباتی مەشرووتەخوازانی گێلان، ڕووداوێکی بەبەلّگەی مێژووییە. بەڵام ئایا لاهووتی لە شاری تەورێز هاوکاری خەباتکارانی ئازەربایجانی کردووە یان نا، روون نییە. دوو سەرچاوە ناو لەم دیاردەیە دەبەن: ئەحمەدی بەشیری لەسەرەتای دیوانی لاهووتیدا (لاپەڕە هفتادو شەش)، و محەممەد عەلی سولّتانی لەبەرگی یەکەمی کتێبی احزاب سیاسی وانجمنهای سری لە کرماشان"دا (سولّتانی، محەممەد عەلی، ١٩٩٩، ١، ١٢٨). بەشیری دەنووسێ کە لاهووتی "زیاتر لەلای موجاهیدینی گێلان و تەورێز بوو"، سولّتانیش بۆچوونی بەشیری لە کتێبەکەیدا دێنێتەوە، لەکاتێکدا کە بەشیری هیچ بەلّگەیەکی بۆ قسەکانی رانەگەیاندوە. مێژووی مەشرووتەی ئەحمەدی کەسرەوی و ئەوانی تریش ئاماژەیەك بە بوونی لاهووتی لە تەورێز ناکەن. هەر بۆیەش تا دەستکەوتنی بەلّگەیەکی بەمتمانە لەم بارەیەوە، من مەسەلەی چوونی لاهووتی بۆ تەورێز دەدەمە دواوە، گەرچی ئەوە بە واتای بەشداری نەکردنی ناوبراو لە خەباتی مەشرووتەخوازیدا نییە و، وەك دواتریش باسی لێ

دەکەین، لاهووتی بە قەڵەم و قەدەم لە تاران و رەشت و کرماشان هاوکاریی نزیکی خەباتکارانی مەشرووتەی ئێرانی کردووە.

## ساڵانی جەندەرمری:

سەبارەت بە ژیانی سەردەمی جەندەرمری لاهووتی، سەرچاوەی زۆر بە دەستەوەن و من بۆ نووسینی ئەم دێڕانە بە تایبەت کەڵکم لە نووسینەکانی محمد علی سوڵتانی و کاوەی بەیات وەرگرتوە و دوایین دەستکەوتەکانی ئەوانم لە حیساباتی خۆمدا گونجاندوە ـ ئەو دەستکەوتانەی کە پشتیان بە گەلێك سەرچاوە ئەستوورە و تا ئەمڕۆ لە هەموو سەرچاوەکانی تر دەولەمەندترن. هەروەها کەڵکم لە ئۆتۆبیۆگرافیەکەی لاهووتی وەرگرتوە کە دیارە خۆی نووسیویە و وێ ناچێت هیچکام لەو دوو کەسە لە کاتی نووسینەکانیاندا دەستیان پێی راگەیشتبێت. ئەو ئۆتۆبیۆگرافیە، لە راستیدا وتارێکە بە ناوی "سەبارەت بە خۆم" کە لاهووتی بە رووسی نووسیویە و لە ساڵی ١٩٢٣دا لە گۆڤارێکی چاپی مۆسکۆ دا بڵاوکراوەتەوە. من تەرجەمەی ئینگلیزی وتارەکەم کردە کوردی و لە گۆڤاری گزینگ چاپی سوید دا بڵاوم کردەوە (ژمارە ٢٨، هاوینی ساڵی ٢٠٠٠، لل ٣٦ ـ ٣٢) و وا جارێکی تریش وەك پاشکۆی یەکەم لەم کتێبەدا بڵاوی دەکەمەوە.

با بگەڕێینەوە سەر باسی لاهووتی و جەندەرمری:

لەسەردەمی قاجاردا، بەڕێوەبردنی ئەرکی پاراستنی ئاسایشی ناو شارەکان هەتا سەردەمی مەشروتە بەدەست "تیپی قەزاق"ەوە بوو کە فەرماندەکانیان رووسی بوون و ئەندامە ئێرانییەکانیشیان لەلایەن

رووسەکانەوە گۆش دەکران. زوڵم و زۆری قەزاق لەسەر کۆمەڵانی خەڵك یەك لەو هۆیانە بوو کە ئاگری راپەڕین و پاشان شۆڕشی مەشرووتەی هەڵگیرساند. بریگاد یا "تیپی قەزاق" کۆڵەکەیەکی قایمی راگرتنی سیستەمی فیئۆداڵی ئێران بوون کە شاو دەربار نوێنەرایەتیان دەکرد وسەردەمی مەشرووتەش بەگشتی وەك قۆناغی بوار لە فیئۆدالیزمەوە بۆ سەرمایەداری سەیر دەکرێت (وەلی، عەباس، ١٩٩٦). بە فەوتانی رژێمی کۆنی فیئۆداڵی، ئێران پێی نایە ناو قۆناغێکی نوێی ئابووری ـ سیاسییەوە و ئەوەش لەباری سیاسییەوە، بە شکاندنی هەندێ ئەستوندەکی سیستەمی کۆن هاتە گۆڕنجان کە یەکیان بێگومان بریگادی قەزاق بوو.

"جەندەرمری دەوڵەتی" ئێران لە ساڵی ١٩١١دا دامەزرا. بەڵام بەگوێرەی نووسینی کاوەی بەیات، زووتر و دوابەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی مەشرووتە لە ساڵی ١٩٠٧دا، "نەزمییەی یەپرم خان" هێزێکی جەندەرمەی پێك هێنا، کە لاهووتیش، "وەك تاقمێکی دیکەی خەباتکارانی مەشرووتە"، چووە ناو هێزەکەوە (بەیات، کاوە،١٩٩٧، ١٧). بەگوێرەی ئەو بۆچوونەی بەیات کە پشتی بە بیرەوەرییەکانی "سەرهەنگ ئەحمەدی ئەخگەر" بەستووە، لاهووتی هەر لە ساڵی ١٩٠٧ بەدواوە (؟) چووبووە ریزی جەندەرمرییەوە (هەمان). بەم پێیە ئەو خەباتەی وا لاهووتی لە تاران و رەشت کردووریەتی کاری تاقەکەسی خۆی نەبوە و ئەرکێکی رێکخراوەیی یا ئیداری بووە کە پێی سپێردراوە. لەم بارەیەوە لاهووتی لە ئوتۆبیۆگرافییەکەیدا دەڵێ:

"دوای ئەوەی کە محەممەد عەلیشا بینایەی مەجلیسی دایە بەر

تۆپ.... من لەگەڵ تاقمێکی دیکەی هاوڕێیان کە دەیانویست خۆ بشارنەوە، چووم بۆ شاری رەشت لە رێگا لایەنگرانی شا ئابلۆوقەیان داین.... بردیانین بۆ شاری کەرەج و لەوێ لە تەویلەیەکی تاریك و بۆگەندا زیندانی کراین". (سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی١). بێگومان، ئەو هاوڕێیانەی کە لاهووتی باسیان لێوە دەکات هەمان جەندرمەکانی یەپریم خان بوون و دۆست و برادەر و ناسیاوی شەخسی نەبوون. هەرچی و هەرچۆن، لاهووتی لە زیندان هەڵدێت و بەگوێرەی دێڕەکانی دواتری ئوتۆبیۆگرافیەکە، خۆی دەگەێنێتە دەوروبەری رەشت و تێکەڵ بە خەباتکارانی رەشت دەبێت، هەر لەوێشە، کە میداڵیای سەتتارخانی خەلات دەکرێت، ئەوەش ساڵی ١٩٠٨ی زایینیە. شیعری "دوو نشان"ی لاهووتی هەم تەئریخی ١٩٠٨ی بەسەرەوەیە و هەم رووداوەکان بە دووورودرێژی باس دەکات (ل ٣٦٦ی دیوان).

لەو رووداوە و هەموو رووداوەکانی دواتردا، سەرچاوەکان، واتە کتێب و ئەو بەڵگەنامە دەوڵەتییانەی وا لەبەر دەستی کاوەی بەیاتدا بوون، باس لە لاهووتی وەك "تاقەکەس"ێکی ئازاو شەڕانی و بزۆز بەڵام بوێر و دادپەروەر و لایەنگری هەژار و خوازیاری هێمنایەتی و ئاسایشی ئێران دەکەن و هەرگیز ناوێك لەو رێکخراوە سیاسییە نابەن کە لاهووتی ئەندام یاخود لایەنگری بووە. بەڵام لە وتاری گۆرین واتە ئوتۆبیۆگرافییەکەیدا، لاهووتی خۆی وەك ئەندامێکی گوێڕایەڵی رێکخراوەیەکی چەپ [خاوەن ئالای سوور] ناو دەبات کە ویستوویانە "لەبەرگی جەندرمەدا ناوکی چەکدارییی شۆڕش بپارێزن"(سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ١)، و هەر ئەوانیش ناردوویانە شاری قوم بۆ ئەوەی

لەویٚ "تاقمیٚك [ی جەندەرمە؟] ریٚك بخات و ئەوناوەندە بکاتە شویٚنی حەوانەوەی شۆڕشگیٚڕانی هەڵاتوو" (هەمان). ماوەی ژیان لە "قوم" قۆناغیٚکی گرنگی ژیانی لاهووتییە و من لیٚرەدا دیاردەیەکی کورت و پوختی پیٚ دەکەم:

## جەندەرمری شاری "قوم":

دوای "استبداد صغیر" و رووخانی حوکمی محمد عەلی شا، (١٩٠٨)، ئازادیخوازان گیانیٚکیان هاتەوە بەر و لە ماوەی ئاڵۆزی و بشیٚویی سالانی پیٚش شەڕی یەکەمی جیهانی و ئولتیماتۆمی ساڵی ١٩١١ی بریتانیا و رووس بە ئیٚران دا، سەرلەنویٚ کەوتنەوە چالاکی نواندن. بریتانیا و رووسیە لە ئیٚرانیان داوا کرد کە هیٚزی سوپایی خۆی هەڵوەشیٚنیٚتەوە و جگە لە هیٚزی جەندرمە، چ هیٚزیٚکی چەکداری نەمیٚنیٚت. لەو ماوەیەدا لاهووتی لە بنکەیەکی جەندەرمری لەنیٚوان قوم و کاشان کاری دەکرد و لە راستیدا ئامرهیٚزی بنکەکە بوو. هەروەها ئەودەم جەندەرمری ئیٚران بەدەست سویدییەکانەوە بوو ـ وەك چۆن کاروباری گومرك، بلجیکیەکان هەڵیاندەسووڕاند. لاهووتی لە قوم لیٚهاتوویی و ئازایەتی زۆری نواند و کولۆنیٚل یالمارسیٚنی سویٚدی بانگی کردە تاران ومیدالیایەکی سوپایی خەڵات کرد و گوتی "تۆ یەکەم کەسیٚکی جەندرمەی کە ئەو میدالیایەت خەڵات دەکریٚت" (بەیات، کاوە، ١٩٩٧، ١٨).

باسی کارو خەبات و هەڵسووڕانی لاهووتی لەناوچەی قوم دووروودریٚژە و هەر لە ماوەی ئەو سەردەمانەدایە کە روتبەی میٚجەر ـ

واته سەرگورد (یاوەر)ی پێدەدرێت. یەك لە ئەرکەکانی لاهووتی بریتی بووە لە شەڕی "لوڕەکان"ی ناوچەی ئەراك و مەحەللات و کەزاز، هەروەها گرتن و کوشتنی ئەوانەی وا لەسەرچاوەکاندا بە "چەتە و رێگر" ناسراون وەك حسین زادە و عەباس داغ ئابادی و نایب حسین کاشی. سەرەتای ساڵی ١٩١٤ دەبێت کە ئەفسەرێکی سویدی (مێجەر کۆنت)و دوو ئێرانی واتە مێجەر حیسن ئەلسەڵتەنەی شوقاقی وسیف الله خانی ئەفشار (کوڕی [عەزیز خانی؟] سەردار کل) بۆ راگەیشتن بە کێشە و هەرای ناوچەکە لە تارانەوە دێن بۆ شاری قوم، بەڵام لە رێگا تووشی پیاوانی عەباس داغ ئابادی دێن و دواتر دەچنە گوندی "کورە" و لەوێ تەقەیان لێ دەکرێت و هەرسێکیان دەکوژرێن (٢٤ جمادی الاولی ١٣٣٢) (ـ ئاپریلی١٩١٤).

لاهووتی تاوانبار دەکرێت کە دەستی لەو کوشتنەدا هەبوە و سەرەڕای ئەوەی کە دەنگۆ بڵاودەبێتەوە گوایە بڕیارە بێت بۆ تاران و ببێتە فەرماندەی بەتالیۆنی یەکەمی جەندەرمە، لەپڕێکدا ون دەبێت و ئیتر سۆراغی نازانرێت (بەیات، کاوە، ١٩٩٧، ٢٨). لاهووتی خۆی لە وتارەکەیدا باسی ئەو تاوانە ناکات وا دراوەتە پاڵی، بەڵام دەڵێ: "فەرماندەی بریتانیایی و رووسی هێزە داگیرکەرەکانی ئێران چاویان بەرایی نەدەدا تاقمێکی جەندرمەی وەك ئێمە ببینن.... جا تاقمەکەمان هەڵوەشێنرایەوە و من، کە لەو دەمەدا لەوێش نەبووم حوکمی ئیعدامم بۆ دەرچوو" (سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ١). کاوەی بەیات لەم بارەیەوە دەڵێ: "لاهووتی تاوانبار کرابوو بەوەی کە دەستی لە رووداوی تەقەکردن لە مێجەر مولێری سویدی و هەروەها کوژرانی ئەو

سیٚ کەسەدا هەبوە. بەڵام... بەڵگەنامە و نووسراوی ئەو سەردەمە هیچکام شتێکی ئەوتۆیان تێدا بەرچاو ناکەوێت کە پەسندی ئەو بۆچوونە بکەن و هەندیٚ هەواڵی پێوەندیدار وا دەگەیێنن کە لانی کەم لە مەسەلەی کوژرانی سیٚ ئەفسەرەکەدا کەسێکی تر جێگەی گومان بووە، کە ئەویش، "شجاع لشکر"بێت (بەیات، کاوە، ١٩٩٧، ٢٩).

لاهووتی لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵیٚ: "ئینجا سنووری تورك و ئێرانم بەزاند و بۆ ئەوەی زیاتر لە پێوەندی شۆڕشدا بمێنمەوە لە شارۆچکەی سلێمانی لەسەر سنووری تورك مامەوە" (سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی١)، بەبیٚ ئەوەی باسی وچانی خۆی لەناو هۆزی سەنجابی بکات، کە من دواتر بە تێرو پڕی باسی لێوە دەکەم. سەرچاوە کوردییەکان بەگشتی باسی بوونی لاهووتی لە سلێمانی ناکەن. من جارێك بە تەلەفون پرسیاری مەسەلەکەم لە خوالێخۆشبوو مامۆستا برایم ئەحمەد کرد. مامۆستا گوتی هیچی لەم بارەیەوە نەبیستوە و پێشنیاری پیٚ کردم لە مامۆستای بەڕێز محمد رەسووڵ هاوار پرسیار بکەم. بەداخەوە، مامۆستاش هیچی لەم بارەیەوە لەبیر نەبوو.

تاقە سەرچاوەیەکی کوردی کە باسی سەفەری لاهووتی بۆ سلێمانی کردبێت و من بە هەواڵم زانیبێت، مامۆستا دوکتۆر عزالدین مستەفا رەسووڵە. د. عزالدین لە پێشەکی بۆ کتێبی "شاری سلێمانی" نووسینی ئەکرەمی مەحموودی سالحی رەشەدا دەنووسیٚ: "ئەبولقاسمی لاهووتی ــ شاعیری رووناکبیری گەورەی تاجیکستان لە یادداشتی خۆیدا [کامە یادداشت؟] باسی ئەوە دەکات کە چۆن لە سالانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە بەندیخانەی کرماشانەوە بەرەو ئەستەموولٚ رایکردووە و لەوێدا،

ئیستگەی حەوانەوەی ئەو گەشتەی کە دەیکا، کە شاری سلێمانی بووە و ئەوەش دەڵێ کە لە سلێمانی پەیوەندیم لەگەڵ بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەدا پەیدا کرد". (رەسووڵ، د. عزالدین مستەفا).

بەداخەوە د. عزالدین ناڵێ سەرچاوەی قسەکانی و هەروەها ئەو یادداشتەی ناوی دەبات کامەیە، بەڵام بەوەیدا کە لاهووتی بە شاعیری تاجیکستان ناو دەبات، دەبێ سەرچاوەی قسەکانی سۆڤیەتی بووبێت(٢). وتاری "سەبارەت بە خۆم" باسی چوون لە سلێمانییەوە بۆ ئەستەمووڵ ناکات، بەڵام وا دیارە لەسەرچاوەی بەردەستی د. عزالدیندا ئەو باسە کرابێت هەروەها مامۆستا حەسەن قزڵجیش باسی چوونی لاهووتی بۆ ئەستەمووڵ دەکات کە دەبێ جیاواز بێت لە سەفەری ساڵی ١٩١٧ی . (قزڵجی، حەسەن، پاشکۆی ٦). (٣)

ئەو زیندانەی وا لە نووسینی د. عزالدیندا ناوی هاتووە، راستە. دوو سەرچاوەی تریش (بەشیری و سوڵتانی، پێشوو) باسی گیرانی لاهووتی لە کرماشان دەکەن و ئەوەی کە خەڵك کۆبوونەتەوە و چوونەتە بەر دەرگای زیندان و داوای ئازادیی لاهووتییان کردووە، حکوومەتی کرماشانیش مەجبوور بووە لەبەر زەختی خەڵك ئازادی بکات.

ئەگەر سەرچاوە کوردییەکان لە مەسەلەی ژیانی لاهووتی لە سلێمانی و بەگشتی کوردستانی ئەوەدەمی ژێردەستی عوسمانیدا بێدەنگن، بەختەوەرانە بیرەوەرییەکانی عەلی ئەکبەر خانی سەردار موقتەدیری سەنجابی ـ سەرۆکی خاوەن دەسەڵاتی عێلی سەنجابی زانیارییەکی ورد و خەستمان لەسەر مەسەلەکە دەداتێ و جێگەی خۆیەتی لێرەدا چەند لاپەڕەیەك بۆ کورتکراوەی ئەو یادداشتانە تەرخان بکەم.

بیرەوەرییەکانی سەردار موقتەدیر بە فارسی نووسراون و دوکتۆر کەریم سەنجابی، پێیاندا چۆتەوە. نوسخەی دەستنووسی یادداشتەکان نەکەوتوونەتە بەرچاوی کەس و ئەوەی چاپیش کراوە، لەراستیدا کاری دوکتۆر سەنجابییە، بەڵام ناوبراو لەسەرەتای کتێبەکەدا متمانە بە خوێنەر دەدات کە جگە لە نوێکردنەوەی رێنووس و رێزمان، هیچ گۆڕانێکی بەسەر یادداشتەکانی مامیدا نەهێناوە. هەرچۆنێك بێت بیرەوەرییەکان لە مەسەلەی ژیانی لاهووتی دوای هەڵاتن لە رەشت، بەنرخترین سەرچاوەیە و جگە لەوەی باسی بوونی لاهووتی لەناو سەنجابییەکاندا دەکات، لەو سەفەرەش دەدوێت کە لاهووتی لەگەڵ ئەودا کردوویە و وەك پێشکار و بڕوا پێکراوێك هاوڕێی سەفەری بووە بۆ سلێمانی و کەرکووك  و مووسڵ ئینجا لەوێ لێی جیابۆتەوە و هەردوولا بە جیاجیا گەڕاونەتەوە بۆ ئێران.

نووسەری بیرەوەرییەکان لە یادداشتەکانیدا باسی خوو و خدەی تیژوتوند و سەری زیادەخوازی لاهووتی دەکات و دەڵێ شێخ مەحموودی نەمریش کە ئەودەم لە زیندان بوو، ئاگاداری ئەو رەوشتە توندوتیژەی لاهووتی هەبوو و دەیناسی. نووسەر، هەروەها باسی پێوەندی نزیکی لاهووتی لەگەڵ عوسمانییەکان و لایەنگریی ئەو لە ئاڵمانیەکان دەکات، کە ئەم بابەتە بەتایبەت بۆ باسێکی دواتری من بەسوودە و ئەویش بریتیە لە پێوەندی لاهووتی لەگەڵ سمایل ئاغای سمکۆ.

لێرەدا دەچمە سۆراغی بیرەوەرییەکانی سەردار موقتەدیر، کە بە شێوەیەکی رێکوپێك رێك خراون و وەك یادداشتی رۆژبەرۆژ دەچن. سەردار موقتەدیر و هەموو هۆزی سەنجابی و هۆزی دیکەی ناوچەی

کرماشان وەك گۆران و کەلهوڕ، لە شەڕی نێوان ئینگلیز و رووس لەلایەك و ئاڵمان و عوسمانی لەلایەکی تر، کە لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا لە رۆژئاوای ئێران و خاکی کوردستان بەڕێوە دەچوو، لایەنی ئاڵمان و عوسمانییان گرتبوو و، چەکدارانە بەگژ هێزی ئینگلیز و رووسدا دەچوون. ئاڵمانیا و عوسمانیش بە پارەو چەك و تەقەمەنی یارمەتییان دەدان. بەشێکی زۆری بیرەوەرییەکانی سەردار موقتەدیریش ئەو شەڕ و پێکداهەڵپرژانانەی ناوچەکە دەگرێتەوە و هەرکاتێکیش ناوێك لە لاهووتی دەهێنێت بە شێوەیەك لە شێوەکان لەو پێوەندییەدایە.

یەکەم جارێك کە سەردار ناوی لاهووتی دەبات لە بیرەوەری "ناوەڕاستەکانی مانگی سەفەری ١٣٣٤ی مانگی و ١٥ی ئازەری ١٢٩٤"ە کە دەکاتە سەرەتاکانی مانگی ١٢ی ١٩١٥ و جەنگەی شەڕی یەکەمی جیهانی. سەردار دەنووسیّ: "من هوردووی ٧٠٠ کەسی خۆم [لەناوچەی سەنجابییەوە] بەرەو شاری سنە خستە ڕێگا. شەوی سێهەممان لە "فەقیّ سلێمان" بردە سەر و لەوێوە نامەیەکم بۆ لاهووتی خان و موسیۆ شادۆ [ی ئاڵمانی] و وکیل الملکی کوردستانی نووسی. بە لاهووتی خانم گوت کە مەنزڵی سوارەکانمان لە گەڕەکی قەتارچیان دابین بکات ....." لەم چەند دێڕە وادەردەکەوێت کە یەکەم: لاهووتی ئەودەمە لە سنە بووە و دووهەم دەوری پێشکار و بەڕێوەبەری ئیش وکاری سەردار موقتەدیری بینیوە. لە درێژەی باسەکەدا، سەردار دەنووسێت: رۆژی دواتر لاهووتی خان بە تەقڵەکوت گەیشتیّ و گوتی موسیۆ شادۆ تکای لێکردووی نەچیە ناو شار.... شەوێکیان لاهووتی

خان هاته ماڵمان [له سنه]و دیتم که مستێك لیرەی پێیه .... گوتی ئەم ٦٠ لیرەیه پێشەکییەو بڕیاره ١٤٠ لیرەی دیکەشم پێ بدەن ئەگەر تۆ بکوژم ... به لاهووتی خانم ئەسپارد که پێگەی "موجاهیدین" [هێزی دژ به رووس و ئینگلیز] لەسەرەتای شار رێك بخات .... نامەم به لاهووتی خاندا نارد بۆ کومیتەی داکۆکی نەتەوایەتی له کرماشان .... چوونی لاهووتی خان بۆ کرماشان و گەڕانەوەی، نزیکەی دوو هەفتەی پێچوو.... شەوانه کۆبوونەوەی خسووسیشمان هەبوو، که تێیدا من و کۆمەڵێك لەسەرۆك هۆزان و دیموکراتەکانی کرماشان و چەند کەس له موجاهیدین وەك سەردار محیی و سوهراب زاده و لاهووتی خان بەشداریمان دەکرد..... حسین رەئووف ـ جاسووسی ناوداری تورك، که ماوەیەك له سەنجابی میوانی ئێمه بوو، تورکێکی خەڵکی دورگەی "کرت" بوو، شەرحێکی شاعیرانەی نووسیبوو و تێیدا وڵاتەکەی خۆی به کچێکی چەلەنگ شوبهاندبوو. لاهووتی خان [له تورکییەوە] بۆی تەرجەمه کردم، گەلێك جوان بوو... وردە وردە پایزی ساڵی ١٢٩٦ی هەتاوی (١٩١٧) دەگەیشتێ و عیلەکەمان ئاماده دەبوو بچێت بۆ گەرمیان .... ماژور لاهووتی خان، که لەسەردەمی بەربەرەکانی نەتەوەییدا زۆربەی کات له ماڵی من و لەگەڵ من بوو، چووه ناو شاری [ی کرماشان]و رۆژنامەی "بێستوون"ی وەڕێ خست...

ئەم رۆژنامەیه، به وتاره ئاگراوییەکانیەوە تین و تەوژمێکی دەخسته دڵی خەڵکی کرماشانەوە و له زۆر ژمارەدا هەواڵ و دەنگوباسی لەمەڕ هۆزی سەنجابی و خەباتی نیشتمانپەرستانەیان بڵاودەکردەوە و دەیان نوسخەی لەناو گوندەکانی سەنجابیدا

بلاودەکرایەوە.... لەم کاتانەدا [١٩١٨]، لەسەرۆك هۆزەکانی رۆژئاوا [ی ئێران]، تەنیا محمد تقی بەگ امیرالعشائر ـ سەرۆکی تایفەی باوەجانی و قوبادی لە دۆستایەتی ئێمەدا قایم مایەوە، بەهرام بەگی سەردار ئەکرەم ـ سەرۆکی هۆزی وەلەدبەگیش بە دۆستایەتی ئێمە ناسراو بوو..... دوو فڕۆکەی ئینگلیزی هاتنە سەرمان ... سێ فڕۆکەی دیکەش چوونە سەر تایفەی باوەجانی ... بۆمبارانیان کردین .... جگە لەوانەی وا لە گۆڕەپانی شەڕدا کوژران، نزیکەی ٥٠٠ کەس یا لە ئاودا خنکان یا بەهۆی بۆمبارانەوە لەناوچوون، هەموو دارایی و بوون و نەبوونی چوار و پێنج هەزار بنەماڵەی سەنجابی بەجێ ما..... زیاد لە ٢٠ کروور تمەن زیان لە سەنجابی کەوت. ڕەشید ئەلسەڵتەنە دەستبەجێ لاهووتی خان ـ کە یەك دوو مانگ بوو لێم تۆرابوو و لە ماڵی ئەو دەژیا، هەروەها کوێخا دەروێش یارەکە و میرزا عەباس هەموویانی ناردە لای من.... ماژوور لاهووتی خان ـ کە ماوەی سێ ساڵ لە ماڵی من و وەك برام وابوو، هەر ئەوەندەی ئینگلیزییەکان شازادە سلێمان میرزایان گرت و دوژمنایە تییان لەگەڵ ئێمەدا ئاشکرا بوو، بەبێ هیچ هۆیەك لێم تۆراو چوە ماڵی ڕەشید ئەلسەڵتەنە، لە ماوەی بریندارییەکەمدا، سەرلەنوێ هاتەوە لام و لە راستیدا بوو بە پەرستارم و تەنانەت شەوانە لەسەر سەرینم دەبووە ئیشکچی." (سەنجابی، عەلی ئەکبەر خانی سەردار موقتەدیر، ٣٠٥ تا ٥٠٩) .

لێرە بەدواوە سەردار موقتەدیر باسی ئەوە دەکات کە چۆن هێزەکانی ئینگلیز کەوتووتە دوای و ئەویش بڕیاری داوە بچێت بۆ خاکی عوسمانی : "ڕەشید ئەلسەڵتەنە ماینەکەی خۆی بۆ ناردبووم و

ئەسپێکیشی بە زین وبەرگەوە بۆ لاهووتی خان ناردبوو.... هەواڵیشی ناردبوو ئێستا کە بڕیاری ڕۆیشتنت داوە، لاهووتی خانیش لەگەڵ خۆت ببە. لەبەر ئەوەی شارەزای وەزع و حاڵی لاهووتی بووم، زانیم کە ڕەشید ئەلسەلتەنە لێی جاڕز بووە و دەیەوێت لە خۆی دووری بخاتەوە. پێم گوت [بە لاهووتی] کە تۆ لەم ماوەیەدا وەك برایەك هاوڕێ‌و هاودەنگی من بووی، ئێستا کە بەرەو عوسمانی دەچم، پێم خۆشە تۆش لەگەڵمدا بێی، بەڵکوو بتوانین هەندێ کاری بەسوود بۆ وڵات بکەین.... هاوڕێکانم لەو سەفەرەدا، بریتی بوون لە .... و لاهووتی خان. چووین بۆ ئەڵەبجە [هەڵەبجە] .... عادیلە خانم مەنزڵی خۆی بۆ میوانداریەتی ئێمە ئامادە کردبوو....

دوای ئەوەی سوڵتانی نوێی عوسمانی هاتە سەر تەخت، بارو دۆخ گۆڕا..... لە چوونی خۆم بۆ عوسمانی پەژیوان بوومەوە ... گوتم بە چەند سوارەوە بگەڕێینەوە و بەڕێگای کوردستاندا بچین بۆ تاران ..... هەموویان لە گەڵ بۆچوونەکەمدا دژایەتییان کرد، بەتایبەت لاهووتی خان لە هەموان زیاتر جەختی مانەوە لە عوسمانی دەکرد. لاهووتی لە ئەنجامی وتووێژی ماوەیەك پێشترمان سەبارەت بە پێکهێنانی هێزێکی بەربەرەکانی لە ڕۆژئاوای ئێران و هاتنی ئەفسەرانی ئاڵمانی بە پارە و چەکەوە، هیوای ئەوەی هەبوو کە لەو ڕێکخراوەیەدا ببێتە خاوەن پلە و پایە.... ماوەی ١٢ ڕۆژ لە سلێمانی ماینەوە.... پاشان بەرەو کەرکووك ئاژواین ...

لە چەمچەماڵ، لاهووتی خان کە لە هەڵەبجە دژ بە بۆچوونی من وەستاو جەختی لەسەر مانەوە لە عوسمانی دەکرد، کاتێ قسەی سەرۆك هۆزی هەمەوەندی ژنەفت [کە دەیگوت دەوڵەتی عوسمانی

جێگەی پەناخواستن نییە] ، بۆچوونی خۆی گۆڕی و دڵئێشانی خۆی لە نۆکەرێکی سالار زەفەر کردە بیانوو و بە تۆراوی لێمان جیابووەوە.
هەتا خۆر هەلات چاومان بۆ گێڕا، بەلام شوێنمان بۆ هەڵنەگیرا، ناچار درێژەمان بە رێگەی خۆمان دا..... سەعاتێك پێش رۆژئاوا سەر و سەکوتی لاهووتی خان بە دوو سوارەی هەمەوەندە دەرکەوت. لەگەڵ یەکێ لە هاوڕێکانی هاتە سەرێ و نامەیەکی مەحموود خدری پێدام کە داوای لێبوردن لە لاهووتی لێکردبووم. دەرکەوت کە ئەو شەوەی لە ئێمە جیابۆتەوە، چۆتە مالی مەحموود خدر و بە خەیاڵی ئەوەی کە ناوبراو لایەنگری ئینگلیزییەکانە، داوای لێ دەکات کەسێکی بەڵەدی لەگەڵدا بنێرێت بۆ ئەوەی بچێتە هوردووی ئینگلیزییەکان. مەحموود خدر لێی تووڕە دەبێت و رازی و ناڕازی دەینێرێتەوە لای من و نامەیەکی لەگەڵدا دەنێرێت بۆ داوای لێبوردن. نامەکەم خوێندەوەو بە لاهووتیم گوت ئەم کارە شێتانەیەی تۆ شتێکی نوێ نییە. پاڕاوە و گوتی نامەکەی مەحموود خدرم دەیە. گوتم دەزانم ترسی ئەوەت هەیە پیشانی عوسمانییەکانی بدەم، بەلام دڵنیا بە کاری وانا کەم.....

لە کەرکووك خەڵکانی خاوەن رێزی شار و کاربەدەستانی حکوومی هاتنە چاوپێکەوتنمان. . شێخ مەحموود کە زیندانی بوو بە نووسین داوای لە "عاشر بەگ"ی قۆماندان کردبوو چاوی پێم بکەوێت. ئیجازەیان پێ دا لەژێر چاوەدێری شەش عەسکەری چەکداردا بێتە مالمان، سەعاتێك لەوێ مایەوە و چاوەدێرەکان لە ژووری سوارەکانی ئێمەدا مانەوە. شێخ باسی زوڵم و زۆری تورکان و مەزلوومیەتی کوردی کرد بەبێ ئەوەی هیچ چەشنە قسەیەك سەبارەت بە دۆستایەتی ئینگلیزییەکان بکات....

هەمووومان ئەو نەخۆشییە نوێیەمان گرت کە پێی دەڵێن ئانفلۆئانزا، جگە لە لاهووتی خان ... لاهووتی خانمان نارده لای عاشر بەگ بۆ ئەوەی تەکلیفمان روون بکاتەوە.... لاهووتی خان پەرێشان وئاڵۆز گەڕایەوە و گوتی عاشر بەگ تووڕەیەو دەڵێ سەردار موقتەدیر لەگەڵ ئێمە نییە لەگەڵ ئاڵمانەکانە.... رۆژی دوایی لاهووتی خان و ئاغا مرادی پێشخزمەتم لەگەڵ خۆم بردو[بەرەو موسڵ] وەڕێ کەوتم. چووینە "بابی نەبی" .... لەگەڵ لاهووتی خان سوار بووین و چووینە ماڵی فەرماندەی کولل [ی هێزەکانی عوسمانی] واتە عەلی احسان پاشا. منی لای دەستی خۆی دانا و لاهووتی خان و ئەسعەد بەگ [ئەفسەری تورك] لە خوارەوەتر دانیشتن. دوای هەواڵپرسی کردنی من هەواڵی لاهووتی خانی پرسی. لاهووتی لە وەڵامی قسە و پرسیارەکانی ئەودا خێرا خێرا لەسەر کورسیەکەی هەڵدەستا و سڵاوی عەسکەریی دەکرد. چەند جار وای کرد هەتا کوو پاشا بە رووی گرژەوە گوتی دانیشە، بۆچی هەڵدەستی؟ وەڵامی دایەوە کە من سەرباز و ئەفسەرم و وتووێژ لەگەڵ پاشا بۆم جێگەی شانازییە. عەلی ئیحسان پاشا گوتی هەموو شتێك داب و رەسم و کاتی خۆی هەیە، سەرباز یا ئەفسەر نابێ موجامەلەی نابەجێ بکات...

دیار بوو عوسمانییەکان تووشی ناهومێدی و تووڕەیی هاتبوون. لاهووتی خانم نارده لای "زایلر" قۆنسوول [ی ئاڵمانیا لە مووسڵ] بۆ ئەوەی بزانێ ئایا ئەو بانگ هێشتنەی من بۆ ئاڵمانیا لە جێی خۆیەتی یان نا..... گوتبووی ئێوارە دێت بۆ چاوپێکەوتنم ..... هات .... گوتی هەر ئەمرۆ کە نامەیەك بۆ من بنووسە و بانگ هێشتنەکە قەبووڵ بکە. منیش

دوای گەڕانەوەی ئەو، نامەیەکم نووسی و بە لاهووتی خاندا ناردمە قۆنسوولیەتی ئاڵمانیا.... چەند رۆژێك دواتر، لاهووتی خانم لەگەڵ خۆم هەڵگرت و چوومە چاوپێکەوتنی زایلر.. گوتی دەوڵەتی ئاڵمان لەم دواییەدا بڕیاری داوە کە خۆی راستەوخۆ هێز بنێرێتە قەوقازو ئازەربایجان و واهەیە تۆ بنێرن و بتکەنە سەرپەرشتی عەمەلیاتی ئازەربایجانییەکانی ئێران. منیش گوتم بەوپەڕی پێخۆشییەوە بۆ تێکدانی پلانی عوسمانییەکان لە ئێران ئامادەی هەموو چەشنە فیداکارییەکم.

لە گەڕانەوەدا بۆ ماڵەوە، لاهووتی خان لە خۆشییان لە کەوڵی خۆیدا جێگەی نەدەبوودەوە و گوتی دەبێ بەڵێنم بدەیەی کە ئەگەر ئەو نەقشەیە بەڕێوەچوو، من بکەی بەسەرۆکی رێکخستنی عەسکەریی رێکخراوەکە. گوتم لاهووتی ! تۆ چەندە ساویلکە و بە هەڵەشە و توندوتیژی ! ئەم قسەیەی قۆنسوول وەك ئەوەیە ئاسکی نەگیراو ببەخشی، ئێمە لەکوێ و قشوونی قەوقاز و ئازەربایجان لەکوێ.

.... ئێوارەی هەمان رۆژ ئەسعەد بەگ لەلایەن عەلی ئیحسان پاشاوە هاتە چاوپێکەوتنم و گوتی پاشا ئیجازە نادات بچی بۆ ئاڵمان و دەتنێرێتە ئازەربایجان بۆ هاوکاریکردنی مجدالسەڵتەنە"....... دژ بە قسەکانی ئەسعەد بەگ وەستام و گوتم من لە زیندان و کوژران ناترسم .... کوژرانی خۆم لێرە بە شەهادەت دەزانم لەبەر ئەوەی ئێرانیەکان هەموو تێدەگەن کە هەموو ئەو قسەی برایەتی و یەکیەتی ئیسلامییە [ی عوسمانییەکان] درۆ و فریودانی تەواوە.

لاهووتی خان لە دانیشتنەکەدا ئامادە بوو و دوای رۆیشتنی ئەسعەد بەگ حاڵەتی گۆڕاو و گوتی بەبێ بانگ هێشتنی رەسمی

دەوڵەتی ئاڵمان لەگەڵمدا نایەت. گوتم بۆچی؟ گوتی ڕەقیب و موونافیسێکی وەك یاوەر "محمد تقی خان پەسیان"م هەیە کە لە برلین میوانی دەوڵەتی ئاڵمانە. پێم گوت ئێمە تائێستا وەك برای یەکتر وا بووین و ئێستاش هەروەك برا لەگەڵمدا بە، بۆچی مەگەر سالار زەفەر و سالار موقتەدیر بانگ هێشتنی جیاواز کراون ؟ گوتی نەخێر تۆ دەتەوێ من وەك کاتیب یا وەرگێڕ لەگەڵ خۆتدا ببەی. جا لەبەر ئەوەی لاهووتی ئاگاداری وتووێژم لەگەڵ قۆنسوول بوو، مەجبوور بووم نازی بکێشم، گوتم کە وابوو، خۆت لەلایەن منەوە بچۆ لای قۆنسوول و هەرچۆنێك پێت باش بوو وتووێژی لەگەڵدا بکە. ڕازی بوو، ڕۆیشت و بە دڵساردییەوە گەڕایەوە. گوتی قۆنسوول دەڵێ "دەتوانی لەگەڵ سەردار موقتەدیر بچی و پێویست بە بانگ هێشتنی جیاواز ناکات"، بەڵام من بەبێ بانگ هێشتن نایەم. گوتم ئیتر خۆت دەزانی، تۆ پێوەندت لەگەڵ ئاڵمانیەکان هەرگیز باش نەبوە. بۆ نموونە، کاتێ ڕووس هاتنە کرماشان لەگەڵیاندا هەتا تاران ڕۆیشتی و لە گەڕانەوەی کرماشان ئاڵمانیەکان گرتیانی. گوتی بەڵێ لەگەڵ ڕووسەکاندا هەتا تاران چووم، بەڵام لەوێ پێوەندم درا بە موسیۆ زومێری کارداری باڵوێزخانەی ئاڵمانەوە و نامەی نهێنی ئەوم برد بۆ "نادۆڵتی" وەزیری موختار لە کرماشان. گوتم من لەم پێوەندییانە ئاگادار نەبووم و ناشتوانم هیچیان لەسەر بنووسم. لە قسەکانم ڕەنجا و وەك هەمیشە، بە تووڕەیی و دڵڕەنجی لە ژوورەکە چووە دەرەوە و شەویش نەگەڕایەوە.

ڕۆژی دواتر شێخ مەحموود لەدووی ناردم و تکای کرد بۆ وتووێژێکی گرنگ بچمە چاوپێکەوتنی. کاتێ چووم، سەیرم کرد لاهووتی خانیش

لەرێیەو بە دیتنی من لە ژوورەکە چووە دەرەوە. شێخ مەحموود پرسی بۆچی لێت تۆراوە ؟ گوتم دیارە هۆیەکەیت لە خۆی پرسیوە. گوتی بەڵێ، دەڵێت سەردار موقتەدیر بۆ دژایەتی دەوڵەتی عوسمانی دەچێتە ئاڵمانیا ... پاشان شێخ [مەحموود] تکای لێکردم لەگەڵ خۆمدا بیبەم، گوتم درێغیم نییە و ئەگەر بیەوێ، سەرلەنوێ دەبێتەوە دۆست و برای من. شێخ مەحموود چوو لەگەڵ خۆیدا بیهێنێتەوە، بەڵام ئەو نەیویست و شێخ بەتووڕەیی گەڕایەوە و بە "دێوانەی زنجیری" ناوی لێ برد.

لاهووتی خان لە ماڵی شێخ مەحموودەوە راستەوخۆ چووە چاوپێکەوتنی یووزباشی ئەسعەد بەگ و لەگەڵ ئەودا چوە خزمەت پاشا. بەبێ گومان باسی وتووێژی من و قۆنسوولی ئاڵمانیا و وەفاداری خۆی بە دەوڵەتی عوسمانی بۆ کردبوو، کە دەستبەجێ لە ماڵی ئەسعەد بەگدا نیشتەجێیان کرد و مانگی پێنج لیرە مووچەیان بۆ بڕیەوە. لای ئێوارەی هەمان رۆژ قانوونێك و شەش عەسکەر هاتنە ماڵمان و سەرەتا نوێن و پێخەوی لاهووتی خانیان لەگەڵ خۆیاندا برد، ئینجا گەڕانەوە و لەبەر دەرگای ماڵەکەمان مانەوە..... بەیانی رۆژی دواتر، قۆنسوول [ی ئاڵمانیا] هات و گوتی لاهووتی خان لێت تۆراوە و دیارە هەواڵی وتووێژی ئێمەش بە ئیحسان پاشا دەگەێنێت. گوتم دیارە هەر گەیشتۆتە لای هەرچی ویستوویەتی پێی گوتوە چونکوو قانوون و عەسکەریان ناردۆتە [بەر دەرگای] ماڵمان.... (سەنجابی، سەردار موقتەدیر، ٣٠٥ تا ٥٧٠).

یادداشتەکانی سەردار موقتەدیری سەنجابی لێرە بەدواوە ئیتر ناوێك لە لاهووتی ناهێنێت و دواتر باسی گەڕانەوەی خۆی و دووکەسی هاوڕێی خۆی بۆ ئێران دەکات کە هیچکامیان باسی

لاهووتی نین و وادەردەکەوێت کە لەو قۆناغە بەدواوە ئیتر لاهووتی حیسابی خۆی لەسەردار موقتەدیر جیاکردۆتەوە و درەنگتر بە شێوەیەکی سەربەخۆ گەڕاوەتەوە بۆ ئێران، کە پێشتر باسمان لێوە کردووە. بەداخەوە یادداشتەکان تەئریخی ڕۆژبەڕۆژیان بەسەرەوە نییە کە بتوانین لەگەڵ سەرچاوەکانی دیکەدا بەراوردیان بکەین، بەڵام لەگەڵ زانیارییەکانی پێشووی ئێمە لەمەڕ چوونی لاهووتی بۆ خاکی عوسمانی و شاری سلێمانیدا یەك دەگرنەوە. لەلایەکی دیکەوە، ئەم یادداشتانە، وا هەیە هەندێ بۆشایی و ناتەواوی واتە بەشی نەزانراوی ژیانی لاهووتیمان بۆ روون بکەنەوە، بەتایبەت لە پێوەندی چوونی لاهووتی بۆ سلێمانی و کەرکووکدا. بەڵام وا هەیە گرنگترین لایەنی بیرەوەرییەکانی سەردار موقتەدیر دەرخستنی ئەو راستیە بێت، کە لاهووتی دوای تێکەوتن لەگەڵ رووسە سپییەکان و هێزی بریتانیا، لایەنی سوێندخۆرەکانی گرتوە و چۆتە بەرەی ئەوانەوە. ئەم لایەنگرییەی ئاڵمانیاو عوسمانی درەنگتریش لە ژیانی لاهووتی و کار و کردەوەیدا خۆ دەنوێنێت و دەگاتە شوێنێك کە ــ وەك باسی لێوە دەکەم، خۆی لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سمایل ئاغای سمکۆ دەپارێزێت ــ کە ئەویش لە قۆناغێکی خەباتیدا ئەفسەری عوسمانی هێنابووە ناو سوپاکەیەوە و بە یارمەتی ئەوان شەڕی جەندرمە و سوپای ئێرانی دەکرد.

هەرچۆنێك بێت، درەنگتر لاهووتی بە رێگەی بەغدا و خانەقیندا دەگەڕێتەوە بۆ کرماشان و لەوێ، وەك خۆی گوتوویە "بەشداریی شەڕی پارتیزانی دژ بە هێزی داگیرکەر" دەکات و دەبێتە "یەکێك لە

نووسەرانی ڕۆژنامەی شۆڕشگێڕی بێستوون" (سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ١). ئەم سەفەرەی لاهووتی بۆ خاکی عوسمانی ماوەی ٨ مانگی پێ چوە و لە گەڕانەوەدا دەوڵەت لە رابوردوەکەی خۆش نەبوە و هەر بۆیەش زیاتر خەریکی کاروباری کولتووری بووە تا چالاکی سوپایی (بەیات، کاوە ١٩٩٧، ٣١). بەڵام لاهووتی خۆی شتێکی تر دەڵێت: "لە رۆژانی شۆڕشی مانگی فیبرەوەری ١٩١٧ی روسیادا، نارەزایەتی لەناو هێزەکانی سوپای رووس لە کرماشان سەری هەڵدابوو. من هاوکاریی بۆلشڤیکەکانم دەکرد کە ترسیان دەخستە ناو دڵی سەربازە رووسەکانەوە و لە کۆبوونەوەکانیاندا وتارم دەدا....."(سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی١). واتە لاهووتی زۆریش لە کاروباری سوپایی دوورنەکەوتۆتەوە، بەڵام بەتوندی خەریکی کاری رێکخراودیی بووە. ئەم مەسەلەیە دەمانگەیێنێتە سەر باسێکی دوورودرێژ لەمەڕ ئەندامیەتی لاهووتی لە رێکخراوە سیاسیەکانی ئەو سەردەمە و من هەوڵ دەدەم ئەم باسەش بە کورتی بەڵام پوختی ببڕمەوە.

## حیزبی سۆسیال دیموکراتی ئێران:

لاهووتی لە درێژەی بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ: من بەشداریی یەکەمین رێکخراوی کرێکارانی ئێرانم کرد و یەکەمین بەیانەکانیشی هەر خۆم نووسیم" (سەبارەت بە خۆم ، پاشکۆی ١). ئەو یەکەمین رێکخراوی کرێکارانەیەی وا باسی لێوە دەکات کامەیە ؟ حزبی کۆمۆنیستی ئێران بە ماوەیەك دوای ئەو ساڵانە پێك هاتووە. یەکەمین کۆنگرەی حزب لە بەندەر ئەنزەلی و لە ساڵی ١٢٩٨ی هەتاوی [١٩١٨ی زایینی]، دووهەم کۆنگرەشی لە ورمێ ماوەی ٩ ساڵ دواتر بەستراوە، (خامەای، ئەنوەر،

٢٨٠) کەوابوو نیازی لاهووتی لە "یەکەمین ڕێکخراوی کرێکارانی ئێران" حزبی کۆمۆنیستی ئێران نەبوە. محمد عەلی سوڵتانی کەڵك لە بیرەوەرییەکانی مورخ‌الدوله سپهر وەردەگرێت بۆ ئەوەی بڵێ: "دامەزرێنەری حزبی سوسیال [سوسیال دێموکرات]، کولۆنێل محمد تەقی خانی پەسیان" و "میرزا حسین خانی معاون" بوون...... ئەم حزبی سوسیال دێموکراتە، یەکەمین حزبی سوسیالیستی چەپئاژۆی ئێرانە... لاهووتی لەم کەین و بەینی مەشروتەیەدا لە تارانەوە هاتەوە کرماشان و بەوشتانەی وا لە ئەندامیەتی حزبی سوسیال دێموکرات لە تاران فێریان ببوو، هەوڵی ئازادیخوازانەی خۆی لە کرماشان درێژە پێ دا..." (سوڵتانی، محمد عەلی، ١٩٩٩، ١، ١٣٤و ١٣٥).

ئەو بۆچوونەی سوڵتانی، کە بەشێکی لە ئەحمەدی موشیری وەرگیراوە، ئەندامیەتی کارای لاهووتی لە حزبی سوسیال دێموکراتدا دەردەخات. ئەندامێکی کارای دیکەی حزبەکە، "حەیدەر خانی عەموئۆغڵی" شۆڕشگێڕی بەناوبانگی ئێرانی بوو کە بۆ ماوەیەك لە کرماشان بە نهێنی ژیاوە و لاهووتیش هاوکاری ئەوی کردووە (هەمان، ١٣٨ و ١٣٩). سەبارەت بە حزبی سوسیال دێموکرات دەبێ ئاماژە بە خاڵێك بکەم: لە دامەزرێنەرانی حزبەکە، وەك گوتمان ئەم دوو کەسە بوون: محمد تەقی خانی پەسیان و میرزا حسین خانی معاون. بەگوێرەی لێکۆڵینەوەیەکی کاك "حکیم الله توحدی"، پەسیان شۆڕشگێڕی خۆشناوی ئێرانی کە بەداخەوە ئاغاواتی کوردی قۆچان کوشتیان، (توحدی، حکیم الله، ٥، ١٩٩٨، ٩٧، ٢٣٨). خۆی بە ڕەچەڵەك کورد بووە، میرزا حسین خانی معاونیش "کرماشانی و هاوڕێ و کاتبی یارمحەمەد

خانی کرماشانی" بووه. کەوابوو، دامەزرێنەرانی حزبەکە هەر کورد و ئەندامی سێهەمی دامەزرێنەریشی ـ کە لاهووتی بێت، هەر کورد بوو. لاهووتی لقی حزبەکەی لە کرماشان کردەوە و لە رۆژنامەی "بێستوون" دا کە بۆ ماوەیەك ئەرکی سەرنووسەریشی کەوتبووە ئەستۆ، دیعایەی بۆ هەڵوێست و بۆچوونە حزبی و ئایدیۆلۆجیکەکانی خۆی دەکرد.

بەم پاسە دەمەوێ سەرەهەردای هەندێ رووداوی گرنگی مێژووی ئەو سەردەمەی ئێران هەڵبگرم و بیانبەستمەوە بە کرماشانەوە: لاهووتی و حەیدەر خانی عەموئۆغلی هەر لەو ساڵانەدا "قشوونی نادری"یان لە ئەندامانی هۆز و عەشیرەتی کوردی ناوچەی کرماشان پێك هێنابوو. خالۆقوربانی هەرسینی کە درەنگتر لە بزووتنەوەی جەنگەڵ لە باکووری ئێران و شەڕی سمکۆ لە دەوروبەری مەهاباد بەشداریی کرد و تەنانەت بوو بە وەزیری جەنگی کابینەی میرزا کوچك خانی جەنگەڵی، دەست پەروەردەی ئەو قشوونە بوو (سوڵتانی، محمد عەلی، ١٩٩٩، ١، ١٤٠). هەروەها ئیحسان اللەخانی دۆستدار کەسایەتی دووهەمی بزووتنەوەی جەنگەڵ دوای میرزا کوچك خان، و نوێنەری باڵی چەپ لە بزووتنەوەکە، لە دامەزرانی قشوونی نادریدا دەوری بینی. ئیحسان اللەخان کە دەگوترێ دواتر بە دەستی میرزا کوچك خانی هاورێی کوژرا و هەر ئەوەش بووە هۆی هێرشی شیعریی لاهووتی بۆ سەر کوچك خان، لەلایەن دایکەوە کرماشانی بوو (سوڵتانی، محمد عەلی، هەمان، ١٤٠). من ئەو پێوەندییانە بۆیە دەردەخەم کە دواتر لە بەشی شەڕی لاهووتی و سمکۆ و کۆدیتای سووری تەورێزدا کەڵکیان لێ وەربگرم.

ئەوەی تائێستا گوترا دەریدەخات کە لاهووتی لەو بڕگەیەی مێژووی کرماشان و ئێراندا، خەباتکارێکی ناسراوی ئەوتۆ بووە کە سەردەوەرای زۆربەی رووداوە سیاسی ـ نیزامیەکان بە شێوەیەك لە شێوەکان دەگەیشتەوە ئەو. لەگەڵ حەیدەرخانی عەمو ئۆغلی و محمد تەقی خانی پەسیان و خەباتکارانی مەشرووتە و شۆڕشگێڕانی جەنگەڵ، یار محەممەد خانی کرماشانی، سالار الدولە و کەسایەتیە ناودارەکانی ناوچەی کرماشاندا پەیوەندی هەبوە. ئەحمەد بەشیری و محمد عەلی سوڵتانی هەردوکیان باسی پیلاننانەوە و دانانی "کمیتە مجازات" دەکەن کە لاهووتی لە پشتیان بووە و هەوڵی کوشتنی کاربەدەستانی گەورەی کرماشان و تەنانەت ئێرانیان داوە. (بەشیری، ئەحمەد، هەشتاد وچهار، سوڵتانی، محمد عەلی، ١٩٩٩، ١، ١٤٢). هەروەها بەگوێرەی نووسینی خۆی، لە پێوەندی بۆلشڤیکەکان سۆڤیەتیشدا هەر بووە، کە ئەوە نیشاندەری تێپەڕ کردنی قۆناغێکە لە ژیانی سیاسی ــ فیکری لاهووتی. پێشتر، لاهووتی ئێرانیچیەکی بێخەوش بووە، کە بیری لە رابوردووی "پڕ لە شانازی" ئێرانی پێش ئیسلام دەکردەوە و دژ بە داگیرکەرانی ئێران دەوەستا. بەلام لەم قۆناغەدا، رووناکبیرێکی پێشکەوتنخوازە کە رۆحی زەمانی دەرك کردووە و پارسەنگی هێزە دژکارە جیهانییەکان دەناسیّ و لە هەڵبژاردنی نێوان بەرەی ئەمپریالیسم و سوسیالیزمدا بەبیّ هیچ سیّودووکردنێك بەرەی کرێکاران و زەحمەتکێشان هەڵدەبژێرێت. دواتر دەبینین کە ئەو هەڵبژاردنە، لەو سەردەمە تایبەتەدا کارێکی زۆر هاسانیش نەبوە و لاهووتی کە بەوپەڕی دڵپاکی و لەخۆبردووییەوە، وەك کۆمۆنیستێکی خاوەن بڕوا خزمەتی زەحمەتکێشان دەکات، دواتر

دەکەوێتە گێژاوی ستالینسمەوە و کەم یا زۆر بەشدار یا لانی کەم پشتگیری ئەو جینایەتانە دەبێت کە دەزگای جەهەننەمی ستالین بەڕێوەی برد ـ گەرچی پاشان خۆیشی بوو بە قوربانی هەر ئەو دەزگایە و کەوتە ژێر چاوەدێری توندوتیژی دەزگای کا. گ. ب. وە، کە دواتر باسی لێوە دەکەین.

با بگەڕێینەوە سەر قۆناغی ژیانی لاهووتی لە کرماشان. ژیانی لاهووتی لە کرماشان بە شوێن ئەم ڕووداوانەدا، ئەستەم دەبێت و لەژێر هەڕەشەی "ڕووسە سپییەکان"دا (سەبارەت بە خۆم)، جارێکی تر هەڵدێت و دەچێتەوە ئەستەموول. تەئریخی ئەو سەفەرە بەتەواوەتی ڕوون نییە، بەڵام بەگوێرەی ڕووداوەکان دەبێ لە کۆتایی ساڵی ١٩١٧ یا سەرەتای ساڵی ١٩١٨دا بووبێت. لە ئەستەموول، بە هەژاری دەژی و لە بەندەر و چێشتخانە و چاپخانە، هەروەها وەك مامۆستای قوتابخانەی ئێرانییەکان ئیش دەکات و دەبێتە سەرنووسەری گۆڤاری "پارس" (سەبارەت بە خۆم)، تەنانەت بە یارمەتی دارایی هەندێ ئێرانی (وا هەیە یەك لەوان خان مەلیکی ساسانی باڵوێزی ئێران لە ئەستەموول بێت)، کتێبفرۆشییەك دادەنێت (بەیات، کاوە ١٩٩٧، ٣١).

### لاهووتی، شەرەفخانە و سمکۆ

دەگوترێ کە لاهووتی لە ماوەی ژیانی ئەستەمووڵدا عەتفێکی بەلای کەمالیستەکان (تورکە گەنجەکان)دا پەیدا کردبێت، کە جێگەی لێکۆڵینەوە و ڕوونکردنەوەیە، گەرچی زۆریش دوور لە ڕاستی نانوێنت لەبەر ئەوەی لەسەرەتای دامەزرانی حکوومەتی تورکە گەنجەکاندا سیاسەتی یەکیەتی سۆڤیەتیش هەر پشتگیری ئەتاتورکی دەکرد و

وەك كەسایەتیەكی دژی ئەمپریالیست هەڵیدەسەنگاند. لاهووتی، دوور نییە، بەهۆی هەڵوێستی دژی ئایینی خۆیەوە كە، لەگەڵ هەڵوێستی غەیرە ئایینی ئەتاتوركدا هاوتەریب بوو، هەستێكی لایەنگریی بەنیسبەت كەماڵ پاشاوە هەبووبێت. هەروەها پێشینەی خۆی و سەردەمی ژیانی لەناو عێلی سەنجابی وا هەیە زەمینەی بۆ ئەم عەتفە خۆش كردبێت. لەو سەردەمانەدا، لاهووتی لایەنگری توندوتیژی بەرەی سوێندخۆرەكان دژ بە هێزی ئینگلیز و رووسە سپییەكان بوو. مەسەلەی لایەنگری كردنی لاهووتی لە كەمالیستیەكان لە كتێبێكی كاك محمد عەلی سوڵتانیدا رەنگی داوەتەوە (سوڵتانی، محمد عەلی، ١٩٩٩، ١، ١٦٥). هەر ئەویش، لە شوێنێكی دیكەی كتێبەكەدا (لل ٢٠٢ تا ٢٠٨) باسی دامەزرانی "حزبی كمالیون" لە كرماشان دەكات و دەنووسێ "زۆربەی بەڕێوەبەرانی حزبەكە، لەناودارانی زانستی و هونەری و سیاسی كرماشان و كوردستان پێك دەهات و دەگوترا حاج ملك الكلام كوردستانی و دوو كوڕی، هەروەها ئەمیر حشمت و مێجەر اسد الله خان مەلیك زادەش ئەندامی كۆمیتەكە بوون. سوڵتانی لەعەینی كاتدا باسی پێوەندی سمایل ئاغای سمكۆش لەگەڵ كەماڵییەكانی ئێران دەكات و ناوی هەندێ كەسایەتی سیاسی ئێران دەبات كە ئەندامی حزبی كەمالییون بوون، لەوانە، حسن مدرس، سلێمان میرزا (ئەسكەندەری؟) و سید حەسەنی تەقی زادە، هەروەها دەڵێ "كەمالییون نامەیان بۆ سمكۆ نووسی (هەمان، ل٢٠٦) .

هەرچۆنێك بێت، لاهووتی لە ئەستەمووڵەوە جارێكی تر بەرەو ئێران دەبێتەوە و سەر لە مەهاباد (سابلاغ یاخود ساوجبلاغی موكری ئەو

دەم) دەردەهێنێت. لەم بارەیەوە لاهووتی دەنووسێت: "ساڵی ١٩٢١ هەواڵ گەیشت کە شۆڕش جارێکی دیکە لە "رەشت" هەڵگیرساوەتەوە. پێش ئەوەی بگەمەوە ئازەربایجانی ئێران، راپەڕینێکی ناوچەکە لەلایەن رەزاخانی وەزیری جەنگەوە تێك شکابوو" (سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ١). ئەو شۆڕشەی کە دەڵێ لە "رەشت" هەڵگیرسابووەوە، شۆڕشی جەنگەڵییەکان بە ڕێبەرایەتی میرزا کوچك خان و ئەو راپەڕینەش کە رەزاخانی پەهلەوی لە ئازەربایجان تێکی شکاندبوو، راپەڕینی دیموکراتەکانی ئازەربایجان بە ڕێبەرایەتی شێخ محمد خیابانی بوو، کە مخبرالسلگنەی هیدایەت والی ئازەربایجان لە ساڵی ١٩٢١دا تێکی شکاندبوو و خیابانی و چەند هاوڕێی ئەوی بەفێڵ کوشتبوو. کەوابوو، ساڵی گەڕانەوەی لاهووتی بۆ ئێران، ١٩٢١ی زایینییە، بەڵام با بزانین کەی و چ مانگ و رۆژێك ؟ کاوەی بەیات شوێنی ئەم سەفەرە گرنگەی بە باشی هەڵگرتووە. ناوبراو باسی "توغیان"ی سمکۆ دەکات و هاتنی هێزی دەوڵەت، کە توانیبوویان شەڕەکانی گێلان و خۆراسان کۆتایی پێ بهێنن، ئینجا بێنە لیدانی سمکۆ لە بەشی کوردنشینی ئازەربایجان. کاوەی بەیات بۆ باسی هاتنەوەی لاهووتی کەڵك لە بیرەوەرییەکانی مێجەر حەسەنی مەلیك زادە وەردەگرێت کە وەك فەرماندەی سوپای ئێران، نێردرابووە سابلاغ. دەزانین کە سمکۆ هەر ئەوەندەی هەواڵی هاتنی هێزی مەلیك زادەی بۆ مەهاباد بیست و زانی خەریکن بەرەو ورمێ بێن و بەرەنگاری سوپای کورد ببنەوە، دەستپێشخەری کرد و پێش ئەوەی هێزەکانی دەوڵەت بە خۆیاندا بێن، لە ورمێوە گەیشتە سەریان و تاقی لێ بڕین.

رحمەت الله خان معتمدالوزارە، کە بیرەوەری رۆژبەرۆژی خۆی لە رووداوەکانی راپەرینی سمکۆ نووسیوە و لە کتێبی " اورومیە در محاربە عالم سوز"دا گردوکۆی کردوون، سەبارەت بە چوونی سوپای سمکۆ بۆ مەهاباد دەنووسێت: سوپای سمکۆ رۆژی ٢ی مانگی سەفەری سالّی ١٣٤٠ [ـ ئوکتۆبری ١٩٢١] بەرەو سابلاّغ وەرِێکەوتن .... سمکۆ رۆژی ٦ی سەفەری خۆی چووە ناو شاری سابلاّغەوە و هەر ئەو رۆژەش ٤٠٠ جەندەرمەی ئێرانی گرت و تیرەبارانی کردن، ئینجا رۆژی ٨ی سەفەرەکەی گەرِایەوە بۆ ورمێ و رۆژی ٩ی هەمان مانگ گەیشتەوە چەهریق" (معتمد الوزارە، رحمت الله خان، ٥٢٤ و ٥٢٥). بەم پێیە، مەلیك زادە پێش رۆژی ٦ی سەفەری١٣٤٠ لە سابلاّغ بووە.

جا پاشماوەی رووداوەکان لە زمان کاوەی بەیاتەوە ببیسین. ناوبراو لە زمان مێجەر حەسەنی مەلیك زادەوە دەگێرِێتەوە دەڵێ: "ناوەراستەکانی مانگی میهری ١٣٠٠ بوو، لە ئۆفیسەکەی خۆم خەریکی ئیشکردن بووم کە سەروسەکوتی لاهووتی دەرکەوت. کەسێك لەبەردەرگا لەگەڵ پاسەوانەکەدا کردبوویە قیرِەوهەرا و دەیگوت "مەلیك گیانم دەوێ"، سەیرم کرد، لاهووتیم بە جل‌وبەرگی شرِەوە ناسییەوە. میهرەبانیم پێکرد، هێنامە سەرێ و بۆم دەرکەوت کە لەگەڵ ئەمیر حیشمەت و سەرهەنگ ئەفشار ئۆغلّودا، کە هەردوکیان ئەفسەر بوون لە تورکیاوە (کذا) هاتوون، ئیجازەی هاتنە ناو ولاّتیان نییە لەسەر سنوور رێگەی هاتنەوەیان پێ نەداون، بەلاّم چوونەتە ناو هۆزی مەنگورِ و حەسەن ئاغای مەزنی مەنگورِان رایگرتوون تا ئیجازە لە من وەربگرێت.... ئەسپەکەی خۆم و سێ ئەسپی ترم بۆ ناردن تا ئەمیر

حیشمەت و ئەوانی تر هاتن و میوانی من بوون. دەستبەجێ تێلگەرافێکم نارد بۆ والی [مخبر السلطنەی هدایت، والی ئازەربایجان] و گوتم کە "لاهووتی لە جەندەرمریدا حوکمی ئیعدامی دراوە، بەڵام چەرمەسەرێی چەند ئیعدامی بینیوە و باش وایە دەوڵەت لێی ببوورێت و ئەویش خۆی ئامادەیە لەگەڵ ئەفسەرەکانی تردا بێتە ناو هوردووی منەوە". لە ماوەی چەند سەعاتدا مخبرالسەڵتەنە وەڵامی دایەوە کە بۆ رێز گرتن لە تۆ، دەوڵەت لە هەموویان دەبوورێت، ئەمیر حیشمەت بنێرە تەورێز و ئەفسەرەکانی تر با لەوێ بمێننەوە." (بەیات، کاوە، ١٩٩٧، ٣٤، ٣٥).

ئەو رۆژە، بەگوێرەی بۆچوونی بەیات، دەکاتە ١١ی میهر (ـ ٢ی ئوکتۆبری ١٩٢١) لەبەر ئەوەی لە لاپەڕەی دواتردا دەنووسێت: "لە رۆژی ١٢ی میهردا ـ رۆژێك دوای گەڕانەوەی ئەمیر حیشمەت و لاهووتی، سابڵاغ کەوتە بەر هێرشی هێزی سمکۆ. ئەمیر حیشمەت چوو بۆ تەورێز، بەڵام لاهووتی و ئەفسەرەکانی تر چوونە ناو یەکەی سوپایی دەوروبەری سابڵاغەوە و بۆ بەربەرەکانی ئامادەبوون" (هەمان). تەئریخی ١٢ی میهری هەتاوی وا هەیە لەگەڵ ٦ی مانگی ناو یادداشتەکانی معتمد الوزارەدا چەند رۆژێك جیاوازی پێك بهێنێت، بەڵام تەئریخی مانگ و ساڵەکەیان هەر یەکن.

لە درێژەی بیرەوەرییەکانی مەلیك زادەدا هاتووە: لە کاتی شەڕی سمکۆدا، "لوولەی رەشاشێکی [جەندرمە]....تەقی و مەلیکزادە ویستی جەندرمەیەك بنێرێ لوولە لە عەمبار بهێنن. لاهووتی گوتی ژمارەی گوللەهاوێژەکان کەم مەکەوە من دەچم دەیهێنم، ئیتر هەر ئەو رۆیشتنە بوو، کە رۆیشت"(بەیات، هەمان). لێرەدا، بەیات کەڵك لە بیرەوەری

"سپەهبود امان الله جهانبانی" وەردەگرێت کە ئەویش لە زمانی کەسێك بە ناوی "سەرهەنگ ئاذەرتاش"ەوە کە خۆی بەشداریی شەڕەکەی کردووە دەنووسێت: : "لاهووتی دوای بەجێهێشتنی مەلیکزادە....چوو بۆ کێوی داشامەجید و لەوێ باسی خراپ بوونی بارودۆخی [شەڕەکەی] بۆ ئەفسەرەکان کرد و [لەگەڵ ئەواندا] "کولاس"ی تۆپەکەی هەڵگرت و چوو بۆ میاندواو." (بەیات، کاوە، ١٩٩٧، ٣٦).

دەزانین کە دوابەدوای ئەو رۆیشتنە، جەندرمە تێك شکان و زیاد لە ٣٠٠ تا ٤٠٠ کەسیان لێ کوژرا، بەڵام بابزانین لاهووتی بۆچی وای کرد؟ بۆچی مەیدانی شەڕی بەجێهێشت و پشتی "مەلیك گیان"ی خۆی بەردا ؟ بەشداریکردن لە تاقمی مەلیکزادە لەلایەك و چوونی دواتری بۆ شەڕەفخانە وەك پێگەی سەرەکی جەندرمەی ئێران بۆ شەڕی سمکۆ لەلایەکی تر، هەروەها کوژرانی مێجەر ئەبوالحسن خانی برای لە بۆکان لە شەڕی سەیدتەهادا (سوڵتانی، محمد عەلی، ١٩٩٩، ٢٢٩) ئەو هەستە دروست دەکەن کە لاهووتی دژ بە بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کورد وەستابێت، بەتایبەت کە لە ماوەی ژیانی سۆڤیەتدا وتارێکی بە رووسی نووسی و لەوێشدا بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کوردی بردە ژێر پرسیار و نەك هەر پرسیار بەڵکوو هێرشی توندوتیژ. من ئەوانە دەزانم و نامەوێ داکۆکی لە هەڵوێستی سیاسی لاهووتی لە پێوەندی مەسەلەی کورددا بکەم، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەو سەنگەر بەجێهێشتن و رۆیشتنەی، تەنانەت ئەگەر بە هەڵاتن تەفسیر بکرێت، جێگەی سەرنج و هەڵسەنگاندنە.

راستەقینە ئەوەیە کە لاهووتی ترسەنۆك نەبوو و لە شەڕیش نەدەپرینگاوە. کەوابوو، بەجێهێشتنی هێزی مەلیك زادەش دەبێ لەبەر هۆیەك یاچەند هۆی خوارەوە بووبێت:

(١) لاهووتی بەگوێرەی شارەزایی شەڕ و ئەزموونی مەیدانی پێکدادان، دەیزانی جەندرمە ناتوانن لەو شەڕەدا سەربکەون و دەشکێن،

(٢) لاهووتی بەگشتی نەیدەویست گوللە بە کوردەوە بنێت کە خۆشی هەر کورد بوو.

ئەگەر حاڵەتی یەکەم بوایە، دەبوو مەلیك زادەش لەگەڵ خۆیدا هاودەنگ بکات وپێکەوە بڕۆن و پاشەکشێش بە پاشماوەی جەندرمە بکەن ـ کە دەزانین وای نەکرد. ئەگەر حاڵەتی دووهەمیش بێت، ئەی بۆچی دواتر لەسەردەمی ژیانی سۆڤیەتدا، هەڵوێستی وا دژ بە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی گرت و وتاری ئەوتۆی نووسی ؟

(٣) ئیحتمالێکی سێهەمیش هەیە کە لە نووسراوەیەکی محمد عەلی سوڵتانیدا رەنگی داوەتەوە: لاهووتی لەسەردەمی ژیانی ئەستەموولدا عەتفێکی بە کەمالییەکان پەیدا کرد، سمکۆش بەشێوەیەك لە شێوەکان چەشنە پێوەندێکی لەگەڵیاندا هەبوو. محمد عەلی سوڵتانی باسی چالاکبوونی "حزبی کمالیون" لە ئێران دەکات و کەڵك لە بەڵگەنامە ئینگلیزییەکان وەردەگرێت. بۆ ئەوەی بڵێ: "زۆربەی کاربەدەستانی کەمالیون خەڵکانی ناوبەدەرەوەی زانستی و هونەری و سیاسی کرماشان و کوردستان بوون". هەروەها دەنووسێ: "لاهووتی لەم سەفەرەی ئەستەموولدا [جاری دووهەم] چووە ریزی کەمالیونەوە"

(سوڵتانی، محمد عەلی، ١٩٩٩، ٢٠٢ تا ٢٠٤). لە درێژەی باسەکەدا سوڵتانی لە نامەیەك دەدوێت کە حزبی کەمالیون [ی ئێران] بۆ سمایل ئاغایان نووسیوە (هەمان، ٢٠٦) و بەم شێوەیە دەگاتە ئاکامی ئەوەی کە سمکۆش و لاهووتیش هەردوك لە پێوەندی کەمالییەکاندا بوون.

ئەم بۆچوونەی سوڵتانی لەمەڕ پێوەندی لاهووتی و کەمالییەکان کەوتۆتە بەر رەخنەی کاوەی بەیات کە دەڵێ: "راپۆرتی هەڵەی باڵوێزخانەی ئینگلیز (لە تاران) نابێتە بەڵگەی سەلماندنی پێوەندییەکی ئەوتۆ (بەیات، کاوە، ٢٠٠٠). سوڵتانی لە وەڵامدا ئاماژە بە بۆچوونی یەکیەتی سۆڤیەت و روانگەیان بە نیسبەت کەماڵ ئەتاتورك و هاوکاریی سیاسی تورك و بۆلشڤیکەکان دەکات و دەڵێ پێوەندی نزیکی لاهووتی لەگەڵ حزبە کەمالییەکان شتێکی نەگونجاو نییە (سوڵتانی، محمد عەلی، ٢٠٠٠).

ئێستا پرسیاری مەزن ئەوەیە: ئایا هەر ئەو پێوەندییەی لاهووتی لەگەڵ کەمالییەکان، هۆی روو وەرگێڕانی لە شەڕی دژی سمکۆ نەبوو، کە ئەویش خۆی لەو بڕگە تایبەتەی خەباتیدا پێوەندی لەگەڵیان بوو؟ لاهووتی دواتر کاتێ دەگاتە شەرەفخانەش روو لە شەڕی سمکۆ وەردەگێڕێت و تەنانەت نەك هەر ناچێتە شەڕی سمکۆ، بەڵکوو بەگوێرەی سەرچاوەیەك، پێوەندیشی پێوە دەکات: هیدایەت، والی ئازەربایجان لە باسی گیرو گرفتی جەندرمەی شەرەفخانەدا دەڵێ: "وەك دواتر دەرکەوت، راپەڕیوەکان کاتێ لە من دڵسارد بوونەوە، لەگەڵ لاهووتیدا وتووێژیان کرد بۆ ئەوەی لەبەرانبەر کۆدێتای تاراندا کۆدێتایەك بکەن". (هیدایەت، مخبرالسلطنە، ٣٣١) . نیاز لە کۆدێتای

تاران ، كۆدێتای ڕەزاخانی سەردار سپە دژ بە سەید زیا تەباتەبایی"یە کە لە ٥ی خوردادی ١٣٠٠ ی هەتاوی واتە ٢٦ی مانگی مەی ١٩٢١ی زایینی، سەید زیای لە سەرۆك وەزیری لابرد و خۆی بوو بەسەرۆك وەزیر. لەم کارەشدا دەستی سیاسەتی ئینگلیز دیار بوو.

مخبر السلتەنە لە درێژەدا، دەنووسێ: "تەنانەت بانگی سمایل ئاغا [ی سمکۆ] شیان کردبوو، کە نووسراوەکەیان کەوتە دەست". (هیدایەت، مخبر السلطنە، هەمان). ناوەرۆکی ئەو نووسراوەیەی وا هیدایەت باسی دەکات نازانرێ چ بووە، بەڵام دەکرێ لە قسەکانی ئەوە وەربگیرێت کە جەندرمەی ناڕازی شەرەفخانە، کە پارەی سێ مانگیان نەدراوەتێ لە بیری راپەڕینێکدان و بە گەیشتنی لاهووتی ئیتر بیر و قسەیان دەبێتە کردەوە و دەکەونە پلان دانانی گرتنی تەورێز و پاشان تاران. بۆ ئەم کارەش لاهووتی ـبەگوێرەی کوردبوون و ئازایەتی و بوێری و هەروەها ئەو زەمینە و پێشینەیەی وا پێشتر باسمان لێوە کرد و لە هەموان گرنگتر لایەنگری لە کەمالییەکان، پێوەند بە سمایل ئاغای سمکۆوە دەکات کە ئەم پێوەندکردنەش دەبێ بە نامە بووبێت، بۆ ئەوەی سمکۆ لەگەڵ خۆیان یەك بخەن و بە هێزی کورد سمکۆ و جەندەرمەی شەرەفخانە وسوارەی خاڵۆ قوربان و پشتگیری دیموکراتەکانی "خیابانی"، سەرەتا تەورێز بگرن، ئیجا بە پشتیوانی پاشماوەی جەنگەڵییەکانی گێلان کە لاهووتی پێوەندی نزیکی لەگەڵ رێبەرانی پێشوویان وەك میرزا کوچك خان و احسان الله خان هەیبوو، شاری تاران بگرن، ئەوە سەرجەمی پلانەکەیان بوو. ئەوەی کە بەرنامەی راپەڕیوەکان بۆ گرتنی تاران دەردەخات قسەی

مخبرئەلسەڵتەنەیە کە دەڵێ لە ماوەی دەستبەسەربوونمدا لە تەورێز، شەویکیان "اجلال الملك" و "سەرتیپ زادە" هاتنە لام و داوایان لێکردم کە ئەرکی سەرۆك کۆماری بگرمە ئەستۆ" (هیدایەت، مخبرئەلسەڵتەنە، ٣٣٣).

ئەم پێوەندییەی لاهووتی لەگەڵ تورکە گەنجەکان، وا هەیە ریشەی لە عەتفێکی زووتری بەنیسبەت عوسمانییەوە بووبێت، کە لە بیرەوەرییەکانی سەردار موقتەدیری سەنجابیدا بە روونی دەرکەوت و ئێمە لە لاپەڕەکانی پێشتردا باسمان لێوە کرد. رووداوی مەهاباد هی مانگی ١٠ی ساڵی ١٩٢١ـە و لاهووتی لە ژیننامەکەی خۆیدا باسی لێوە نەکردووە، واتە بەسەریدا تێپەڕیوە.هەروەها باسی تکاو پاڕانەوە و و ناردنی شیعر بۆ مخبر السلطنەی هیدایەت والی ئازەربایجان ناکات کە داوای لێبووردنی لێ کرد هیدایەت لە "خاترات و خەتەرات"ی خۆیدا دەنووسێ: "لاهووتی ئەفسەری جەندەرمەیە، هەڵەیەکی کردبوو و هەڵاتبووە ئەستەمووڵ و [پاشان] سەری لە سابلاغ دەرهێنابوو. هاتە تەورێز و پەنای هێنایە بەر ماڵی من، شیعرێکیشی بۆ ناردم."

دەقی نامەی لاهووتی بۆ مخبرئەلسەلچتەنە و سێ فەرد لە ١١ فەردی شیعرەکەی، کە پێدا هەڵگوتنی مخبر السلگنەی هیدایەتە، بەم شێوەیە:

"١٠ صفر ١٣٤٠"

بە ناوی پیرۆزی غولامانی حەزرەتی ئەشرەف، راستەقینەی نیشتمان پەرەستی، جەنابی حاج مخبرئەلسەڵتەنە، شەوکەتی پایەدار بێت. لە ئەنجامی سەفەری ئەستەمووڵدا عەرزتان دەکەم:

سر اندرکف برای خدمت یار آمدم اینجا
کنم تا شکوه از بیداد اغیار آمدم اینجا...
شنیدم عزم خونخواهی ز بد خواه وطن داری
کنم تا خون خوددر راهت ایثار آمدم اینجا....
به لاهوتی محقق شد که اول مرد ایرانی
نه از روی هوی، با هوش و بیدار آمدم اینجا

(هدایت، مخبرئەلسەڵتەنە، ٣٢٥). مخبرئەلسەڵتەنە لەژێر شیعرەکە دا دەنووسێ: "شیعرەکان خراپ نین. زمان هەرچۆنێکی بگێڕی دەگەڕێت !" ئینجا دەڵێ "لاهووتیم ئەسپاردە دەستی "لندبرگ"ی سوێدی و گوتم ئیشی فەرمانیی پێ مەسپێرن و ئیش‌وکاری بەڕێوەیردنی پدەنێ". (هدایت، مخبرئەلسەڵتەنە، هەمان). بەم شێوەیە، لاهووتی دەگاتە تەورێز و لەوێوە دەنێرریێتە شاری شەرەفخانە. شەرەفخانە لە لێواری باکووری گۆلی ورمێ هەڵکەوتووە و زۆر لە شاری "خۆی"و ئەو ناوچەیە دوورنییە کە سمایل ئاغای سمکۆ شۆڕشەکەی تێدا بەڕێوە دەبرد. حکوومەتی ئێران ژمارەیەکی زۆری جەندەرمەی خزاندبووە ناو شەرەفخانە و لەوێوە دەیناردنە شەڕە جەنگی سمکۆ. لاهووتیش لەوێ دامەزرا، بەڵام مانەوەی لەو شارۆچکەیە زیاتر لە دوو مانگی نەخایاند کە بزووتنەوەیەکی سیاسی ـ سوپایی لەناو ریزی جەندەرمەکاندا سەری هەڵدا و ژمارەیەکی چەند سەد کەسی جەندەرمە بەسەرکردایەتی لاهووتی روویان کردە تەورێز، مخبرئەلسەڵتەنەیان گرت و حکوومەتێکی "سوور"یان راگەیاند.

لاهووتی لەم بارەیەوە دەنووسێ: "توانیم پێوەندی بە هاوڕێیانی پێشووی سوپاوە ببەستم، دەست بە پڕوپاگەندە لەنێو سوپاکەدا بکەم

و هێزێکی شۆڕشگێڕی نوێ کۆبکەمەوە. ئینجا لە مانگی جانیوەری ١٩٢٢دا لەگەڵ ئەوان بچمە شاری تەورێزەوە.... لە یەکەم ڕۆژی مانگی فیبرەوەریدا، دەسەلاتی تەورێز کەوتە دەست "کۆمیتەی شۆڕشگێڕ"ەوە. (سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی١).

چۆنیەتی ئەو ڕاپەڕینە لە لاپەڕەکانی کتێبی "از صبا تا نیما"ی یحیی ئاریەن پووردا ڕەنگی داوەتەوە .... ئاریەن پوور دەڵێ: "ڕۆژی ٣ی جمادی الثانی [هێزی جەندرمە] هاتە ناو تەورێزەوە .... بەڵام ڕۆژی ١٠ جمادی الثانی هێزی مياندواو گەیشتە تەورێز و شەڕ دەستی پێکرد. سەر لە ئێوارەی ئەو ڕۆژە جەندرمە شکان و لاهووتیش هەڵات بۆ ڕووسیا (ئاریەن پوور ، یحیی، ٢١٩). ناوبراو کۆپی هەندێك بەیان و ڕاگەیاندنی لە کتێبەکەیدا چاپ کردووە، کە دەریدەخەن لاهووتی فەرماندەی هێزی جەندرمە و یەکەم کەسی ناو بزووتنەوەکە بووە.

ئەوەی ڕاستی بێت لە هاتنی ناو شاری تەورێزدا، جەندرمە و لاهووتی کەڵکیان لە هاوکاری ژمارەیەکی زۆری چریکی خاڵۆ قوربانی هەرسینی وەرگرت. خاڵۆ قوربان خەیانەتی بە بزووتنەوەی جەنگەڵ کردبوو و لەلایەن ڕەزاخانەوە پلەی کولۆنێلی پێ درابوو، ئینجا خۆی و سوارەی بەردەستی نێردرابوونە ئازەربایجان و لەکاتی ڕاپەڕینی لاهووتیدا بەشێك لە کاری ئاسایشی شاری تەورێزیان بەدەست بوو. بەڵام دەبێ لاهووتی توانیبێتی لەژێرەوە پێوەندی بە خاڵۆقوربانەوە بکات و بەرەو جەندرمەکانی بکێشێت لەبەر ئەوەی سەرچاوەکان دەڵێن هەر لە دەروازەی تەورێزدا سوارەی خاڵۆ قوربان لەگەڵیان کەوتن و چوونە شەڕە جەنگی هێزی قەزاق ـ کە لە عەشائیری تورك پێك هاتبوو

و ئاسایشی شاری تەورێزیان بەدەست بوو. محمد عەباسی لە "تاریخ انقلاب ایران"دا ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە و دەڵێ جەندرمە"لەگەڵ دیموکراتەکانی تەورێزدا راوێژیان کردبوو" (عەباسی، محمد، ١٩٧٩، ٤٢٤). ئەو بۆچوونە لەلایەن "مسعود بهنود"یشەوە دوویات دەبێتەوە کە لە کتێبی "دولتهای ایران از سید ضیاء تا بختیار"دا دەنووسێ "پێش ئەوەی کابینەی حسن پیرنیا [مشیرالدوله] تێك بچێت، لاهوتی و ئەفسەرانی جەندرمە لە ئازەربایجان پێوەندی ئازەربایجانیان لەگەڵ تاران بڕی و پاشماوەی لایەنگرانی شێخ محمد خیابانیش لەگەڵیان کەوتن" (بهنود، مسعود، ٤١).

لەو کابینەیەی "مشیرالدوله" دا رەزاخانی سەردار سپەه [رەزاشای دواتر]، وەزیری جەنگ بوو. بەڵام بێگومان هێزی سەرەکی ناو شاری تەورێز کە یارمەتی جەندرمەی لاهووتییان دا و هەر لە هەنگاوی یەکەمی چوونە ناو شارەوە پشتیان گرتن، سوارەی خالۆ قوربانی هەرسینی بوو. ئەحمەدی بەشیری ژمارەی سوارەی خالۆ قوربان لە تەورێز بە ٦٠٠ کەس دادەنێت (بەشیری، ئەحمەد، نەوەدو دوو).

حیکایەتی خالۆقوربان دوورو درێژە. محمد عەلی سوڵتانی یەکەم مێژوونووسی کورد و ئێرانییە کە لە زاویەیەکی جیاوازەوە سەیری خالۆ قوربان دەکات. ئەو دەنووسێ: "خالۆ قوربان لە خەڵکی هەژار بوو، لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا لەلایەن سەرانی دیموکرات و موجاهیدی تورکی قاوقازەوە لەناو "قشوونی نادری" [کرماشان]دا لە باری سیاسی و سوپاییەوە راهێنرابوو و "بە پێچەوانەی داب و رەسمی فیئودالی سەردەم [کە تەنیا ئاغاوات و سەرۆك هۆز دەیانتوانی

سواره و سوپایان هەبێت]، نزیکەی هەزار سوپایی لێهاتووی کوردی لە وەرزێر و رەعیەتی هاوشانی خۆی پێك هێنابوو". نووسەر، ئینجا باسی چوونی خاڵۆ و سوارەکەی بۆ گێلان و یارمەتی سوپای جەنگەڵییەکان دەکات و ئەو تاوانە بەرپەرچ دەداتەوە کە دەگوترێ گوایە ئەو بوو سەری کوچك خانی کۆنە هاوڕێی خۆی بڕی و لەم پێوەندییەدا بەڵگەیەکی بێ گومان دەخاتە روو، بەڵام بۆی ناشارێتەوە کە دوای ئەوەی فریوی رەزاخانی خوارد و سەنگەری گۆڕی، سەرە بڕاوەکەی کوچك خانی بە دیاری هێنایە تاران و بردی بۆ رەزاخان، لەبەرانبەردا نازناوی "سالار مەنسوور"ی وەرگرت (سوڵتانی، محمد عەلی، ١٩٩٩، ٢٢٤ تا ٢٢٦).

لە درێژەدا، سوڵتانی دەنووسێت دوای کۆتایی هاتنی کاری بزووتنەوەی جەنگەڵ، سوارەی کوردی خاڵۆ قوربان لە تاقمی ٢٠٠ کەسیدا دەنێردانە ئازەربایجان و تەنیا ٥٤٠ کەسیان لە گێلان گل درانەوە (هەمان، ٢٢٦). بەم پێیە، هەبوونی ژمارەیەکی چەند سەد کەسی سوارەی کورد لە تەورێز جێگەی گومان نییە. مخبرئەلسەڵتەنەش لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ: "خاڵۆ قوربان بە ٦٠٠ کەس لوڕەوە .... نێرداوەتە ئازەربایجان". (هیدایەت، مخبر السلطنە، ٣٣١).

هەر لە پێوەندی خاڵۆ قوربانی هەرسینیدا، باش وایە ئاماژە بە رەنگدانەوەی کارەکانی ئەو تاقمە لەناو کۆمەڵانی گەلی کورد لەناوچەی موکریانیش بکەم. پاش رووداوی کودیتای لاهووتی و هاوکاری کردنی سوارەی خاڵۆ قوربان لەگەڵ جەندرمە راپەڕیوەکان و

تێك شكانی بزووتنەوەكە، حكوومەتی ئێران ئاوقای سمكۆی كردن و لە تەورێزەوە ناردنیە ناوچەی بۆكان و سابلاغ بۆ ئەوەی بەگژی سوارەی سمكۆدا بچن. خەڵكی ناوچە، ئەوەیان بەلاوە گران دەهات و هەرسینیەكانیان بە پیاوی حكوومەت و بە جاش دەزانی و ئەم شیعرانەیان بۆ هەڵبەستبوون:

خاڵۆ قوربانی ردێن پاش و پێش    هەستە لە خەویٚ سەگبابی جاكێش !
خاڵۆ قوربانی ردێن كلكە كەر،    هەستە لە خەویٚ پیاوت هاتە سەر !

جا هەر بەو هەستەشەوە بەربەرەكانییان دەكردن، هەتا ئەوەی لە تێكگیرانێكدا لەگەڵ هێزی مەنگوڕ ـ كە یارمەتی سوپای سمكۆیان دەدا، خاڵۆ قوربان كوژرا و سوپاكەی بڵاوەیان كرد. هەر لەو شەڕانەدا، برای لاهووتیش لە بۆكان بە دەستی سوارەی سەیدتەهای شەمزینی كوژرا (سوڵتانی، محمد عەلی، ١٩٩٩، ١، ٢٢٨).

كاك هەمزەی بایەزیدی، كە خۆی لە هۆزی مەنگوڕە، پێی گوتم كە "سوارەی ئەحمەدی گوڵ ئاغا" خاڵۆ قوربانی كوشتووە. ناوبراو ئەم شیعرەشی پیٚ گوتم كە نووسیمەوە. شیعرەكە، پەسندی كاری "سوارەی ئەحمەدی گوڵ ئاغا" دەكات:

"ئافەرین سوارە، ئەسڵ مەنگوڕی    رات كردە خاڵۆ، خاڵۆت سەربڕی"

**(چاوپێكەوتنی مانگی ٦ی ساڵی ٢٠٠٢، لە لەندەن)**

دەوری لاهووتی وەك فەرماندەی جەندرمە لەلایەك و دۆست و هاوشاری و برادەری خاڵۆ قوربان لەلایەكی تر، لە مەسەلەی پێكەوە بەستنی ئەو دوو هێزەدا گەلێك سەرەكی و گرنگە. لاهووتی لێزانی سیاسی كار، نەك هەر مەترسی بەربەرەكانی سوارەی خاڵۆ قوربانی لەسەر جەندرمە لابرد، بەڵكوو

هەمووی هێنانە خزمەت راپەرینەکەوە. مخبر السلگنەی هیدایەت دەنووسێ:
"خالۆ قوربان دەستبەجێ لەگەڵیان کەوت" (هیدایەت، مخبرئەلسەلتەنە، ٣٣١). هەرچۆنێك بێت، جەندرمە شاری تەورێزیان گرت، مخبرئەلسەڵتەنەی والی و هەندێکی تر لە کاربەدەستانیان زیندانی کرد، قەزاقیان لە شار وەدەرنا و حوکمی تەورێزیان گرتە دەست.

ئامانجی لاهووتی و هاورێکانی دامەزرانی حکوومەتێکی "سوور" واتە سوسیالیستی لە تەورێز بوو و، بۆ ئەم ئامانجە پشتیوانی پاشماوەی هێزی دیموکراتی بزووتنەوەی خیابانییان لەگەڵ بوو. ئەوان دەیانویست لە تەورێزەوە بەرەو تاران بئاژوێن و سیستەمی سیاسی ئێرانیش بگۆڕن ـئەرکێك کە بە دڵنیایی بیری تەواویان لێ نەکردبووەوە و تەنیا وەك خولیایەك لە مێشکی خۆیاندا خولْقاندبوویان. ئەو ئامانجە، ٤١ساڵ پێشتر شێخ عبیداللەی شەمزینیش دەری بڕیبوو. شێخ دوای گرتنی مەهاباد و میاندواو، سوپای کوڕەکەی بەرەو تەورێز ناردبوو و بە نامەش ئاگاداری عەباس میرزای مولك ئارا ـ کوڕی ناصرالدینشای کردبووەوە کە دەیەوێ بێت و تاران بگرێت ئەویش بکاتە شا و لەجیاتی ناصرالدنیشای دابنێت. بەڵام هێزی بەربڵاوی عەشائیر و ئەو ئاپۆڕەیەی وا لەگەڵ شێخ عەبدوالقادری کوڕی کەوتبوون، تەنانەت بەربەرەکانی خەڵکی شارۆچکەی بناو و مەلای پێشنوێژی شارەکەیان پێ نەکراو بە شکاوی و شپرزەیی گەڕانەوە دواوە.

جەنەرمەی لاهووتیش زیاد لە ١١ رۆژ شاری تەورێزیان بۆ رانەگیرا و شار کەوتەوە دەست هێزەکانی ئێران. یحیی ئاریەن پوور هۆی تێکشکانی هێزی جەندرمە بە دووشت دادەنێت،

١. هاتنی هێزی یارمەتی سوپای دەوڵەت لە میاندوادوەوە،
٢. ئاڵۆزی و بشێویی ناوشار لە ئەنجامی هێرشی فەوجێکی قەزاق کە بووە هۆی کوژرانی سوڵتان(سەروان) تورەج میرزا، فەرماندەیەکی جەندرمە و لە ئەنجامدا ئیتر جەندرمەکان خۆیان بۆ رانەگیراو کشانە دەرەوەی شار.

هەر ئەو کشانەوەیەش بوو کە لاهووتی لە ئەنجامیدا رووی کردە چۆمی ئاراس و سنووری سۆڤیەت، ئینجا پەڕییەوە و لەوێ خۆی تەسلیمی حکوومەتی سۆڤیەتی کرد (ئاریەن پوور ، یحیی، ١٩٧٢، ٣٨٣). محمد عباسی، هەمان ریوایەت دەگێڕێتەوە و ئەوەی لێ زیاد دەکات کە تێك گیرانی سوڵتان تورەج میرزا و قەزاقەکان لەناوچەی "شەشگیلان" ی تەورێز رووی دا و هەروەها دەڵێ هێزی دەوڵەتی ئێران لە هاتنە ناو شاردا، تەورێزیان تاڵان کرد و پاشان دادگایەك بۆ موحاکەمەی جەندرمە دەستبەسەرکراوەکان پێك هات کە سەرۆکەکەی سەرتیپ بصیر دیوان [سەرلەشکر زاهیدی دواتر]و دادئەستێنەکەی سەرهەنگ "معین الملك قریب"بوو (عباسی، محمد، ١٩٧٩، ٤٢٩ و ٤٣٧ بە دواوە).

سەرچاوەیەکی زۆر هەن کە باسی "کۆدیتا" یاخود"راپەڕین" یا "شۆڕش" یا "شۆڕشی سووری" لاهووتییان لە تەورێز کردووە و من بەپێویستی نازانم رەنگدانەوەی هەموویان لێرەدا بنوێنم. تەنیا بیرەوەرییەکانی لاهووتی لەم بارەیەوە دەنووسم ئینجا هەڵسەنگاندنی خۆمی لێ زیاد دەکەم.

لاهووتی لە ژیننامەمەیدا دەنووسێ: "هێزی سزادان" [ی دەوڵەت] لەسەر شەقامەکانی شاری تەورێز دەستیان کرد بە وێرانکردن و تاڵان

و بڕۆ. بەشێك لە ڕاپەڕیوەکان روویان کردە چیا و پاشماوەی ئێمەش بەدەم شەڕکردنەوە بەرەو سنوور کشاین. جادەکانی ئێران داخرابوون و رژێمی شا، ناوی ئێمەی وەك سەربزێو ڕاگەیاند بوو و جائیزەی بۆ سەرمان دانابوو. ئیتر وا دەردەکەوت کە ئەوە کۆتایی ژیانم بێت، بەڵام لەو شەوە شوومەدا کاتێ ئەسپەکەم لە ئاوی چۆمی ئاراس دا، رووناکایی ڕۆخێك دەرکەوت، هەستم سەبارەت بەوکاتە لە پارچە شیعرێکدا دەەبڕیوە کە ناوی ئەوەیە:

"بۆ گەڕان بەدوای حەقیقەتدا هاوار دەکەم".

(بڕوانە سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی١).

سەرچاوەیەکی فارسی مێژووی ڕووداوەکانی شەرەفخانە و تەورێزی بەم شێوەیە تۆمار کردووە:

٢٧ جانیوەری ١٩٢٢ ڕاپەڕین

٨ فیبریوەری ١٩٢٢ تێکگیرانی جەندرمە لەگەڵ هێزی سەرتیپ حبیب الله شیبانی

١١ فیبریوەری ١٩٢٢ هەڵاتنی لاهووتی بەرەو سنووری سۆڤیەت.

سەرەڕای هەندێ جیاوازیی، تەئریخەکان هەر ئەوانەن کە لە شوێنەکانی دیکەشدا باسیان لێوە کراوە و من بەشێکیانم پێشتر ڕاگەیاندوون. سەرچاوەی ئەم زانیارییەم کتێبی "گاهنامە پنجاه ساڵ شاهنشاهی پەهلەوی" نووسینی "شجاع الدین شەفا"یە، کە کاك سلێمان چیرە (هێرش) چەند بەشێکی لێ وەرگێڕاوەتە سەر کوردی و لە سایتی "گزینگ"دا بڵاوی کردۆتەوە. من تەنیا چاوم بە تەرجەمە کوردییەکە کەوتووە (شەفا، شجاع الدین).

تائێستا، باسی قۆناغێك له ژیانی لاهووتی كراو لێره بەدواوه تا سەردەمی مردنەكەی (١٩٥٧) قۆناغی دووهەمی ئەو ژیانه پڕ رووداوه دەست پێدەكات. بەڵام پێش چوونه ناو قۆناغی ژیانی لاهووتی، پێویسته چاوێك به دێڕەكانی پێشووماندا بگێڕینەوه:

لاهووتی له باوكێكی فارس (یا زۆر وا هەیه لوڕ) و دایكێكی كوردی سەنجابی له شاری كرماشان دێته جیهان، خوێندنی ئایینی وەك فەقێیەك دەخوێنێت، دەبێته دەروێشی نعمت اللهی، ماوەیەك ئایین دەگۆڕێ و روو له بەهائیەت دەكات. بەڵام زوو لێی پەژیوان دەبێتەوه. وەك بێچوه مراوی له تەمەنی منداڵییەوه شیعر دەڵێ، واته بۆ ئەم كاره شوێنی باوكی شاعیری خۆی هەڵدەگرێت، یەكەم شیعری له تەمەنی ١٢ یا ١٥ ساڵاندا بڵاودەكاتەوه، خۆی یا باوكی یا هەردوكیان دەكەونه پێوەندی ماسۆنەكانی كرماشانەوه و، ئەوانیش به پیتاكی خۆیان لاهووتی دەنێرنه تاران. تا ئەم قۆناغه، نیشانەیەكی زۆر له هەڵوێستی سیاسی لاهووتی بەدەستەوه نییه. بەڵام كوڕه لاوه كرماشانیەكه، له تاران بەدەم خوێندنەوه لەگەڵ بیری سیاسیدا ناسیاوی پەیدا دەكات و، "سەردەم" واته رووداوەكانی پێش بزووتنەوەی مەشرووتەش یارمەتی ئەو ناسیاوییەی لاهووتی دەدەن. لەگەڵ بزووتنەوەی مەشرووته دەكەوێت و لەسەردەمی "استبداد صغیر"ی محەمەد عەلیشادا، لەناو فەوجی جەندرمەی یەپریم خانی ئەرمەنی ـ قۆماندانی شۆڕشگێڕی هێزی تازه دامەزراوی پۆلیسی تاراندا دەبێت و لەگەڵ هەڤاڵەكانی پارێزگاریی سەنگەری مەشرووته دەكات. بەسەركەوتنی دووبارەی استبداد، هەڵدێت و دەیەوێ بچێت بۆ رەشت كه هێشتا ورەی خەباتی

تێدا ماوە، بەڵام لە ڕێگە دەگیرێت و بە یارمەتی پاسەوانێکی کورد لە زیندان هەڵدێت. دەگاتە ڕەشت و دەچێتە جەرگەی خەباتەوە، لەوێ میداڵیای "ستارخان"ی خەڵات دەکرێت. لەگەڵ میرزا کوچك خان و هێزی مەشرووتە بەرەو قەزوێن و تاران دێت، دەبێتە ئەفسەرێکی جەندرمە و فەرماندەی بنکەیەك لەسەر ڕێگای قوم. لەوێ تۆمەتی قەتڵی لێ دەدرێت و مەحکووم بە ئیعدام دەبێت. هەڵدێت و ماوەی ٨ مانگ لە خاکی عوسمانی، لە شاری سلێمانی و کەرکووك و مووسڵ و ئەستەموول دەمێنێتەوە. بە هەڵگیرسانی ئاگری شەڕی یەکەمی جیهانی دێتەوە کرماشان، دەبێتە سەرنووسەری گۆڤاری "بێستوون" و لە دامەزرانی حزبی سوسیال دێموکراتی ئێران هەروەها کرانەوەی لقی حزبەکە لە کرماشاندا دەور دەبینێ. لەو ماوەیەدا لاهووتی هەڵگری بیری ناسیۆنالیستیی ئێرانی و لایەنگری یەکیەتی گەلانی ئێران و دژ بە داگیرکەرانی رووس و ئینگلیزە. بەڵام بەگوێرەی ژیننامەی خۆی و هەروەها بەگوێرەی پێگەی چینایەتی ـ کە کوڕە پینەچییەکی هەژار بووە، بیری یەکسانی و بەرانبەریی کۆمەڵایەتی لە مێشکیدا چرۆی کردووە و، وەك لە شیعرەکانی ئەو سەردەمەشی دەردەکەوێت ئەو هەڵوێستە باوەکوو زۆریش لە ئاکاری ڕۆژانەیدا خۆی نەنواندبێت، بەڵام بەشێك بووە لە کەسایەتیەکەی و هاندەرێك بووە بۆ خوڵقاندنی شیعرەکانی:

به قتل و غارت دهقان و استثمار زحمتکش
فقط مسجد بود بانی ویا دربار یا هردو
بنای ظلم و استبداد صنف مفتخور، ویران
زچکش می شود یا داس جوهردار، یا هردو

**(شیعری "وطن ویرانه" ، ١٩٠٩، لاپەڕە ١٢٥ی دیوان).**

له ماوەی خەباتی مەشرووتە و ساڵانی جەندرمریدایە کە لاهووتی لەگەڵ بیری چینایەتی ناسیاوییەکی زیاتر پەیدا دەکات و، زۆر وا هەیە لەژێر تەئسیری خەڵکانی شۆڕشگێڕی وەك حەیدەر عەموو ئۆغلی، محەممەد تەقی خانی پەسیان، یەپریم خانی ئەرمەنی و هەروەها لە رێگەی شیعری شاعیرانی ئازەربایجانی وەك میرزا عەلی ئەکبەری صابر (هۆپ هۆپ) و حزبی موساواتی ئازەربایجانەوە بەرەوکاری رێکخراوەیی و حزبی کشابێت کە دەگاتە ئەنجامی ئەوەی ببێتە ئەندامی کارای حزبی تازەدامەزراوی سوسیال دێموکرات و وەك خۆی باسی دەکات، یەکەم بەیانەکانی رێکخراوەکەش ئەو دەیاننووسێ (سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ۱) و لقی حزبەکە لە کرماشانیش هەر ئەو دەیکاتەوە (سوڵتانی، ۱۹۹۹، ۱۳۵). لە ژیننامەکەی خۆیدا کاتێ لاهووتی باسی رووداوەکانی ساڵی ۱۹۱۱ دەکات، دەنووسێ: "ئێمە جارێکی تر لەژێر دروشمی سووردا سوێندمان خوارد بە شۆڕش [ی مەشرووتە؟] وەفادار بمێنینەوە" (سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ۱).

لەو رستە کورتەدا، دوو خاڵی جێگەی باس هەیە:

یەکەم، قەیدی "جارێکی تر" وا دەگەیێنێ کە لاهووتی پێشتریش لەگەڵ هاورێیانی شۆڕشگێڕی خۆیدا سوێندی وەفا و ئەمەکداریی بە شۆڕشیان خواردبێت.

دووهەم، ئایا سوێندخواردنی یەکەمیشیان هەر لەژێر دروشمی سووردا بووە یاخود تەنیا ئەمجارەیان ؟

هەروەها ژیننامەکە بە راشکاوی دەریدەخات کە پێش ئەوەی بۆ جاری دووهەم بڕواتە ئەستەموول، واتە پێش شۆڕشی ئۆکتۆبری ۱۹۱۷ی رووسیا

ـ كە بەدوای ئەودا کەوتە کێشەوە لەگەڵ گاردە سپیەکانی ناو سوپای رووس لە کرماشان و مەجبوور بە هەڵاتن بوو، "بەشدرایی یەکەمین ڕێکخراوی کرێکاری ئێران"ی کردووە و "یەکەمین بەیانەکانیشی هەر خۆی نووسیونی" (سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ١). بەم پێیە بیری سوسیالیستی دەبێ لە ماوەی ساڵانی دوای چوونە تاران (١٩٠٤)و پێش هەڵاتنی دووهەم بۆ ئەستەموولٚ (١٩١٧) بە تەواوەتی بووبێتە بەشێك لە کەسایەتی لاهووتی، گەرچی لەو سەردەمەدا هێشتا وەك ناسیۆنالیستێکی بەتاووتینی ئێرانی دڵی لەلای "نیشتمان"و "دیار"ی خۆیەتی و ئەم هەستی ئێرانیچیەتیە لە ماوەی ساڵانی غەریبی و ژیانی نالەباری ئەستەمووڵدا تێکەڵ بە نۆستالژییەکی خەست دەبێت و ئێران لە حیساباتی ژیانیدا ، پێش خۆی دەکەوێت:

بجان دوست، غیراز درد دوری از دیار خود
در این دنیا ندارد جان لاهوتی غم دیگر

(شیعری، "غم دیگر"، ئەستەموڵ جولای ١٩١٩،ل ٦٤ی دیوان).

بەڵام خونچەی بیری چینایەتی هەر لەو ساڵانەدایە کە دەپشکوێ و شیعری لاهووتی دەگەیێنیتە پلەیەکی بەرزی هونەری کۆمەڵایەتی:

ز فقر زارع و دل سختی مالک بود روشن
که ایران می‌شود ویران ز استبداد و مینالم
خیانتهای شاه و جهل ملت را چو می‌بینم
از آن ترسم که این کشور رود بر باد و مینالم
رعیت را فروشد با زمین، ملاک و می‌بینم
که ملت عاجز است از دفع این بیداد و می‌نالم
زبند سبحه می‌فهمم که از این رشته، دلدارم
به حبس چادر و دام نقاب افتاد و می‌نالم

جهان را فعله، لاهوتی، بپا کرده است و می‌بینم
که خود هرگز نبد در خانه‌ای آباد و می‌نالم

**(شیعری، "می نالم"، ئەستەموولّ. ئۆکتۆبری ۱۹۱۹، ل ٦٦ی دیوان).**

هەڵسەنگاندنێکی سەرپێیی ئەم شیعرە دەری‌دەخات کە لاهووتی لەم قۆناغەی ژیانیدا نیشتمانپەرستێکی بێخەوشی ئێرانییە و هەموو چاکەیەکی بۆ گەل و وڵاتەکەی دەوێت، بەڵام گەوهەری بیر و شێوازی داواکاریی مافەکان، سوسیالیستیە و دژایەتی کردنی شا (ئەحمەد شای قاجار) تەنیا بەشێکی بچووکی هەڵوێست گرتنی لاهووتییە. بەشی سەرەکی پەیام و بانگەوازی ناو شیعرەکە ، لایەنگریی پاڵە و کرێکار و دژایەتی خاوەن زەوی و چەوسێنەرە.

لایەنی گرنگی دیکەی شیعرەکە، دژایەتی نواندنە بەرانبەر بە مەلا و لە راستیدا ئایین ـ کە "دڵدار"ەکەی لاهووتی واتە ژنانی ئێرانی مەجبوور کردووە چارشێو و رووبەندە بە روویانەوە بگرن. ئەم شیعرە دەتوانێ ئاوێنەیەکی باڵانوێنی بیر و هەڵوێستی لاهووتی بێت لە ساڵانی ئاوارەیی ئەستەمووڵ و درێژەی هەڵوێستە سیاسی ـ کۆمەڵایەتیەکەی پێشووی بێت کە لە شیعری "وطن ویرانه"ی ساڵی ۱۹۰۹و ئەندامیەتی حزبی سوسیال دێموکراتدا خۆی نواندبوو.

## بەرەو یەکیەتی سۆڤیەتی:

بیرەوەرییەکانی لاهووتی خۆی، رۆژی لە ئاودانی چۆمی ئاراس و پەڕینەوەی بۆ خاکی سۆڤیەت دەرناخەن، بەڵام ئەم گرێیە خەڵکانی تر دەیکەنەوە. یحیی ارین پور رۆژی یەکەمی راپەڕینی جەندرمە و

دیموکراتی خیابانی لە تەوریز بە "اول جمادی الثانی ۱۳٤۰" و رۆژی تێك شکان و هەلاتن لە تەوریز یان بە ۱۱ی جمادی الثانی هەمان ساڵ دادەنێت. (ئاریەن پوور، یحیی، ۱۹۷۲، ۲۱۹). ). غولام رەزا میرزا صالح رۆژی هەلاتنی لاهووتی بۆ قاوقاز بە "۸ بهمن ۱۳۰۰ی هەتاوی" دەنووسێت (میرزا صالح، غولامرزا، ۲۱۱). بەداخەوە کەسرەوی کە زۆربەی زانیاری ناو کتێبەکەی (تاریخ هیجده ساله ازربایجان) راست و بەبەڵگەن، سەرەڕای ئەوەی باسی رووداوەکانی ئەو سەردەمە واتە حکوومەتی مخبرالسلطنه، راپەڕین و کوژرانی خیابانی، شەڕی سمکۆ وتەنانەت شەڕی مەلیك زادە لە سابلاغ و پێکدادانی سمکۆ و سوپای دەوڵەت لەنزیك شەرەفخانە دەکات، تەنانەت ناوێکیش لە لاهووتی و جەندرمەی شەرەفخانە و "شۆڕشی سوور"ی تەوریز نابات (کەسرەوی، ئەحمەد، ۱۹۹۲، لاپەڕە ۷۹۱ بەدواوە). دوور نییە بەهۆی حەساسیەتی حکوومەتی ئێرانەوە ئەم بەشانە لە کتێبەکەی هەلاوێرداربێت. محمد عەلی سوڵتانیش کە بە کورتی باسی راپەڕینەکەی لە یەکدوو لاپەڕەی کتێبەکەیدا کردووە، نەچۆتە سەر مەسەلەی تەئریخ و رۆژ و مانگ (سوڵتانی، محمد عەلی، ۱۹۹۹، ۲۱۰ و ۲۱۱).

ئەحمەدی بەشیری لەسەرەتای دیوانی لاهووتیدا دەڵێ جەندرمەی شەرەفخانە "بە تەقەو هەرا رۆژی یەکەمی مانگی بەهمەنی ۱۳۰۰ی هەتاوی چوونە ناو تەوریزەوە.... سەرتیپ زادەی رێبەری حزبی دیموکرات [ی خیابانی] بوو بەسەرۆکی شەهرەبانی [پۆلیس]، کۆمیتەی شەڕ پێك هات..... و هێزی ئازادیبەخش خۆی ئامادە دەکرد بەرەو پێتەخت بئاژوێ و بیگرێت..... سەرتیپ حبیب الله شیبانی کە

بۆ سەرکوتکردنی کوردان چووبووە میاندواو گەڕایەوە و گەیشتە یاریدەی قەزاق، شەڕێکی خوێناوی دەستی پێ کرد، لاهووتی پاشەکشەی کرد و لەگەڵ تاقمێکی چەکداردا لە ڕێگەی جوڵفاوە پەنای بردە بەر خاکی قاوقاز، ئەم ڕووداوەش ڕۆژی ٨ی بەهمەنی ١٣٠٠ ڕووی دا (بەشیری، ئەحمەد، نەوەدوو سێ و نەوەدوو چوار).

وەك دەبینین ماوەی "حکوومەتی سوور"ی لاهووتی لە تەورێز بەگوێرەی بەشیری، نۆ ڕۆژی نێوان ١ و ٨ی بەهمەنی ١٣٠٠ ی هەتاوییەو ئەم ڕۆژانە بەرانبەرن لەگەڵ ٢١ تا ٢٨ی مانگی جانیوەری ساڵی ١٩٢٢ی زایێنیی. ئێمە دواتر دەگەڕێینەوە سەر ئەم حیسابە.

کاوەی بەیات تەئریخی ڕۆژەکان بەم شێوەیە دەست نیشان دەکات:

١٠ بەهمەن ١٣٠٠، گیرانی مێجەر مەحموود پولادین سەرۆکی بنکەی شەرەفخانە لەلایەن جەندرمەکانەوە

١١ [سەر لە بەیانی] تێپەڕکردنی" شەبستەر" و گەیشتن بە "سۆفیان"

١٢ گەیشتنە ناو تەورێز

١٣ گرتنی تەواوی شار و پاشەکشەی قەزاق

١٦ ئاگادار بوونەوەی حکوومەتی ناوەندی تاران لە ڕووداوەکانی تەورێز ناردنی تێلگەراف لەلایەن لاهووتییەوە بۆ ڕەزاخانی سەردار سپەه

١٧ گەڕانەوەی هێزی شەیبانی لە میاندواوەو بۆ تەوریز

برانی مخبرالسلطنە و هاوڕێکانی بۆ بنکەی جەندرمە.

١٨ دامەزرانی هێزی شەیبانی لە "باغ شمال" مۆڵگەی قەزاقەکان

١٩ پێکدادانی هێزی جەندرمە و هێزەکانی دەوڵەت، تێکشکانی ڕاپەڕیوەکان و هەڵاتنیان لە شار، چوونی لاهووتی بەرەو جوڵفا.

ئێستا با ئەم تەئریخانە هەڵسەنگێنین:

ئا. مانگی دەلو، لەگەڵ مانگی ئێرانی "بەهمەن" هەر یەکە و یەکەم ڕۆژی مانگی بەهمەن یا دەلو، بەرانبەرە لەگەڵ ٢١ی مانگی جانیوەری، ١٢ی بەهمەنیش بریتیە لە یەکەمی فیبرەوەری و ١٩ی بەهمەن دەکاتە ٨ی فیبرەوەری.

ب. ساڵی ١٣٠٠ی هەتاوی بەرانبەرە لەگەڵ ٩ی مانگی ساڵی ١٩٢١ی و سێ مانگی سەرەتای ساڵی ١٩٢٢ی زایینی.

پ. یەکەمی جمادی السانی ١٣٤٠ مانگی، بەگوێرەی "تەقویمی وستفالد ـ ماهلێر، دەکاتە ٣٠/ ١/ ١٩٢٢ و ١١ی جمادی الثانی بەرانبەرە لەگەڵ ٩/ ٢/ ١٩٢٢.

سەرچاوەکانی بەردەست بە کورتی وا دەگەێننن کە ڕووداوی کودیتا یاخود ڕاپەڕین یا شۆڕشی سووری لاهووتی لە تەورێز، لەسەرەتای مانگی فیبریوەری ساڵی ١٩٢٢دا بووە و ماوەی ٩ ڕۆژی خایاندووە، گەرچی هەندێ جار قسە لە ١١ ڕۆژیش دەکرێت کە وا هەیە لە ڕۆژی یەکەمی سەرهەڵدان و گرتنی مێجەر پولادییەوە لە شەرەفخانە حیساب کرابێت و لەبەر ئەو ڕاستیەی کە ڕۆژی ٩/ ٢/ ١٩٢٢ هەتا شەو هەر شەڕ و بەریەرەکانی بەردەوام بووە بۆ سبەێنێ وا بووە کە خەڵك زانیویانە ڕاپەڕینەکە تێك شکاوە، واهەیە کۆتایی ڕاپەڕینەکە بە ١٠/ ٢ دانرابێت.

هەرچۆنێك بێت ئەو شەوە تاقمێك لە ڕاپەڕیوەکان هەڵدێن و هەندێکیان دەگیرێن یا خۆ بەدەستەوە دەدەن. لاهووتی لەگەڵ تاقمێکی هاوڕێیدا بەرەو سنووری سۆڤیەت و شاری جولفای ئێران دەڕۆن (جولفای سۆڤیەت لە باکووری ئاراسە). بەگوێرەی بیرەوەرییەکانی

مخبرالسلطنه، ناوبراو دوای شکانی راپەڕینی لاهووتی، بە سەفەر چووە بۆ سۆڤیەت. ڕۆژی ٢٦ی بەهمەن (١٥/ ٢/ ١٩٢٢) بە ڕێگەی جوڵفادا وەڕێ کەوتووە و کاتێ گەیشتۆتە "نەخجەوان"، پێیان گوتووە کە "لاهووتی و خەڵکەکەیمان خستۆتە قاوەخانەیەکەوە و مەئموورمان لەسەر داناون، لە دەوروبەری قەتارەکەش پیاومان داناوە...... کە تا دووسێ سەعاتی تر بە سلامەت لێرە بڕۆی"(هیدایەت، مخبرالسلطنه، ٣٣٥).

گەرچی هیدایەت تەئریخی گەیشتنە نەخجەوانی خۆی دیاری نەکردووە، بەڵام دەڵێ سەفەرەکەی ڕۆژی ١٥/ ٢/ ١٩٢٢ لە تەورێزەوە دەستی پێکردووە و ماوەی نێوان تەورێز و نەخجەوانیش بە قەتار، نابێ زیاد لە دووسێ ڕۆژێکی خایاندبێت. بەم پێیە ئەگەر مخبرالسلطنە لە دەوروبەری ١٧ تا ٢٠ی مانگی فیبرەوەری گەیشتبێتە نەخجەوان و لاهووتی و هاوڕێکانی ئەو ڕۆژە لەبەر خاتری ئاسایشی ئەو، لە شوێنێك ڕاگیرابێتن، لاهووتی دەبێ پێش ئەو ڕۆژانە واتە لەنێوان ١٠ هەتا ٢٠ ی فیبرەوەری ١٩٢٢ لە ئاوی ئاراس پەڕیبێتەوە. جا ئەگەر ئەو ڕاستیەش بگرینە بەر چاو کە لاهووتی لەو هەلاتنەدا گیانی لە مەترسیدا بووە و بە شەویش هەر ڕێگای بڕیوە، ئەوا دەبێ لە ڕۆژانی یەکەمی هەلاتنەکەیدا واتە لە ١١ و ١٢ ی مانگی فیبرەوەریدا پەڕیبێتەوە و ماوەیەك لە جوڵفا ڕایانگرتبێ ئینجا ناردبێتیانە نەخجەوان و لە ڕۆژی گەیشتنی مخبرالسلطنەدا لە نەخجەوان بووبێت.

### ژیانی لاهووتی لە یەکیەتی سۆڤیەتی:

فیبرەوەری ١٩٢٢ تا مارچی ١٩٥٧ دەکاتە سی و پێنج ساڵ و مانگێك. ئەوە ماوەی ژیانی لاهووتییە لە یەکیەتی سۆڤیەتی.

پێشتر لاهووتی ١٧ ساڵ لە کرماشان (١٩٠٤ ـ ١٨٨٧)و ١٣ ساڵ لە تاران و ڕەشت و ٥ ساڵێکیش لە خاکی عوسمانی ژیابوو. واتە لەسەرجەمی ٧٠ ساڵی ژیانیدا، نیوەی راستی لە سۆڤیەت ژیاوە و ئەو ماوەیەی بە شانازی و ڕێزەوە بردۆتە سەر، پلە و پایەی پێدراوە و نیشانی خەڵات کراوە، هەر بۆیەش لە هەموو ماوەی تەمەنیدا خاکی سۆڤیەتی بە "نیشتمانی دووهەم"ی خۆی داناوە. بەڵام ژیان لەو نیشتمانی دووهەمی هەرگیز نیشتمانی یەکەم واتە ئێران و کرماشانی لەبیر نەبردۆتەوە و ئەو چەند کەسەی وا لەوێ چاویان پێکەوتووە باسی ئارەزوومەندیی و هەستی قووڵی نۆستالژی بۆ دیتنی دووبارەی ئێران و کرماشان و گەڕەکی "ئاوشوران"ی دەکەن، شیعرەکانیشی نیشاندەری هەمان هەستی بە هێزن:

تنیده یاد تو در تار و پودم میهن! ای میهن !
بود لبریز از عشقت وجودم، میهن ای میهن!

**(شیعری "ای میهن!" ، مۆسکۆ ١٩٥٥ ، ل ٤٤ی دیوان)**

تو شمع جهانی، نتواند کشدت کس
ظلمت ز چنین قصه به هر انجمن افتد !

**(شیعری "به وطنم" ، مۆسکۆ، ژانویه ١٩٣٧، ل ٥١ی دیوان)**

ژیانی ئێران و ئەستەمووڵی لاهووتی هەرکام فیلمێکی دوور و درێژ و پڕ لە ڕووداون ـ ژیانێکی بەئازار و پڕئاشۆب، کە زۆربەی ئەمڕۆکە بۆ ئێمە ئاشکران، بەڵام لەمەڕ ژیانی سۆڤیەتی، زانیاریی کەممان بەدەستەوەیە و مەعلووماتی بەربڵاو گردوکۆ نەکراون و بەگشتی، تەنیا سەردێڕی مەسەلەکان دیارن، واتە دەزانرێ لە تاجیکستان ژیاوە و تا پلەی وەزیر (یاخود یاریدەدەری وەزیر)ی کولتووری کۆماری تازە

دامەزراوی سۆڤیەتی لە تاجیکستان ڕۆیشتوە، سەرۆکی یەکیەتی نووسەرانی تاجیکستان و بەگوێرەی دوو ریوایەت، جێگری سەرۆکی یەکیەتی نووسەرانی سۆڤیەت واتە یاریدەدەری ماکسیم گورگی بووە (سوڵتانی، محمد عەلی، ١٩٩٩، ١، ٢١٥؛ تەبەری، ئیحسان، ١٩٨٨، ٩٧)، خەلاتی لێنینی لە دەست ستالین وەرگرتوە و پاش ماوەیەك لەبەر هۆگەلێکی بۆ ئێمە نادیار، کە گرنگە دواتر روون بکرێنەوە کەوتۆتە بەر چاوەدێریی پۆلیسی ستالینی و، ساڵی ١٩٥٧ واتە چوار ساڵێك دوای مردنی ستالینیش کۆچی دوایی کردووە. جگە لەو سەرخەتە گشتییانە، من هەوڵ دەدەم بە یارمەتی سەرچاوەکان وێنەیەك لە ژیانی لاهووتی لە سۆڤیەت بکێشمەوە و ئەوەندەی لە کرین بێت، باروودۆخی ئەو ساڵانە روون بکەمەوە.

لە ژیننامەکەیدا، لاهووتی ئەم خاڵانە لەمەڕ ژیانی سەردەمی سۆڤیەتی خۆی دەردەخات:

"لە ساڵی ١٩٢٣دا گەیشتمە مۆسکۆ و وەك پیت چین لە "چاپخانەی ناوەندیی گەل" دەستم بە ئیش‌وکار کرد. گەلێك زوو کتێبی شیعرەکانم، کە هەر خۆیشم پیتەکانیم چنیبوون، لەچاپ هاتەدەر. دواتر لە هەمان چاپخانەدا بووم بە کرێکاری ئەدەبی و لەوێ لە ڕۆژێکی لەبیرنەچووی ساڵی ١٩٢٤دا بە ئەندامیەتی حزبی کۆمۆنیست وەرگیرام... کاتێ بیستم لە تاجیکستان.... کۆماری سۆڤیەتی دامەزراوە، چوومە ئەوێ و دەستم بە ئیش‌وکار کرد.... لەم ساڵانەی دواییدا، وا هاتوومەتەوە مۆسکۆ و لێرە دەژیم. بە بەر نووسینی شیعرەوە..... خەریکی وەرگێڕانی شیعر و نووسراوەی

پوشکین، گورکی، مایاکۆفسکی و شاعیرانی هاوچەرخی سۆڤیەتم..... راوێژکاری هەمیشەییم لە کاری ئەو تەرجەمانەدا.... "سیسیلی بانو"ی هاوسەر و هاوکارمە.... ئەو چوار منداڵەش کە هەمانن هیچ بەرگرییەکی ئیش‌وکارمان ناکەن". (سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ١).

ئەم وتارە سەرەتا ساڵی ١٩٥٤ لە گۆڤارێکی رووسیدا بڵاوبۆتەوە کە دەکاتە ساڵێك دوای مردنی ستالین. دەزانین کە بە مردنی ستالین، لاهووتی لە چاوەدێری پۆلیس رزگاری هات و سەرلەنوێ لە حزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتدا رێزی لێ گیرایەوە.

ئوتۆبیۆگرافییەکەی لاهووتی وای دەردەخات کە دوای گەیشتنە خاکی سۆڤیەت، بۆ ماوەی ساڵێك هەر لە دەوروبەری نەخجەوان و ئازەربایجان ـ واتە نزیك سنووری ئێران مابێتەوە و، سەرچاوەیەکی تریش ئەم راستیە پەسند دەکات و دەڵێ لەو ماوەیەدا لاهووتی و هاورێیانی لەسەر سنووری ئێران "بە چەکداری"مانەوە و بە تەمای گەرانەوە بۆ ئێران و درێژەی کاری چەکدارانە بوون (بەشیری، ئەحمەد، نەوە دووپێچ).

بەشیری لەمەڕ ژیانی ئەو سەردەمەی لاهووتی دەڵێ: "دواتر "بێ‌هیوا بوون و چەکەکانیان داناو لە "باکۆ" لە هێمنایەتیدا دەژیان.... پاشان لاهووتی چوو بۆ نەخجەوان و لەبەر ئەوەی لە ماوەی ژیانی ئەستەموولدا بووبوو بە کۆمۆنیست، لەوێ دیعایەی کۆمۆنیستی دەکرد، تا ئەوەی کە ئیمامی جەماعەتی نەخجەوان "تکفیری" کرد، ئەویش گەرایەوە بۆ باکۆ. سەبارەت بە ئیمامی مزگەوتی نەخجەوان، لاهووتی چەند شیعری گوتوە و لەوانە:

شیر از دست من آواره بد و اکنون شیخ
خکم کفرم بدهد، ســخره‌ء میمون شده‌ام !

**(شیعری "دیوانگی"، ۱۹۲٤، ل ۹۲۵ی دیوان).**

تازه بر کفرم امام شــــهر فـتوی داده است
بخت بد بنگر که این مردار هم با من بداست!

**(شیعری "دشمن کام"، نه‌خجه‌وان، فیبریوه‌ری ۱۹۲۲، ل ۸۰ی دیوان) (به‌شیری،ئه‌حمه‌د، نه‌وه‌دوپێنج).**

**بۆچوونه‌کانی به‌شیری هه‌ندێ جار هه‌ڵه‌یان پێوه دیاره. لێره‌دا ته‌ئریخی فیبره‌وه‌ری ۱۹۲۲ وا نیشان ده‌دات که شیعره‌که هه‌ر دوابه‌دوای گه‌یشتنه نه‌خجه‌وان گوترابێت. دیاره وێچوو نییه که له ماوه‌ی ئه‌و چه‌ند رۆژه که‌مه‌دا له‌گه‌ڵ هاورێکانی چووبێته باکۆو گه‌ڕابێته‌وه نه‌خجه‌وان.**

**له درێژه‌دا، به‌شیری ده‌ڵێ: لاهووتی له مانگی ئوردیبه‌هیشتی ۱۳۰۱ (مه‌ی و جوونی ۱۹۲۲) واته سێ مانگێك دوای گه‌یشتنه سۆڤیه‌ت، یه‌ك له هاورێیانی وه‌فاداری خۆی به ناوی ره‌حیم کوڕی ره‌زای به کوێره‌ڕێدا ناردۆته شاری "خۆی" له ئێران، بۆ ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ خه‌ڵکی ئه‌وێ و شوێنه‌کانی تری ئازه‌ربایجاندا قسه بکات و بۆ یارمه‌تی له‌مه‌ڕ کودێتایه‌کی نوێ ئاماده‌یان بکات (به‌شیری ، ئه‌حمه‌د، هه‌مان لاپه‌ره).**

**پێش هه‌مووشت، دیاره ئه‌گه‌ر کارێکی ئه‌وتۆ کرابێت، به‌بێ ئیجازه‌ی حکوومه‌تی سۆڤیه‌تی نه‌بوه. به‌ڵام هه‌واڵه‌که، پرسیارێکی تر دروست ده‌کات: لاهووتی ئه‌و هاورێیه‌ی خۆی نارده لای کێ له شاری "خۆی"؟ ئایا جگه له سمکۆ کێی تر له خۆی هه‌بوو لاهووتی په‌یامی بۆ بنێرێت و هیوای کودێتا یاخود شۆڕشی پێببه‌ستێت ؟ ئایا**

پێوەندیی بە سمكۆوە نەكرد ؟ سمكۆ لەو ماوەیەدا لە "چهریق"ی نزیك شاری سەڵماس و خۆی بوو و تا هاوینی هەمان ساڵیش هەر لەوێ مابووەوە (معتمدالوزارە، رحمت الله خان، ٥٤٣).

ئەم پێوەندییانەی لاهووتی و سمكۆ زیهنی منی داگرتووە و گەرای بیركردنەوە لە بارودۆخی ئەو سەردەمەی لە مێشكمدا چاندووە:

هەردوو كەسایەتی واتە سمكۆ و لاهووتی، دوژمنی ڕەزاخان و لایەنگری دامەزرانی حكوومەتێكی دێموكرات لە تاران و لایەنگری ڕاپەڕینی خیابانی لە تەورێز بوون. معتمدالوزارە لە باسی "ارشد الملك"دا دەنووسێ: دوای ئەوەی چوو بۆ "چەهریق" و لای سمایل ئاغا، هاتە ورمێ و لە كۆبوونەوەیەكدا كە منیش لەوێ بووم گوتی: "چوومە چەهریق، چاوم بە سمایل ئاغا كەوت. ناوبراو هاوكاریی تەواو لەگەڵ فیرقەی دێموكرات [ی خیابانی] دەكات و دەڵێ دەبێ تۆڵەی شەهیدبوونی خیابانی لە مخبرالسلطنە بكرێتەوە..." (معتمد الوزارە، ڕەحمت الله خان، ٣٨٩). پێوەندی لایەنگری خیابانی و سمكۆ لەلایەن "كەسرەوی"شەوە تەئیید كراوە (كەسرەوی، ئەحمەد، ١٩٩٢، ٨٩٥).

جگە لەوە، هەردوولا پێوەندیان بە شۆڕشی جەنگەڵەوە هەبوە. لاهووتی كە، خۆی زووتر دۆست و هاو كاری كوچك خان و احسان اللەخان بوو و دوابەدوای بیستنی هەواڵی هەڵگیرسانەوەی شەڕی ئەوانیش بوو، كە گەڕایەوە ئێران (سەبارەت بە خۆم، پاشكۆی١) .

لەمەڕ پێوەندی سمكۆ و كوچك خانیش بەڵگەیەك هەیە: كاك عەلی حەسەنیانی (هاوار) دەیگێڕێتەوە چۆن چاوی بە كابرایەكی پیری خەڵكی گێلانی ئێران كەوتووە كە گوتوویە من تەتەری كوچك خان بووم بۆ لای سمایل ئاغا (حەسەنیانی، عەلی (هاوار)، ١٩٨٥، ٢٣).

بەم گەڕانەوەیەم بۆ دواوە دەمەوێ پەسندێکی دیکە لەمەڕ پێوەندی لاهووتی و سمکۆ و هۆیەکی دیکە بۆ شەڕ نەکردنی لاهووتی لەگەڵ سمکۆ بخەمە بەر چاوی خوێنەر. بەداخەوە ئەو هێزە بەربڵاوانەی ئۆپۆزیسیۆنی ڕەزاشا نەیانتوانی یەك بگرن و ڕەزاخان یەکەیەکە هەمووی لەناو بردن.

هەر چۆنێك بێت، لاهووتی لە ساڵی ١٩٢٣دا سەر لە مۆسکۆ دەردهێنێ و دوای هەندێ کاری چاپخانە و شتی ئەوتۆ، شیعرەکانی بڵاو دەبنەوە و بە تایبەت پاش وەرگێڕانی بە ئەندامیەتی حزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت، دەبێتە ناسیاوی کۆڕ و کۆمەڵی ئەدەبی و پلەو پاپەی دەچێتە سەرێ. دوای دامەزرانی کۆماری سوسیالیستی تاجیکستان، دەچێتە دووشەنبەی پێتەخت (کە دواتر بوو بە "ستالین ئاوا" و لە ساڵی نەوەدەی سەدەی پێشوودا، سەر لە نوێ کرایەوە دووشەنبە). لەوێ دەگاتە پلەی بەرزی ئەدەبی ـ زانستی و دەکرێتە کومیساریا (وەزیر) یاخود جێگری کومیسارییای فەرهەنگی تاجیکستان بەڵام دواتر دەگەڕێتەوە مۆسکۆ ئەو شوێنەی کە هەتا مردن لێی ژیا.

لەمەڕ سەردەمی ژیانی سۆڤیەتی لاهووتی سەرچاوەی کەمتر لەبەردەستی مندایە. کۆمەڵەی شیعرەکانی گەلێك جار لەوێ چاپ بوونەتەوە بەڵام لەمەڕ ژیانی ڕۆژانەی زانیاریمان زۆر نین، سەرەڕای ئەوەش، دوور و نزیك ئەم شتانەی خوارەوەی لێ دەزانین:

(١)ژیانی لاهووتی لەم سەردەمەدا تێکەڵاوێك بووە لە ئەرکی سیاسی ـ حزبی و کاری کولتووری. لە بواری یەکەمدا وەك خاوەن

بڕوایەکی ساڵانی سەرەتای دامەزرانی حکوومەتی سۆسیالیستی لە یەکیەتی سۆڤیەت، تین و گوڕێکی زۆری هەبوە و هیوایەکی لە بن نەهاتووی بە دواڕۆژی پڕ لە بەختەوەریی زەحمەتکێشانە و کات و ساتی خۆی تەرخانی تێکۆشانی سیاسی کردووە. بەڵام وەك لە شیعرەکانیشی دەردەکەوێ، بە چاویلکەیەکی تایبەت روانیویەتە دیاردەکان و "سوسیالیزمی مەوجوود"ی بە نیهایەت و کۆتایی ڕێگە داناوە و هەرگیز بیری لە گۆڕان و وەرچەرخان و فەوتانی سیستەمەکە نەکردۆتەوە یاخود تەنانەت ئیحتیمالی هەڵە و پەڵەی بە سیاسەتەکانی ڕێبەرانی حزبی نەداوە. بۆ نموونە، روانینی بە نیسبەت مەسەلەی "مالیکیەت"ی شەخسی و ئایین و کێشەی نەتەوایەتی، روانینێکی جیگەی سەرنجە.

ئەو دروشمانەی وا لاهووتی دژ بە ئایین هەڵیگرتبوون، دواتر لەسەردەمی گورباچۆف و رووخانی سیستەمی سوسیالیستیدا دەرکەوت چەندە توندوتیژ و پڕ لە زێدەڕۆیی بوون. جووی سۆڤیەتی پێشوو هەر ئەوەندەی دەروازەی وڵات کرایەوە رژانە ئیسرائیل ـ ئەو وڵاتەی وا لەسەر ئەساسی سیاسەتی سەهیۆنیستی دامەزرابوو ـ سەهیۆنیسمیش بە گوێرەی پەسندی نەتەوە یەککرتووەکان شێوازێکی عونسورییەت بوو. چیچەنەکانی سۆڤیەت دواتر لە هەڵوێست گرتنی ئیسلامیەتدا لە مەلاکانی قوم و حیجاز، پێش کەوتن! خۆمەسیحیە ئۆرتۆدۆکسەکانیش لە جێی خۆیان بووەستن.

شەڕی نەتەوەیی و تێك گیران و پێکدا هەڵپڕژانی گەلانی یەکیەتی سۆڤیەت وەك لایەنێکی سەلبی تر دوا بە دوای شل بوونەوە و لاوازبوونی دەسەڵاتی سوپایی ـ پۆلیسی سۆڤیەت، سەری هەڵدا ـ کە

شەڕی خوێناوی نێوان ئەرمەنی و ئازەری تەنیا یەکیان بوو. ئارەزوو و ئاواتی بێ خەوشی لاهووتی و سەدان هەزار خەڵکی تر لە سۆڤیەت و دەرەوەی، بە داخەوە درەنگتر بە هۆی سیاسەتی هەڵەی ستالینیەوە بوو بە بڵقی سەر ئاو و توایەوە. لەو بارودۆخە نا لەبارە و لەو سیستەمە پۆلیسییەی ستالیندا، پلە و پایەی لاهووتی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ چوە سەرێ. مامۆستای قوتابخانە و کرێکاری چاپخانە بوو بە مەئمووری سەر سنووری سۆڤیەت وچین،

بەشداریی کۆنگرەی ئینترناسۆناڵی ساڵی ١٩٣٥ی پاریس و کۆنگرەی "داکۆکی لە شار ستانیەت"ی لە هەمان شار کرد، بوو بە سەرۆکی ئاکادێمیای تاجیکستان و بەر پرسی تەشریفات و میوانداریی کردنی میوانانی حزبی کۆمۆنیست لە موسکۆ، میداڵیای لێنینی لەلایەن ستالینەوە خەڵات کرا و بە کورتی گەیشتە شوێنێك کە کەمتر بێگانەیەك دەیتوانی لە کۆمەڵگای سۆڤیەتدا پێی بگات. ئاشکرایە گەیشتن بەو پلە و پایانە لە سەدەمی دیکتاتۆریەتی ستالین دا، بە هاسان نەهاتۆتە دەست مەگەر لاهووتی لە بەشێکی ئەو کوشت و بڕ و جینایەتانەی حکوومەت دا هاوکاری و هاودەستی کردبێ و ئەوەش لە ڕۆحی ساکار و یەك لابینی لاهووتی بە دوور نییە.

ئەوەی لە ژیانی سیاسی لاهووتی دا جێی سەرنجە، سایکۆلۆجی مرۆڤێکی ساکاری خاوەن بڕوای ڕۆژهەلاتییە کە هیچ ڕەنگێك جگە لە ڕەش و سپی ناناسێ، جیهانی دەورووبەری بەسەر خێرو شەڕ و چاك و خراپدا دابەش کراوە و لەنێوان ئەو دوو جەمسەرەدا، دیوارێکی کۆنگرێتی لەبن نەهاتوو کێشراوە کە هەموو خەڵکی ئەم جیهانە لە دوو

دیوی دیوارەکە وەستاون و دەرەتانی تێپەڕ کردنی سنوور یان بۆ نییە. روانین لە پشت چاویلکەیەکی یەك لابینی وەهاوە، خاوەنەکەی بەرەوجەزمییەتێك دەبات کە تێیدا حەق و ناحەق مۆتڵەق دەکرێتەوە ئەو دوو دیاردەیە، دەکەونە گۆڕەپانی شەڕێکی ئەزەلی و ئەبەدییەوە و سەرکەوتنی هەرکامیان دەبەسترێتەوە بە فەوتان و نەمانی ئەوەی تریانەوە. لایەنگرانی "حەق" لە بۆ چوونێکی نادێموکراتیانەی ئەوتۆدا، مافی ئەوەیان پێ دەدرێ رەخنە گر و ناحەزی خۆیان بە نەتەویست بدەنە قەڵەم و "ناحەق" موتڵەق بکەنەوە. ئینجا کاتێ کە فەرمانی بەر بەرەکانێ کردنی ناحەز دەرچوو، هەوڵی فەوتاندن و لەناوچوونی بدەن.

ئەم "دۆگم"ـە، لە درێژەی رێگادا، دەگاتە ئەنجامی سەر سپاردەیی و ئیتاعەتی لایەنگرانی "حەق" لە هەر رێبەرێکی فیکریی کە ئاڵای ئایدیۆلۆجیکی "حەق"ی هەڵگرتبێ و بتوانێ خۆی لە شێوەی گەوهەری بیری "حەق"دا بنوێنێ. لاهووتی وەك هەزاران و ملیۆنەها ئینسانی سەردەمی خۆی، چرای رێنوێنی "بیری پرۆلیتاریی" بە دەست ستالینەوە دەبینی و بەو هاسانییەی کە لەسەردەمی لاوییدا، ستایشی ریشی پانی "حەیرانعەلیشا"ی دەکرد لە رۆژانی پیریشدا سەری ئیتاعەی بۆ سمێڵی با بڕی ستالین دانەواند. لە راستیشدا جیاوازییەکی فەلسەفی لەنێوان دەروێشایەتی ئەو ومووریدایەتی ئەم دا نییە. هەر ئەوەندەی گەرای سەر سپاردەیی لە مێشکی کەسێکدا گوروا، ئیتر رێگە بۆ ئیتاعە و سەر دانەواندن خۆش دەبێ و تێپەڕ کردنی سنوور لە ئایدیۆلۆجییەکی ئایینیەوە بۆ بیرۆکەیەکی سیاسیش

شتێکی نەگونجاو نابێت ـ وەك بۆ لاهووتیش وا نەبوو! ئەوە دەردی کۆمەڵگای یەك لابینی ڕۆژهەڵاتییە و دەردی لاهووتیش هەر ئەوە بوو. تەنیا لە روانگەیەکی ئەوتۆوەش دەتوانرێ سەری هەودای ئاڵۆزی ژیانی لاهووتی بدۆزرێتەوە و کورە لاوی کۆڵانەکانی کرماشان لە دووکانی پینەچییەتی "ئیلهامی"یەوە، ببرێتە ئاڵقەی دەروێشان و ریزی جەندرمە و مەتەرێزی مەشرووتە و شۆڕشی تەورێز و وەزارەتی تاجیکستان، ئینجا لە گۆڕستانی ناودارانی مۆسکۆ تەسلیمی خاك بکرێت.

(٢) وەك گوتمان، باوەکوو لە ماوەی ژیانی سۆڤیەتدا پێوەندی فیزیکی لاهووتی لەگەڵ ئێران پچڕا بوو، بەڵام دڵ و گیانی هەر لەوێ بوو و وەك بولبوولێکی دوورە گوڵ شیعری بۆ ئێران دەچڕی. هەر ئەوەش ترسی وەبەر ڕۆژێمی شا نابوو و لە نفووزی مەعنەوی کەسایەتی لاهووتی و تەئسیری شیعرەکانی لەناو کۆمەڵانی گەل بە تایبەت زەحمەتکێشانی ئێران دەترسا. هەر بۆیەش قەڵەم فرۆش و ڕۆژنامە نووسانی بەکرێگیراوی ڕۆژێمی شا ـ وەك عباس شاهەندەی مودیری ڕۆژنامەی "فەرمان"، بە هەرموو شێوەیەك خەریکی سووك کردن و بەدناو کردنی لاهووتی بوون. "فەرمان" لە ژمارە ٥٤٥ ی ڕۆژی ١٧/ ٧/ ١٣٣٢ (واتە دوای کودیتای ٢٨ی گەلاوێژ) و بەرانبەر لەگەڵ ٩/ ١٠/ ١٩٥٣ دا رایگەیاند کە لاهووتی لە سۆڤیەت هەڵاتوە و چۆتە وڵاتێك [کە دواتر گوتیان پاکستانە] (بەشیری، ئەحمەد، سەد و یەك).

هاوکات لەگەڵ ئەو پڕوپاگەندە سەراپا درۆ و تەزویرە، لە پڕ کتێبێك بە ناوی "شرح زندگانی من" لە ئێران بڵاو بووەوە و من خۆم لە بیرمە لە بۆکانیش وەك شارەکانی تر، بە بەلاش دەیاندا بە

قوتابییەکان . کتێبەکە هەندێ زانیاری ڕاستی تێکەڵاو بە زۆرێك هەواڵی ناراست و بێ بنەما لەمەڕ بیروبۆچوون و ژیانی لاهووتی کرد بوو. تەنانەت لاپەڕەیەکیان بە شێوە خەتێك نووسیبوو ـ کە وەك دەستخەتی لاهووتی دەچوو و لەوێدا لاهووتی لە خودا پارابووە لە گوناهی خۆش بێت! هەر زوو زانرا کە کتێبەکە دەسکردە و دەستی ڕژێمی ئێرانی لە پشتە. لاهووتی هاتە سەر ڕادیۆی مۆسکۆ بەشی فارسی و بەرپەرچی درۆکانی ڕژێمی دایەوە. لە قسەکانیدا، دەری خست کە لە مۆسکۆ دەژی و هەڵنەهاتووە و نووسینی کتێبەکەش (واتە شرح زندگانی من) لەلایەن ئەوەوە نەبوە. دواتر لە ساڵی ١٩٥٤دا لاهووتی شیعرێکی بڵاو کردەوە بە ناوی "لە وەڵامی فریوکاراند"، کە وەڵامی ئەو درۆ و دەلەسە و ساختەیەی ڕژێمی شا بوو. لە شیعرەکەدا لاهووتی دەڵێ: "چۆن من لە وڵاتی شۆڕا هەڵدێم کە دوو سەد میلۆن برام تێیدا دەژین، من لە دەست نامەردانی وەك ئێوە ئێرانم بە جێ هێشت، ئەی چوار منداڵی خۆشەویست و دایکی منداڵەکانم بۆ چی بە جێ دەهێڵم؟ " (شیعری "پاسخ بە اغواگران، مۆسکۆ ١٩٥٤، ل٥١٤ی دیوان). ئەم شیعرە، مامۆستا حەسەنی قزڵجی وەریگێڕاوەتە سەر کوردی، کە دواتر باسی لێوە دەکەم. ڕژێمی شا، درەنگتر دەستی لەو دیعایە درۆیانە هەڵگرت و مەسەلەی کتێبە تەزویر کراوەکە واتە "شرح زندگانی من"یش کەم و زۆر لە بیر چوەوە، کە ئەودەم، لای ڕووناکبیرانی ئێرانی وا بوو "علی جواهر کلام" نووسیویەتی و حکوومەت نیزامی بەختیاریش چاپی کردووە. تا ئەوەی ساڵی ١٩٨٩دا، لە بەشی "ڕانانی کتێب" لە گۆڤاری "ئەنجومەنی توێژینەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست"،

The Middle East Studies Assocatnihim, Bu11etion, 7510 23/N.Z

رەخنەیەك بە زمانی ئینگلیزی لەسەر کتێبی "یەکیەتیە کرێکارییەکان، یاساو بارووداۆخ لە ئێران"، نووسینی ویلیام فلۆر چاپ کرا، کە "خوسرەو شاکری" لە زانستگەی هاواری ئەمریکا، نووسیبووی و تێیدا رەخنەی لە فلۆر گرتبوو کە بۆچی هەندێ لەو مەعلووماتەی وا داویە بە دستەوە پشتی بە کتێبێکی ساختە و دروستکراو بەستوە؟ (نیازی شاکری هەمان کتێبی "شرح زندگانی من"ە). ئینجا نووسیبووی: "ئێمە دەزانین کە

١. "شرح زندگانی من"، لە شوێنێکی نادیاری پاکستان لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٥٣ و لە ماوەی شەڕی دژی کۆمۆنیستی رێکخراوەی "سیا" دژ بە حزبی توودە نووسرا. ئێمە دەزانین کە لاهووتی هەرگیز سۆڤیەتی بە جێ نەهێشت، دەشزانین بە بیرو بۆچوونی ستالینی وەفادار مایەوە و وەك ستالینییەکی دەمارگیر کۆچی دوایی کرد....

٢. لەو ساڵانەدا ناوەندێکی "سیا" بۆ پڕوپاگەندەی دژی کۆمۆنیستی لە پاکستان هەبوو کە لەوێوە زۆربەی ئەو پڕوپاگەندەیەی وا لە ئێران دەیانکرد، بەرهەم دەهێنرا. لێرەوە دەگەینە ئاکامی ئەوەی کە بیرەوەرییەکانی لاهووتی غەیرە ئێرانییەك نووسیویە کە پسپۆڕی کاروباری سۆڤیەت و ئێران بووە و ئەوەش لە ساڵانی ١٩٤٠ و سەرەتای پەنجاکاندا بووە. کتێبەکە، بێگومان لەلایەن سرویسی TBEDDMNی سیاوە تەزویر کراوە".

لە پەراوێزی لاپەڕەکەشدا شاکری دەنووسێ: "هەندێ کەس گومانیان وایە نووسەری کتێبەکە، Donald بووبێت و هەندێکی تر دەڵێن وا هەیە G .Lanczowski بووبێت" (شاکری، خسرو).

کتێبی "شرح زندگانی من" زانیارییەکی زۆری لەسەر ژیانی لاهووتی لەسەردەمی ئێران وسۆڤیەتدا داوە بە دەستەوە، بەڵام بە هۆی نادروستی و تەزویر کرانەوە، من لێرەدا هیچ کەڵکێکی لیٚ وەرناگرم و تەنیا بە پێویستم زانی ئاماژە بە بوونی کتێبەکە و چۆنیەتی دروست کرانی بکەم.

جگە لە خەڵکانی سۆڤیەت، ئەوانەی وا لەو ساڵانەدا چاویان بە لاهووتی کەوتبیٚ و لە بیرەوەری خۆیاندا باسیان لێوە کردبێت، یەکەم ئەو ئێرانییانەن وا لە ئەنجامی راونانی حکوومەتی ئێراندا هەڵاتبوونە سۆڤیەت، دووهەمیش ئەو ئێرانییانەی وا بە سەفەر چووبوونە ئەویٚ و چاویان پێی کەوتبوو ئینجا گەڕابوونەوە وڵات. تاقمی یەکەم بە گشتی باڵی چەپ و ئەندامانی باڵای حزبی توودەی ئێرانن و لەوانە، مامۆستا مەلا حەسەنی قزڵجی وتارێکی کورتی لەسەر لاهووتی نووسیوە و شیعرێکی لیٚ وەرگێڕاوەتە سەر کوردی کە من لە کۆتایی کتێبەکەدا وەك پاشکۆیەك بڵاوی دەکەمەوە. ئیحسان تەبەری، ئیرەج ئەسکەندەری، نورالدین کەیانووری و هەندیٚ ئەندامی سەرکردایەتی حزبی توودەی ئێرانیش هەر لەو تاقمەن و من دواتر باسی بۆچوونەکانیان دەکەم.

لە تاقمی دووهەمیش، یەکیان سەعیدی نەفیسی نووسەری بەناوبانگی ئێرانییەکە دووجار لە ساڵانی ١٩٣٢ و ١٩٣٦دا چۆتە سۆڤیەت و لە مۆسکۆ چاوی بە لاهووتی کەوتووە. باسی ئەم دوو سەفەرە و هەڵسەنگانەکانی لەمەڕ لاهووتی لێرە و هەروەها لە بەشی شیعری لاهووتیدا شی دەکەمەوە و دەقی وتارەکەشی کە پێشتر وەرمگێڕاوەتە سەر کوردی و بڵاوم کردۆتەوە،

دەکەمە پاشکۆی ئەم دێڕانە. هەروەها "ئەنوەری خامەیی" کە سەرەتا ئەندامی حزبی توودەی ئێران بووە و پاشان لێیان جیابۆتەوە و هەڵوێستێکی توندی دژ بە حزبەکە گرتوە، لە بیرەوەرییەکانیدا باس لە لاهووتی دەکات و من بۆچوونی ئەویش لێرەدا دەهێنمەوە. سەبارەت بە ئیحسان تەبەری زانا و فەیلەسووف ئێرانی و ئەندامی باڵای حزبی توودە دەبێ بڵێم تەبەری لە هەندێ شوێنی جیاجیا و یەك لەوان، لە"کەژ ڕاهە"دا لە لاهووتی دەدوێت. من هەوڵ دەدەم بۆچوونەکانی ئەویش لەمەڕ لاهووتی لەم کتێبەدا ڕەنگ بدەنەوە بەڵام لەبەر ئەوەی "کەژ ڕاهە"،دوای گیران و رووخانی نووسەرەکەی، لە زیندانی کۆماری ئیسلامی نووسراوە یا نووسێنراوە، ئەو بەشانەشی بە پارێزی زۆرەوە وەردەگرم و لام وایە خوێنەرەیش لەگەڵمدابێت بۆ ئەوەی بڵێم ئەگەر ڕاگەیاندنی هەواڵەکان لەلایەن تەبەرییەوە کەم و زۆر ڕاستیەکی تێدا بێت، هەڵسەنگاندن و بۆچوونەکانی بە بێ سێ و دوو هەمووی لەژێر چاوە دێریی توندوتیژی "ئیتلاعات"ی سوپای پاسدارانی کۆماری ئیسلامی ئێراندا دەربڕیوە و بەم بۆنەیەوە جێگەی قەبووڵ و باوەڕنین واتە "کەژ ڕاهە"ی تەبەری جیاوازییەکی "کەیفی" لەگەڵ "شرح حال من"ی سیا و حکوومەت نیزامی بەختیار نییە. مێژوو گەلێ جار دووپات دەبێتەوە، گەرچی لە بیچمی جیاوازیشدا بێت!

## وتاری حەسەنی قزڵجی:

ئەم وتارە بە ناوی "لاهووتی شاعیری بەناوبانگی کورد" لە ژمارەی یەکەمی ساڵی سێهەم، تشرینی دووهەمی ساڵی ۱۹۵۹ی گۆڤاری هیوا، چاپی یانەی سەرکەوتن لە بەغدا بڵاو بۆتەوە و کاك خوسرەو پیربال

جارێکی تر لە گۆڤاری هاوار، چاپی ئاڵمان، ژمارە ١٤ی ساڵی ٢٠٠٣دا چاپی کردۆتەوە (قزڵجی، حەسەن، ١٩٥٩)و لەسەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٤یشدا، جارێکی تر وەك بەشێك لە کتێبی"سەرجەمی بەرهەمی حەسەنی قزڵجی" بڵاو کراوەتەوە (قزڵجی، حەسەن، ٢٠٠٤).

گرنگی کاری قزڵجی، یەکەم لەوەدایە کە لاهووتی بە "شاعیری کورد" ناودێر کردووە نەك فارس و دووهەم ئەو پارچە شیعرەی وەرگێڕاوەتە سەر کوردی وا پێشتر گوتمان لاهووتی بۆ وەڵامدانەوەی دیعایەی هەڵاتنی خۆی لە سۆڤیەت و چاپی کتێبە تەزویرەکە، هۆندبوویەوە. من ئەم وتارەی مامۆستا بە تەرجەمەی شیعرەکەوە دەخەمە بەشی پاشکۆ (ژمارە ٦) بەڵام پێشتر دەبێ دەست نیشانی یەك دوو خاڵ لەمەڕ بۆچوونەکانی سەبارەت بە لاهووتی بکەم. قزڵجی ساڵی ١٨٨٥ی بۆ لە دایکبوونی لاهووتی داناوە و من خۆیشم لە "هێلکەی دۆڕاو"دا ئەم کارەم کردبوو، بەڵام "اجماع" لەسەر ئەوەیە کە لاهووتی لە ساڵی ١٨٨٧دا هاتبێتە دنیاو ئەم تەئریخەی دووهەم کەم و زۆر لەلایەن نووسەرانی ژیاننامەی لاهووتییەوە چەسپاوە. هەروەها قزڵجی "ئیلهامی" باوکی لاهووتی بە خاوەنی موڵکێکی زۆر لە باکووری کرماشان دەزانێت کە نازانم ئەو زانیارییەی لە کوێ هێناوە ؟ ئەوەندەی زانرابێت ئیلهامی پینەچی یاخود کەوشفرۆش بووە و هیچ وێناچێ کەوشدروو یا کەوشفرۆشێکی غەیرە کرماشانی (گوتمان لە "ئیسفەهان" و تویسرکان"ەوە هاتبووە کرماشان)، بتوانێ "موڵکێکی زۆر" پێکەوە بنێت، ئەویش لە باکووری کرماشان بەرەو کوردستان گەرچی نەگونجاویش هەر نییە. قزڵجی باسی "خەم و خەفەتی

لەناوچوونی دارایی" لاهووتی دەکات و ئەوەش نازانم لە کام سەرچاوە وەرگیراوە و مامۆستا کام "دارایی" دەدوێت ؟

دڵنیام ئەم زانیارییانە لەسەرچاوەیەکی سۆڤیەتی وەرگیراون، بەڵام بە داخەوە نازانم کام ؟ قزڵجی هەروەها تاوانی کوشتنی یەك لەژێردەستەکانی دەداتە پاڵ لاهووتی. ئەو باسە لەسەرچاوە ئێرانییەکان و یەك لەوان کتێبی "کودتای لاهووتی" نووسینی "کاوە بیات"دا هاتووە، ناوی کەسەکەش بە "ئەبولفەزل" براوە. بەڵام لە هیچ سەرچاوەیەکدا وا بە راشکاوی نەگوتراوە لاهووتی کەسەکەی کوشتبێت، بەڵکوو گوتوویانە تاوانی قەتڵەکەی دراوەتە پاڵ. قزڵجی هەروەها دەڵێ بەشوێن کوشتنەکەدا، لاهووتی براوەتە تاران و گیراوە. ئەوە بە تەواوەتی هەڵەیە. راستیەکەی ئەوەیە بەشوێن کێشەی کوژرانی " ئەبولفەزل"دا وەفدێکی سێ کەسی لە تارانەوە چوون بۆ قوم، کە وەك پێشتر گوترا، یەکیان سویدی و دوویان ئێرانی بوون، ئەوانیش لە رێگا کوژران و لاهووتی بەوە تاوانبار کرا کە دەستی لە کوشتنیاندا هەبوە، جا بە بیانووی خەڵاتکردنەوە داوایان لێ کرد بچێتە تاران، بەڵام لاهووتی هەرچییەی لە مەسەلەکە دەزانی، نەچوو و بە پێچەوانە، هەڵات و سەری لە سلێمانی و ئەستەموولْ دەرهێنا.

مامۆستا تووشی هەڵەیەکی تریش هاتووە بەوەی دەڵێ لە ساڵی ١٩٢١دا گەڕاوەتەوە تاران. ئەوەی راستی بێت ئەو گەڕانەوەیەی ساڵی ١٩٢١ هەمان چوونیەتی لە ئەستەمووڵەوە بۆ رەواندز و لەوێوە بە مەنگوڕایەتیدا بۆ سابلاغ و دوای بەجێهێشتنی مەلیك زادە لە سابلاغ، بۆ تەورێز. لە تەورێزەوە لاهووتی نێرراوەتە شەرەفخانە کە دەزانین بە

شوێنیدا "شۆڕشی سوور"ی تەورێز لە مانگی فیبریوەری ساڵی ١٩٢٢ سەری هەڵدا و، لە ئەنجامی تێکشکانی ڕاپەڕینەکەشدا لاهووتی هەڵات بۆ سۆڤیەت و ئیتر بە هیچ شێوەیەك چاوی بە تاران نەکەوتەوە.

بە هەمان شێوە، مامۆستا بەسەر هەڵەیەکی تریشدا کەوتووە. لاهووتی لەماوەی نێوان ڕاپەڕین تا کوژرانی شێخ محمد خیابانی‌دا، لە ئێران نەبوو و لە ئەستەموولْ دەژیا. پاشماوەی دێموکراتەکانی لایەنگری خیابانی لە ڕووداوی ڕاپەڕینی جەندرمەی شەرەفخانە و گرتنی تەورێزدا یارمەتی لاهووتییان دا، ئەوە ڕاستە بەڵام هەڵەیەکی تەواوە کە مامۆستا دەنووسێ: "ساڵی ١٩٢٢ [لاهووتی] لە شۆڕشەکەی "شێخ محەمەدی خیابانیدا هاوبەشی کردووە".

خیابانی لە ١٩ی سێپتەمبری ١٩٢١ دا شەهید کراوە (کەسرەوی، ئەحمەد، ١٩٩٢، ٨٩٢) و ئاشکرایە لە مانگی ئۆکتۆبردا کاتێ لاهووتی گەڕاوەتەوە ئێران شۆڕشەکەی خیابانی تێك شکاو ورێبەری شۆڕش شەهید کرابوو. بەم پێیە بەشداری کردنی لە شۆڕشەکەدا نەگونجاوە. بەڵام بە پێچەوانەی باسەکەی لەمەڕ ئێران، ئەو کورتەیەی وا مامۆستا سەبارەت بە ژیانی سۆڤیەتی لاهووتی نووسیوە، بێ هەڵە و تەواوە.

یەکی دیکە لەو کەسانەی کە سەبارەت بە ژیانی سۆڤیەتی لاهووتی نووسیبێت، "سەعید نەفیسی"یە (١٩٩٦، ١٨٩٥)، نەفیسی ئەدیبێکی ناودار و جێگەی ڕێزی خەڵك بوو. لەسەردەمی گەنجیدا پێوەندیێکی نزیکی لەگەڵ تەیاری چەپ هەبوو و دوو جاریش بانگ هێشتنی سۆڤیەت کرا. لە هەر دوو سەفەرەکەیدا چاوی بە لاهووتی کەوت و دە

ساڵ دوای دووهەم سەفەر، لە ساڵی ١٩٤٦ و لە فەزای کراوەی سیاسی ئەو دەمانەدا، بە بۆنەی چاپی هەڵبژاردەی شیعرەکانی لاهووتیەوە وتارێکی لە گۆڤاری "پیام نو"، چاپی ئەنجومەنی دۆستی ئێران و سۆڤیەت (ژمارە ١٢ی ساڵی ٢، سپتەمبری ١٩٤٦)دا بڵاو کردەوە و تێیدا لە ژیان و شیعری لاهووتی دوا. ئەوەی خوارەوە، هەڵبژاردەی بۆچوونەکانی سەعید نەفیسییە لەمەڕ ژیانی لاهووتی. . هەڵوێست گرتنی نووسەر بەرانبەر بە شیعرەکانی لاهووتی لە بەشی دواتردا دێت. سەرجەمی بابەتەکەش دەکرێتە پاشکۆی کتێبەکە (بڕوانە نەفیسی، سەعید، پاشکۆی ژمارە ٤). کورتەی هەواڵی نەفیسی لەمەڕ لاهووتی بەم شێوەیەیە:

"لە ساڵی ١٩٣٢ بۆ یەکەم جار لە مۆسکۆ چاوم پێی کەوت.... ناوی بە هەموو لایەکدا بڵاو ببوەوە.... کارە هەڵبژاردەکانی وەرگەڕابوونە سەر چەندین زمان. پاشان لە ساڵی ١٩٣٦ لە هاوینە گەشتی ئەم دواییەی خۆم بۆ مۆسکۆ دا چاوم بە شاعیرێکی ناودار کەوت و لە گەڵیدا وتووێژم کرد.... لاهووتی ئەو وێژەرەیە کە، شیری لە کالان کێشاوەتە دەرێ و .... لە هەموو ٥٩ ساڵی تەمەنی، نزیکەی سی ساڵی لە مەیدانی خەباتدا بردۆتە سەر ... لایەنێکی دیکەی کاری لاهووتی خۆ بەخت کردنیەتی لە پێناو ئەو ئاوات و باوەڕانەی وا لە شیعرەکانیدا دەریان دەبڕێت ... لە ماوەی مانەوەی تورکیادا تەنیا شتێك کە پێی بڕا بێت گلەیی و شکات و خەم و دڵساردییە... بەڵام ئەوەی لە یەکیەتی سۆڤیەتی پێی بڕاوە، شەوق و هەست و خەبات لە ڕێگای ئیشوکاری خۆی و بیرەوەری ئێرانە و هیوای گەڕانەوەیەتی بۆ

ولآت. شاعیر هەمیشە یەکیەتی سۆڤیەتی بە نیشتمانی دووهەمی خۆی زانیوە.... زۆر شیعری وەرگێڕاونەتە سەر زمانە جیاجیاکانی سۆڤیەتی لە زمانی رووسییەوە." (نەفیسی، سەعید، پاشکۆی ٤).

کەسێکی دیکەی لەو سالآنەدا لە سۆڤیەت، لاهووتی بینیوە و سەردانی مالّی کردووە، ئەنوەر خامەیی‌یە. خامەیی کە پێشتر باسی کەسایەتیەکەیمان کرد، یەك لەو ٥٣ کەسە بوو کە لەسەردەمی رەزاشا دا گیران و "بە گروە ٥٣" نەفەر ناویان دەرکرد. ناوبراو سەرەتا بوو بە ئەندامی حزبی توودەی ئێران و دەرنگتر لە سالّی ١٩٢٦دا لێیان جیا بووە وە. خامەیی لە حزبی توودە گەلێك ناڕازی بوو و بەشێك لە رێبەرایەتی حزبی بە مەئموور و دەستنیژی دەزگای جاسووسی سۆڤیەت و حکوومەتی سۆڤیەتی دادەنا. حزبی توودەش وەك "رێویزیۆنیست"و هەلّپەرست باسی ئەوی دەکرد.

لەبەرگی دووهەمی بیرەوەرییەکانیدا، ئەنوەر خامەیی سەبارەت بە چاوپێکەوتنی لاهووتی کە لە ماوەی سەفەری سالّی ١٩٥٧دا بۆ مۆسکۆ واتە بە ماوەیەکی کەم پێش کۆچی دوایی لاهووتی رووی دا، دەنووسێ:

"سەرنج راکێشترین بەشی بیرەوەریم لە مۆسکۆ، چاوپێکەوتنی ئەمر ئەبولقاسمی لاهووتییە.... لاهووتی لەو دەگمەن کومۆنیستانەی پەنابردوو بۆ سۆڤیەتە کە لە بەلآی "پاککردنەوە"کانی ستالین رزگارییان بوو. لەناو هەزاران کومۆنیستی ئێرانی کە دوای شەڕی دووهەم [ی جیهانی] پەنایان بردبوە بەر سۆڤیەت، ئەوانەی وا لە "پاککردنەوەکان" رزگارییان هاتبێ لە ژمارەی قامکی دەست تێناپەڕن... لاهووتی لە جەندەرمریدا گەیشتبوە روتبەی مێجەر واتە سەرگوردی و وەك زۆر ئەفسەری جەندرمەی ئەودەم،

لایەنگری ئازادی و دوژمنی ئیستعماری ئینگلیز و دژ بە قەزاق و ڕەزاخان بوو... پەنای بردە بەر سۆڤیەت و لەوێ هەمیشە جێگەی ڕێزی دەوڵەتی سۆڤیەتی بوو، بە پلەوپایەی گرنگی وەك وەزارەت لە تاجیکستانیش گەیشت. لە ساڵی ١٩٥٧ دا، ماوەیەك بوو خانەنشین کرابوو و لە ئاپارتمانێکدا دەژیا کە دەوڵەت پێیدا بوو و لەگەڵ ژن و منداڵەکانی لەوێدا دەژیا. من و "کەشاوەرز" لەوێ چووینە دیدەنی".

پاشان خامەیی دەڵێ لاهووتی هەوڵی دا بە تەنیا چاوی پێم بکەوێ، بردمیە ویلاکەی لە دەرەوەی شار و قسەی لەگەڵ کردم:

"سەرسوڕمانم ئەودەمە تووش هات کە لاهووتی دەستی کرد بە گلە و گازندە لە کۆمەڵگای سۆڤیەتی و شتی وای پێگوتم کە من هەرگیز باوەڕم نەدەکرد. گوتی دزی و چەتەگەری لە دەوروبەری مۆسکۆ هەیە و شەو نییە کەس نەکوژرێت، بەرتیل و خاترگرتن، لە بنەماکانی ژیانی سۆڤیەتن... ئیرەییبردن ، ڕقەبەری و تاوانبار کردنی خەڵك، برەوی زۆرە... ڕەگەزپەرەستی و دژایەتیکردنی جوولەکە، کارێکی ئاساییە و لە قوتابخانە کوڕەکانی ئەزیەت دەکەن لەبەرئەوەی دایکیان جوولەکەیە... شتێك کە لە هەموان زیاتر سەرنجی ڕاکێشام، ئەوین و خۆشەویستی لاهووتی بۆ ئێران و بەتایبەت کرماشان بوو. بە داخ و دەردەوە دەیگوت "تاقە ئارەزووم ئەوەیە جارێکی تر وەتەن و شوێنی لەدایکبوونم ببینمەوە.... گوتی چەند جارم داواکرد و دەستبەدامێنی هەموولایەك بووم بچمە ئێران، بەڵام بەداخەوە موافەقەتیان نەکرد.

گوتم [واتە خامەیی]: بۆچی ئەوەندە جەخت لەسەر چوونەوەی کرماشان دەکەی، خۆ هیچی لێ نییە و شارێکی وێرانە ؟ بە خەفەتەوە

گوتی : چۆن دەتوانم کرماشان لەبیر بەرم؟ هەر لەو کوچە باخانەی هەزار بیرەوەریم هەن. لەژێر هەر دیوارێکیدا چەندین جار دزی تریێم کردووە !" لەکۆتاییدا لاهووتی نامەیەك و دوا وێنەی کوڕەکەی دامێ تا لە تاران بیخەمە پۆستەوە و بینێرم بۆ کرماشان، کارێك کە دەستبەجێ دوای گەیشتنی تاران بەڕێوەم برد." (خامەیی، ئەنوەر ٣٧٩ تا ٣٨٠).

پێش ئەوەی باسی بیرەوەری کەسانی تر لەمەڕ لاهووتی بکەم، بە پێویستی دەزانم دیاردە بە کتێبێکی فارسی بکەم. نەسیم خاکسار نووسەرێکی ئێرانییە کە ئێستا لە هۆڵەندا دەژی. ناوبراو لە ساڵی ١٩٩٣دا کتێبێکی بە ناوی "خاترات سفر تاجیکستان" بڵاوکردەوە و تێیدا لە کۆبوونەوەیەکی سێ ڕۆژەی کولتووری دوا، کە لە شاری دووشەنبە بەڕێوە چووبوو، ئەو و دەیان میوانی تریش لە دەرەوەی تاجیکستان هاوڕێ گەڵ سەدان تاجیکی بەشدارییان تێدا کردبوو. من کتێبەکەم خوێندەوە. لە هەموو لاپەڕەکانی ئەو کتێبەدا جارێك بە چاك یا خراپ ناوی لاهووتی نەهاتووە و وا دەردەکەوێ کە بە درێژایی ماوەی سێ ڕۆژەی کۆنفەرانسەکەش هیچکام لە خانەخۆی و میوانەکان ناوی لاهووتییان نەبردبێت. هەروەها من وا تێگەیشتم کە تەنانەت لە هەموو تاجیکستان نە جادەیەك، نە کۆڵخوزێك، و نە ناوەندێك بەناوی ئەوەوە نەماوە و بینایەی ئۆپێرای نەتەوایەتی تاجیکستانیش کە ناوی لاهووتی لەسەر بوو، ناوی دیکەی لەسەر دانراوە، لەبەرئەوەی نووسەر باسی چوونی میوانانی بۆ ئۆپێراکە کردووە، بەڵام ناوی لاهووتی نەهێناوە ! ئایا لاهووتیش بوو بە قوربانی ئانتی سۆڤیەتیسم لە

تاجیکستان ؟ ئایا دەسەڵاتی ئیسلامیەکان و ئێران وایان کرد ؟ خۆ ئەگەر ئەوانەش راست بن، نووسەرێکی وەك نەسیم خاکسار یا میوانانی تری وەك چەنگیز پەهلەوان و فەرەیدوون جونەیدی دەبوایە باسی ئەو قارەمانە مەزنەی مێژووی تاجیکستان و ئێرانیان بکردایە، کە نەیانکرد ! (خاکسار، نەسیم، ١٩٩٣).

هەرچۆنێك بێت، من بەشوێن لاهووتییدا زۆر دەرکم کوتا ! بیستم خاتوو ژاڵەی سوڵتانی (ناسراو بە ژاڵە ئیسفەهانی) کە دەیان ساڵ لە سۆڤیەت ژیاوە، ئێستا لە لەندەن دەژی، ویستم بچمە چاوپێکەوتنی و ئەویش بەوماڵئاواییەوە وەریگرتم و لە ساڵی ٢٠٠٢دا لە ماڵی خۆی قسەم لەگەڵ کرد. خاتوو ژاڵە لە مۆسکۆ چاوی بە لاهووتی کەوتووە و ئاگاداری ژیانی هەیە و، لە چاوپێکەوتنەکەدا باسی ئەوەی کرد کە لە کۆبوونەوەیەکی رەسمیدا بینیویەتی و ئەوەش سەردەمێك بووە کە لاهووتی کەوتبوە بەر چاوەدێریی پۆلیس و دەزگای ئاسایش. هەر بۆیەش هەمیشە بە دەوریەوە یەکدوو کەس هەبوون بۆ ئەوەی بزانن بۆ کوێ دەچێ و چاوی بە کێ دەکەوێت. خاتوو ژاڵە گوتی لاهووتی تەنانەت لە کۆبوونەوەیەکی وا گشتیدا نەیدەوێرا لەگەڵ کەسێك قسە بکات و هیچ بڵێ. جا بۆیە، کاتێ کە یەکترمان ماچ دەکرد بە ئەسپایی پێی راگەیاندم کە لەژێر چاوەدێریدایە.

هەندێ سەرچاوە کە دەبوایە زانیارییەکی کەم یا زۆریان لەمەڕ لاهووتی تێدا دەست بکەوێت، بە داخەوە لەمەڕ ئەو بێدەنگن. من سەیری هەندێکیانم کردووە و بە داخەوە هیچم لەو بارەیەوە دەست نەکەوتوون:

حسین مکی، خاطرات سیاسی
حماسەی پیرم با نضمام شرح احوال گروه گوگونیان و حزب داشنا کسیون
دکتر کریم سنجابی، امیدها و نامیدیها
نورالدین کیانوری، خاطرات
بزرگ علوی، خاطرات (بکوشش حمید احمدی)
انور خامه ای، پنجاه نفرو سه نفر
خلیل ملکی، خاطرات سیاسی

**لەبەرانبەردا، هەندێ سەرچاوەی چاوەڕوان نەکراو، زانیارییەکی زۆرمان لەسەر مەسەلەی ژیان و بەرهەمەکانی لاهووتی پێ دەبەخشن. من لێرەدا کورتەی هەموو ئەو سەرچاوانە دەخەمە بەر چاو کە دەستم پێیان ڕاگەیشتبێت. دەست پێ ڕاگەنەیشتووەکانیش دەزانم زۆرن و یەك لەوان بەڵگەنامەکان وەزارەتی کاروباری دەرەوەی بریتانیان، کە هەوڵ دەدەم دواتر بیانکەمە بەرگی دووهەمی ئەم کتێبە.**

**یەحیا دەولەت ئابادی لە بیرەوەرییەکانی خۆی بەناوی "حیات یحیی"دا زانیارییەکی هەڵەمان پێ دەدات کە دووری نازانم مامۆستای بەڕێز حەسەنی قزڵجیش بۆ چوونێکی خۆی لەو وەرگرتبێت (بڕوانە پێشتر). دەوڵەت ئابادی دەنووسێ: "....لەنێوان هێزی دەوڵەتی [لە ئازەربایجان] و هێزی میللی بە ڕێبەرایەتی شێخ محەمەدی خیابانی و لاهووتیدا، شەڕ دەقەومێت، شێخ محەممەد دەکوژرێت و لاهووتی خان فیرار دەکات و حوکمی دەوڵەت لە ئازەربایجان بە هێز دەبێت....." (دەوڵەت ئابادی، یەحیا، ٤، ١٠٦).**

**ئەم هەواڵە، هەڵەیەکی زەقی تێدایە و وەك پێشتر گوترا، خیابانی ماوەی مانگێك پێش ئەوەی لاهووتی بگەڕێتەوە ئێران و چەند مانگ**

پێش ڕاپەڕینی جەندرمەی شەرەفخانە لە تەورێز، دەکوژرێت و لە ڕاستیدا نەك ئەو دوو کەسە ڕاپەڕینێکی هاوبەشیان نەکردووە بەڵکوو هەرگیز چاویان بە یەکتر نەکەوتووە.

ئیرەج ئیسکەندەری لە ڕێبەرانی حزبی توودەی ئێران لە بیرەوەرییەکانی خۆی و لە باسی تەنگوچەڵەمەی نێوان باڵە جیاوازەکانی ڕێبەرایەتی حزب لە ماوەی ژیانی سۆڤیەتدا، باسی ئەوە دەکات کە چۆن چۆتە لای لاهووتی و بە حیسابی پێوەندی لاهووتی لەگەڵ کومیتەی ناوەندی [حزبی کومۆنیستی یەکیەتی سۆڤیەت]، داوای لێ کردووە بۆی بپرسێ و ڕوونی بکاتەوە ئایا هۆی هەڵس‌وکەوتی نالەبار لەگەڵ ئەودا چییە و دەڵێ: "لاهووتی گوتی من پرسیاری مەسەلەکەت بۆ دەکەم و سبەینێ لە بابەتەکە دەکۆڵمەوە..... دوو سبەی هات و گوتی جەناب ! بۆیان تێ‌چاندووی.... گوایە تۆ شازادەی و دژی سۆڤیەتی". ئەسکەندەری لە کۆتاییشدا دەنووسێ: "لاهووتی شوێنی زۆری لەسەر دانام بەوەی چووبوو ئاوا داکۆکی لە من کردبوو....." (اسکندری، ایرج، ٣٩٩ و ٤٠٠).

ئیسماعیل ڕائین لەبەرگی یەکەمی کتێبە ناسراوەکەی خۆی "فراموشخانە و فراماسونری در ایران" دا، کە سەبارەت بە دەوری ماسۆنەکان لەبەرێوەبردنی کاروباری سیاسی ئێران نووسراوە، کاتێ باسی تەئسیری نووسراوەکانی میرزا مالکۆم خان و ڕۆژنامەکەی واتە "قانوون" لەسەر ڕووناکبیرانی ئێران دەکات، کەڵك لە بیرەوەرییەکانی لاهووتی لە کتێبی "کلیات ابوالقاسم لاهوتی" بە زمانی تاجیکی وەردەگرێت و دەگێڕێتەوە چۆن بە دزییەوە ڕۆژنامەکەی خوێندوتەوە و هەروەها چۆن لە

ڕێگەی باوکیەوە چۆتە ناو "جمعیت ادمیت"ی ماسۆنەکان و هەر ئەوانیش پیتاکی چوونە تاران و دەرس خوێندنیان پێ داوە.

رائین لە درێژەدا دەنووسێ: "نەك هەر لاهووتی خۆی باسی ئەندامیەتی لە جەمعیەتی ماسۆنی کردووە، بەڵکوو "بیرتلێس" زانا و ئێراننناسی سۆڤیەتی و "میکائیل زەند" ئێراننناسی هاوچەرخ و ئەندامی ئاکادێمیای زانستی تاجیکستانیش لەم بارەیەوە زانیاری بەنرخیان پێ داوین... " (رائین، اسماعیل، ١، ٦١٩ تا ٦٢١). ئەو پێوەندییەی لاهووتی لەگەڵ ماسۆنەکان جێگەی پەسندی لاهووتی خۆشیەتی و لە وتاری "سەبارەت بە خۆم" دا تەئیدی دەکات (بڕوانە پاشکۆی یەکەم).

ئیحسان تەبەری زانا و فەیلەسووفی ئێرانی ماوەی دەیان ساڵ وەك یەکێك لە رێبەرانی حزبی توودە لە خاکی سۆڤیەتدا ژیا و دوای گەڕانەوە بۆ ئێران کەوتە بەر پەلاماری کۆماری ئیسلامی و لە زیندان لەژێر ئەشکەنجەی زۆردا، رووخا. لە ساڵانی زیندانادا تەبەری کتێبێکی بە ناوی "کژ راهە" نووسی کە ئاشکرایە لەژێر زەختی زیندانەوانەکانیدا نووسراوە و هەر بۆیەش بایەخ و "سەنەدییەت"ی نییە. تەبەری ، کە لە سۆڤیەت لاهووتی گەلێك جاران بینیوە، لەم کتێبەدا ئاماژەیەکی کەمی پێ دەکات کە بۆ ئەوە دەبێت لێرەدا وەرگێڕاوەکەی بخەمە بەر چاوی خوێنەر، گەرچی هەموو دەقی کتێبەکە دەبێ بە پارێزەوە سەیر بکرێت. تەبەری دەنووسێت:

"...ئەو دەم شاعیرانی ناوداری رووس وەك یبسەنین، بلۆك و مایاکۆفسکی خۆیان لەوە دەگرت بە ستالیندا هەڵبڵێن، بەڵام لاهووتی

دەستی کرد بە پێدا هەڵگوتنی گرنگایەتی و گەورەیی کەسایەتی ستالین.... هاو سەرەکەی ، کە شاعیرەیەکی رووس بوو، زۆر جار شیعرەکانی بۆ وەردەگێڕاو ئەم شیعرانەش دەکەوتنە بەرچاوی ستالین‌و، بۆیەش بوو کە ستالین میهرەبانی لەگەڵدا دەکردو فەرمانی دا کە پلەی یارمەتیدەری [ماکسیم] گورکی لە ئەنجومەنی نووسەرانی سۆڤیەتی پێ بدرێت.... ستالین فەرمانی دا دەستبەجێ خانووبەرەیەکی بە ٥ ژووری خەوەوە لە "ماڵی دەوڵەت"دا پێ بدەن.... بەڵام ئەو کاتەی کە ئێمە گەیشتینە مۆسکۆ، لاهووتی بەردەوام شکاتی لە هەژاری و دەستتەنگی خۆی دەکرد و ئیتر میهر و خۆشەویستی رابوردووی ستالین، لاهووتی نەگرتەوە، چونکوو تاقمێکی زۆری نووسەران بەدەوریەوە بوون و ئیتر پێویستی بە لاهووتی نەبوو.... پاش مردنی ستالین، مۆلۆتۆف خۆشەویستی خۆی بە لاهووتی نیشان دا و بڵاوکردنەوە و وەرگێڕانی هەموو کۆمەڵە شیعرەکانی ئازاد کرا، هەروەها "داچا" (ویلا) یەکی لە دەرەوەی مۆسکۆ بە ترومبیل و لێخوڕەوە پێ درا. لاهووتی هەستی بە بەختەوەری دەکرد، بەڵام مردنەکەی نزیك ببووەوە و زۆری پێ نەچوو، کە لە تەمەنی ٧٠ ساڵی دا کۆچی دوایی کرد (تەبەری، ئیحسان، ١٩٨٨، ٩٧، تا ٩٩).

من لێرەدا کۆتایی بە گێڕانەوەی بیرەوەری کەسان لەمەڕ لاهووتی دەهێنم، گەرچی ئاشکرایە هێشتا گەلێك سەرچاوە و شوێنی دەیکە هەن کە دەکرێ سەردانیان بکرێت، بەڵام لام وایە خوێنەر بەو زانیارییانەی تائێستا گردوکۆ کراون، روخسارێکی روونی ژیان و کەسایەتی و بەسەرهاتەکانی لاهووتی بۆ دەرکەوتووە. بەڵام باش وایە وەك خاتیمەی

ئەم بەشە، باسێك لە دوو بابەت بكەم كە پێوەندییان بە ژیانی لاهووتی لە ئەستەمووڵ و ئێرانەوە هەیە و، یەكیان بە تایبەت خاوەنی گرنگایەتی زۆرە، ئەویش كێشەی كوژرانی شۆڕشگێڕی ناوداری ئێران "حەیدەر خانی عەمووئۆغلی" و ناوی بكوژەكەیەتی. حەیدەرخان دۆست و هاوسەنگەر و هاوبیری لاهووتی و دانەری ئەسڵی حزبی سوسیال دێموكراتی ئێرانە، كە پێشتر باسی هاوكاری ئەو و لاهووتیمان كرد.

مەسەلەی كوژران یا ئیعدامی ئەویش وەك كوژرانی میرزا كوچك خانی جەنگەڵی تائێستا لە تاریكیدا ماوەتەوە و لایەنە جیاوازە سیاسیەكان هەر كام بە شێوەیەكی بۆ دەچن. بۆچوونێك ئەوەیە گوایە میرزا كوچك خانی جەنگەڵی كوشتبێتی. اسماعیل رائین لە كتێبی "حیدرخان عمواوغلی"دا، ئەم بۆچوونە دەداتە دواوە و دەڵێ سەری هەودای هەڵەیەكی ئەوتۆ، شیعرێكی لاهووتیە. شیعری لاهووتی كە "رائین" ئاماژەی پێدەكات، شیعرێكە بەناوی "مرگ مجاهد" كە تێیدا حەیدەرخان و میرزا كوچك خان وتووێژ دەكەن و روانگەی سیاسی خۆیان دەردەبڕن، ئینجا حەیدەرخان بەهۆی روانگەی پێشكەوتنخوازانەیەوە زیندانی دەكرێت و كوچك خان لە زیندان دەچێتە چاوپێكەوتنی و فەرمانی تیرەباران كردنی دەردەكات. ئەوە كۆتایی شیعرەكەیە:

در آن تاریکی شب، هیئتی وارد بزندان شد
سپس برقی بزد کبریتی و، شمعی فروزان شد
به پیش اهل زندان صدر ملیون نمایان شد،
سخن کوتاه، حیدر با رفیقان تیر باران شد

(شیعری "مرگ مجاهد"، لاپەڕە ٢٦٨ی دیوان لاهووتی) (رائین، اسماعیل، "حیدر خان عمواوغلی"، ١٩٧٦، ٢٩٥).

وەك گوترا، کێشەی کوژرانی حەیدەر خان هێشتا لە تاریکیدا ماوەتەوە و نازانرێ ئایا لاهووتی چەندە لە بۆچوونەکەیدا راست بووە، بەڵام تەنگوچەڵەمەی ناو بزوتنەوەی جەنگەڵ و زەقبوونەوەی رقەبەری و دژایەتی نێوان باڵی راست کە میرزا کوچك خان نوێنەرایەتی و رێبەرایەتی دەکرد، لەگەڵ باڵی چەپدا کە احسان اللەخانی دۆستدار هاورێ و هاوبیری حەیدەر خان نوێنەری بوو، وا هەیە بۆچوونی لاهووتی تەئیید بکەن، بەتایبەت کە لاهووتی لە حەیدەر خان نزیك بوو و دەبێ پەی شوێنی کێشەکەی گرتبێت.

٢) خان مەلیکی ساسانی باڵوێزی ئێران لە ئەستەمووڵ، لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا باسی نەورۆزی ساڵی ١٣٠٠ی هەتاوی، واتە ١٩٢١ی زایینی دەکات و تێیدا ئاماژە بە لاهووتیش دەکات. ئەوە کورتەی یادداشتەکانی خان مەلیکە:

"نەورۆزی ١٣٠٠ی هەتاویمان لە باڵوێزخانەی [ئێران لە] ئەستەمووڵ بە جەژن گرت.... پاشان ئاغای ئەبولقاسم خانی لاهووتی کرماشانی مودیری گۆڤاری "پارس" یەك لە شاعیرانی ناوداری ئێران کە لوتفی تایبەتی لەگەڵ من هەیە، "نوروزنامە"یەکی بەناوی منەوە خوێندەوە.... "

خاوەن و سەرنووسەری بەشی فارسی [گۆڤاری "پارس"] ئەبولقاسمی لاهووتی بوو. حەسەنی موقەدەم ئەتاشەی باڵوێزخانە، بەشی فەرەنسی گۆڤارەکەی بەرێوە دەبرد. لەوێدا ژیاننامە یاخود شیعری شاعیرانی کرماشان وەك حوسەینقوڵی خانی کەلهوڕ کە نازناوی "سوڵتانی"بوو، هەروەها میرزای سالیك و ئەبوالقاسمی لاهووتی بلاو دەکرایەوە (ساسانی، خان ملك، ١٩٧٥، ١٤٠و ٢١٠)

# بەشی دووەم
# شیعر

## شیعری لاهووتی:

ئەوەی تائێستا گوترا، ژیان و بەسەرهات و هەڵوێستی لاهووتی بوو. بەڵام لاهووتی پێش هەمووشت بە شیعرەکانیەوە دەناسرێت، ئەو شیعرانەی کە بە فارسی دەیگوتن و هەندێ جار لە خەنجێری دەبان تیژتر بوون. شیعری لاهووتی، پاراو، ساکار، هەڵوێستدار و خاوەن ناوەرۆکی سیاسی کۆمەڵایەتین.

لاهووتی بە یەکەم شاعیری چینی کرێکاری ئێران دەناسرێت، هەروەها، بە دە ساڵێك پێش نیما یوشیج (باوکی شیعری نوێی فارسی)، قاڵبی عەرووزی شکاندووە و شیعری بە فۆرم و ناوەرۆکی نوێوە گوتووە. عەداڵەتخواهی، دژایەتی چەوسێنەر و لایەنگریی چەوساوان گەوهەری سەرەکی شیعری لاهووتین. هەڵوێستی توند بەرانبەر بە ئایین و مەلا ومالم و قەشە، تایبەتمەندییەکی گرنگی دیکەی شیعری لاهووتییە. لە شیعرەکانیدا شاعیر بانگی یەکیەتی و یەکگرتوویی ریزی زەحمەتکێشانی دەدات و یەکەم ئێرانییە کە شیعری "ئینترناسیۆنال"ی وەرگێڕابێتە سەر زمانی فارسی،

کۆمۆنیستێکی خاوەن هەڵوێست و بە بڕوایە و باوەڕی بە خەباتی چینایەتی، سەروەریی کرێکاران و زەحمەتکێشانی گوند و شار و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا هەیە. سەرەڕای ئەوانەش، شیعری ئەویندارییی کەم نین و ئەگەر ژیان بەرەو بواری خەبات و ئەرکی سیاسی نەبردایە، وەك شاعیرێکی ئەوین و دڵداریش هەر ناوی لە مێژووی ئەدەبی ئێراندا دەمایەوە.

تێکچڕژاویی عاتیفە و هەستی ناسکی مرۆڤانە و زمانی بێگرێوگۆڵ، لەسەردەمی ئاڵۆزی مەشرووتەی ئێراندا، شیعری لاهووتی لە شاعیری دیکەی هاوچەرخی کە بەگشتی شاعیری "سیاسی"بوون، بۆ نموونە لە شیعری "عشقی هەمەدانی" و "فرخی یزدی" جیادەکاتەوە، گەرچی وا هەیە لەبەراوردکارییەکی ئەوتۆدا، نەتوانێ شان لە شانی "ایرج میرزا" بدات. لاهووتی مێژووی ئەدەبی کلاسیکی ئێران و شیعری کەڵەشاعیرانی وەك سەعدی و حافزی بە باشی ناسیوە و لە "اقتدا"ی ئەواندا شیعری گوتووە. هەروەها شوێنی راستەوخۆی شاعیرانی سەردەمی مەشرووتە وەك سید اشرف الدینی گیلانی (نسیم شماڵ) بەسەر شیعرەکانیەوە دیارە. راستەوخۆ و ناراستەوخۆ، لە رێگەی "نسیم شماڵ"یشەوە، تەئسیری زۆری لە میرزا عەلی ئەکبر سابیر (هۆپ هۆپ) شاعیری ئازەربایجانی باکوور، وەرگرتوە و هەروەها لە رێگەی تورکی زانینی خۆیەوە شوێنی لە شاعیرانی تری ئازەربایجانی هەڵگرتووە.

لە ماوەی ژیانی ئەستەمووڵیشدا ناسیاویی لەگەڵ شیعری سەردەمی فەجری ئاتی و مەشرووتەی عوسمانی پەیدا کردووە. لە

ماوەی ٣٥ ساڵی ژیان لە سۆڤیەتیشدا دیارە زمانی تاجیکیشی کە لەراستیدا لەگەڵ زمانی فارسی هەر یەکن، بە باشی زانیوە و لەوانەش گرنگتر بۆ باسەکەی ئێمە، کوردی زاراوەی گۆرانی زانیوە. شاهیدی کوردی زانینەکەی، ١٧ ساڵ ژیان لە کرماشان لە داوێنی دایکێکی کورد و هاتوچۆی عەشیرەتی سەنجابی و قەڵخانی و وەڵەدبەگییە. بەڵگەیەکی تر، ئەو دووپارچە شیعرە کوردییەن کە تائێستا کەوتوونەتە بەر دەستی ئێمە و، هیچ دوور نییە لە دوا رۆژدا نموونەی دیکەیان بەدووودا بێت. شاهیدی سێهەم بۆ ئەم باسەمان بیرەوەرییەکەی خۆیەتی لە ماوەی گیرانی شاری کەرەجیدا، کە دەڵێ:

"رۆژێکیان گوێم لێ بوو پاسەوانێك گۆرانی کوردی دەگوت. من دایکم لە هۆزێکی کورد بوو و **خۆیشم زمان و نەریتی کوردیم دەزانی**. جا بە هێمنی گۆرانییەکەم بۆ گێراوە. پاسەوانی گۆرین هاتە ژوور و لەگەڵمدا کەوتە قسە:

"توونیەتی تۆ بە کامە کانیاو دەشکی؟"[٢]

منیش بە کوردی وەڵامم دایەوە:

"کانیاوێك کە هەرگیز ویشکایی نایەت! "

(بڕوانە، سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ژمارە ١).

کەسێکی ناسیاوی کولتووری ئەو هەموو گەل و وڵاتە، کە ئەوەندە زمان بزانێت، بیرێکی تیژ و هەڵوێستێکی مرۆڤدۆستانەی هەبێت، زەمان و سەردەمی ناسیبێت، نوێخواز و ناحەزی دیاردەی کۆن بێت و خاوەنی هەستێکی ناسکی شاعیرانەش بێت، دەبێ چلۆن شیعر بڵێت؟ با سەیرێکی ئەم پارچە شیعرە فارسییەی بکەین:

تنها نه من ادیب و سخندانم جنگ آور و مبارز میدانم
من هم حریف توپم و طیاره هم آشنای چکش و سندانم
در وقت بزم، بلبل دستانگو در روز رزم، رستم دستانم
در دست من چوخامه بود،شمشیر چون خامه است خنجر برانم
برنده ام، از این چه عجب؟ چون من شمشیر دست فعله و دهقانم
غرنده‌ام، در این چه سخن؟ چون من، برضد ظلم، ضیغم غژمانم
گو، خصم از ستاره فزون گردد غم نی، من آفتاب درخشانم
کوهم، چه باک باشدم از طوفان؟ بحرم، چه حاجت است به بارانم؟
ورزیده است پنجه و بازویم تابیده است دنده و استخوانم
سرها بوقت معرکه از دشمن چون گو، فتاد در خم چوگانم
شد بارها چوکاوه آهنگر ضحاک ظلم، بسته به زندانم
من قهرمان لشکر مزدورم من پهلوان توده دهقانم
بنهاده زندگی بکفم شمشیر تامام، لب گرفته ز پستانم
سر نیزه خامه بود و مرکب، خون میدان کارزار، دبستانم
نه گبر ونه یهود و نه عیسایی نه کافرم نه اینکه مسلمانم
دنیا و صنف فعله و بازوها ملک من است و ملت و ایمانم
گردن از این عقیده نمی پیچم بیرون کنند اگر زتن جانم
چون بعضی از رجال سیاست باف آلوده نیست جامه و دامانم
کافی است در محاکمه، انصافم صافیست همچو آینه، وجدانم
بر مردی و درستی و بی باکی شاهد بود وقایع ایرانم
هم انقلاب کوته تبریزم هم حادثات عمده تهرانم
هم کار پر جسارت کرمانشاه هم آن شجاعت قم و کاشانم
دیروز آنچنان بدم و امروز در دست فرقه، خوبتراز آنم
با اینهمه، غرور ندارم من زیرا نه خود پرست و نه نادانم
دانم که بیشتر ز همه کس من، محتاج فضل و دانش و عرفانم
بیهوده نیست اینکه چو می‌بینند گیرد حسد گلوی حسودانم

**مۆسکۆ، جولای ١٩٢٤**

**(شیعری "همه زن حریف"، لاپەرە ٦٣٥ی دیوان).**

ئەم شیعرە، لە راستیدا، چەشنە ژیننامەیەکی شاعیرە و تێیدا لاهووتی باسی خۆی دەکات و دەڵێ نەك تەنیا شاعیر بەڵکوو خەباتکار و جەربەزەم، شمشێری دەستی کرێکار و وەرزێرم، ئایینم لایەنگری کرێکاران و نیشتمانم هەموو جیهانە. ئینجا ئاماژەیەك بە رووداوەکانی ژیانی خۆی لە ئێران دەکات و لە "شۆڕشی کەم تەمەنی تەورێز"، "رووداوی گرنگی تاران"، "کاری بوێرانەی کرماشان"و "ئازایەتی قوم و کاشان" دەدوێت. دوای هەمووشیان دەڵێ: "ئەگەر لە رابوردوودا ئاوەها بووم، ئەمڕۆ [لە سەردەمی ژیانی سۆڤیەتدا]، لەوانەش بەکەڵکترم.

شیعرەکە لە مانگی ٧ی ساڵی ١٩٢٤ لە مۆسکۆ گوتراوە و، ئەو ساڵەش بەگوێرەی وتارەکەی خۆی، هەمان ئەو ساڵەیە کە تێیدا بە ئەندامیەتی حزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی وەرگیراوە (لاهووتی، سەبارەت بە خۆم، پاشکۆی ١).

سەرەتا، پێویستە تایبەتمەندییەکانی شیعری لاهووتی شی بکەینەوە و لایەنی گرنگی کارەکانی دەست نیشان بکەین.

شیعرە فارسییەکانی لاهووتی چەند تایبەتمەندی بەر چاویان هەیە:

(١) لە باری فۆرمەوە زیاتر کلاسیکن واتە لە چوارچێوەی عەرووزی عەرەبدا گوتراون. لەم بوارەدا، شوێنی شاعیرانی کلاسیکی فارس بە تایبەت حافز و سەعدی بەسەر شاعیرەوە دیارە، بەڵام لە عەینی کاتدا، ناوەرۆکێکی مۆدێڕن و ئەمڕۆیی و گەلێك جار سیاسییان پێ دراوە:

رها نمی کند ایام در کنار منش
که داد خود بستانم به بوسه از دهنش

(سعدی)

هر آنکه نام خدا می برد، نما به منش
که داد خود بستانم به مشتی از دهنش

**(لاهووتی)**

آنانکه خاک را بنظر کیمیا کنند
آیا بود که گوشهء چشمی بما کنند؟

**(حافظ)**

آنانکه مرز و بوم جهان را بپا کنند،
کی خویش راز بند اسارت را کنند؟

**(لاهووتی)**

هان ای دل عبرت بین، از دیده نظر کن، هان!
ایوان مدائن را آئینه عبرت دان

**(خاقانی)**

تا چند کنی گریه بر مسند نوشروان؟
در قصر "کرمل" ایدل، اسرار نهان بر خوان

**(لاهووتی)**

لمعات و جهک اشرقت، بشعاع طلعتک اعتلی
ز چه رو "الست بربکم" نزنی، بزن که بلی بلی

**(صحبت لاری)**

جذبات شوقک الجمت، بسلاسل الغم و البلا
همه عاشقان شکسته دل که دهند جان به ره بلی
اگر آن صنم زره ستم، پی کشتنم بنهد قدم،
لقد استقام بسیفه و لقد رضیت بما رضی

**(منوب به "قرة العین")**

چه خوش آنکه بیرق خون بپا، پی دفع فتنهء اغنیا
شود و به جهان بزند ندا، که: گروه کارگر، الصلا!
**(لاهووتی)**

کشتی صبرم بدریا غرق شد، ای ناخدا!
من خدای خویش دارم، ناخدا در کار نیست
**(ناصر خسرو)**

کشتی فتحم به ساحل میرسد با انقلاب
ناخدای خویش دارم من، خدا در کار نیست
**(لاهووتی)**

**(٢) لاهووتی بەبیّ هیچ گومانێك پێشڕەوی شیعری نوێی فارسییە، چ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە کە وەك شاعیری چینی کرێکار و چەوساوەی ئێران چەمکی بێخەوش و زەقی چینایەتی هێناوەتە ناو شیعری فارسییەوە، و چ لە ڕووی فۆرمەوە کە لای کەم بە ماوەی ١٠ ساڵ پێش نیما یوشیج (باوکی شیعری نوێی فارسی)، قاڵبە عەرووزییەکانی شکاندووە و شیعری بێ سەروا و تەنانەت بێ کێشی گوتووە.**

**لاهووتی هەر لە سەردەمی شیعرە کلاسیکیەکانی و پێش ئەوەی دەست بە شکاندنی کێشی عەرووزی بکات، لاهووتی لە قاڵبی بۆ ئەو دەم نائاسایی و نەناسراوی عەرووزیدا شیعری گوتووە:**

در غم آشیانه پیر شدم
باقی ار هستیم، همان، نامی است
مردم از غصه، این چه ایامی است؟
منکه از این حیات سیر شدم!

**(بازگشت به وطن، خانقین عجم، آپریل ١٩١٥، ل ١٥١ی دیوان)**

ئەم چەشنە شیعرە، دواتر بە ناوی نیما یوشیجە وە ناسرا و "چهار پارەی نیمایی" پێ گوترا، گەرچی وەك دەبینین، لاهووتی پێشتر رچەی ئەم شێوازەی شکاندبوو.

بەڵام دواتر، لە ماوەی ژیانی سۆڤیەتدا، وەرچەرخانێکی بەر چاو بەسەر شیعری لاهووتیدا هات و ئەوە، نەك تەنیا ناوەرۆك بەڵکوو فۆرمیشی گرتە بەر.

لاهووتی یەکەم شاعیری ئێرانی و فارسیوێژە کە شیعری نوێ و تەنانەت شیعری سپی گوتبێ:

سر و ریشی نتراشیده و رخساری زرد
زرد و باریک چونی
سفرەای کرده حمایل، پتوئی بر سردوش
ژندەای بر تن وی.....

(شیعری "وحدت و تشکیلات"، مۆسکۆ، فیبرەوەری ١٩٢٤، لاپەرە ٢٦٦ی دیوان).

(٣) لەمەڕ وەرچەرخانی لاهووتی لە شیعری کلاسیکەوە بۆ قاڵبی نوێ، من بۆچوونێکی تایبەت بە خۆم هەیە. بە بۆچوونی من، رووکردنە قاڵبی نوێ بۆ لاهووتی لە هەموو شاعیرێکی فارسیوێژی سەردەمی خۆی ئاساییتر و هاسانتر بووە. هۆی مەسەلەکەش شارەزایی لاهووتی لە زمان و شیعری فۆلکۆلۆری واتە بڕگەیی گەلی کورد بوو.

لاهووتی لە منداڵیشدا وەك گوتمان "رەجەز"ی هۆندۆتەوە، کە دەتوانێ کلاسیك یاخود بڕگەیی بێت، هەروەها شارەزای گۆرانی فۆلکۆری کوردیش بووە و نموونەکەی ئەو وەڵامەیە وا بە گۆرانی بە

پاسەوانی زیندانی کەرەجی داوەتەوە. خۆ دەوڵەمەندی و بەرفراوانی شیعری فۆلکۆلۆریکی کوردیش پێویست بە باس و لێدوان ناکات. جا کەسێکی ئەوتۆ، بەگوێرەی سروشت و تەنانەت پێش شارەزا بوون لە زمانانی ئەورووپی (فەرەنسی و رووسی)و پێش "ئیرادەکردن" بۆ گوتنی شیعری نوێ، هەست و نەستی کوردانەی هەبوە و دەبێ شارەزایی لە شیعری فۆلکۆلۆری کوردی و قاڵبی بڕگەیی، بە شێوەیەکی ئوتۆماتیك خۆیان خزاندبێتە ناو شیعرە فارسییەکانیەوە. لێرە، نموونەی سەرهەڵدانی شیعری بڕگەیی لە هەندێ شیعری "بە رواڵەت" عەرووزی لاهووتییدا، دەهێنمەوە، با خوێنەر سەیری بکات، هەڵیسەنگێنێت و بزانی ئایا هۆندنەوەی نموونەی هاوچەشنی شیعری ئەوتۆ بۆ کەسێك کە فۆلکۆلۆری کوردی نەزانێت نەناسێت، شتێکی گونجاوە؟ ئایا ئەو شیعرانە لە شیعری بەیت و حەیرانی کوردی جیاوازن؟

الاهی بچەهاتانرا ببینم
نمیرم، در عروسیتان نشینم
(شیعری "نشان مردی"، مۆسکۆ ئوکتۆبر ۱۹۳۷، ل ۳٤٥ی دیوان)

صف کشید ای عشقبازان!
دف زنید ای دف نوازان!
*ره دهید ای قد فرازان!*

دلبر ماگشته رقصان،
کف بکوبید ای حریفان!
(شیعری "ای حریفان"، مۆسکۆ ئامبری ۱۹٤۰،ل ۲۱۳ی دیوان).

بالای گلها

زنبور عسل
باساز و آواز
می‌پرید
و اتفاها
در همان محل
بد نفس گراز
می‌چرید

**(شیعری "زنبور عسل"، ستالین ئاوا، ۱۹۴۳، ل ٦٧٩ی دیوان).**

یادت میاد که پارسال
گاو مرا ربودی
از غم گاو تا امسال
خواو مار ربودی؟ (خواب)
بلشویکان آمدند
حلقه بگوشت زدند
ز آهن و ساروج و سنگ
یوغی بدوشت زدند

**(شیعری"من نمی‌ترسم"، ستالین ئاوا، مانگی مه‌ی ۱۹۳۵، ل ۳۵۹ی دیوان)**

شب شد، تیره شد، ماهم نیامد
روشنی بخش راهم نیامد
خواستم بنالم، توانم نبود
از دل به دهان اهم نیامد
گر چه خسته و زار و دلگیرم
نمی‌خواهم دور، از وی بمیرم
صید تو نیستم، ای اجل دور شو!
یار می‌گویم و فوت میگرم

**(شیعری "وفادار"، ۱۹۳۸، ل ۴۵۳ی دیوان)**

وەك بەتايبەت لەم پارچە شيعرەی دواييدا بەرچاو دەكەوێت، كێشی شيعرەكە ١٠ برگەيی و دوورە لە ئەفاعيلی عەرووزی، واتە زياتر هەڵيخە و بيخەی كوردی و سوار و بن بزۆكەيە و جياوازە لە شيعری لووتبەرز و گۆچان قووتدراوی عەرووزی.

بەكورتی، دەمەوێ بڵێم كە هاندەری سەرەكی لاهووتی بۆ رووكردنە شيعری نوێی فارسی، شيعری فۆلكۆلۆريكی كوردی بووە كە ناسياوييەكی تەواوی لێی هەبوو. هەر ئەو شيعرە برگەييانەش، رێگايان بۆ شاعير خۆش كرد تا لە قۆناغێكی دواتردا قاڵبە سوننەتيەكان بشكێنێت، كێشی ناياسايی بهێنێتە ناو شيعری فارسييەوە و لە ئەنجامدا كێش و درەنگتر سەروا وەلابنێ و شيعری "سپی" بڵێت.

نموونەيەكی تری ئەم رووكردنە فۆلكۆلۆرەی لاهووتی، شوێن هەڵگرتنيەتی لە شاعيری ناسراوی سەردەمی مەشرووتيەتی ئێران سيد اشرف الدينی گێلانی يا قەزوێنی، واتە "نسيم شمال".

نەسيم شماڵ بە پێچەوانەی لاهووتی، مرچ و مۆن و توورە و رق هەستاو نەبوو و شيعرەكانی لە عەينی سياسیبووندا، لەبەردڵان و خۆش و گەلێك جار بە تەنزێكی خۆش، بزەهاوێژی سەر لێوی خوێنەر بوون، ئەو رۆژنامەيەش وا لە "رەشت" دەری دەكرد و خۆيشی بە ناوی هەمان رۆژنامە واتە "نسيم شمال"ەوە دەناسرا، رۆژنامەيەكی فكاهی بوو.

ئەگەر ئەو راستيە بگرينە بەرچاو كە "نسيم شمال" شوێنی لە ميرزا عەلی ئەكبەری سابير (هۆپ هۆپ) شاعيری ئازەربايجانی

هەڵگرتووە، دەبینین مەسەلەی شیعری بڕگەیی یا هەڵبژاردنی بەحری نوێ و ناکلاسیك لە شیعری هەرسێ ئەو شاعیرانەدا دیاردەیەکی هاوبەشە و لاهووتیش بە بێهوودە لەناو هەموو ئەو شاعیرانەدا چۆتە سۆراغی نسیم شمال و هۆپ هۆپ: نەسیم شمال و هۆپ هۆپ شیعری بڕگەیی گێلانی و ئازەربایجانییان دەگوت وشیعری بڕگەیی کوردییان دەهێنایەوە بیری لاهووتی!

شیعری "لالایی مادر"ی لاهووتی نەك هەر لەژێر تەئسیری هۆپ هۆپدایە بەڵکوو کۆپیەکی تەواوی ئەوە. هەر لێرەشدا بڵێم ئەم شیعرەی لاهووتی هەوێنی لایەلایەی مامۆستا هەژار بووە کە دوای ئەویش قانع و گەلێ شاعیری کورد بە ڕێبازی هەژاردا ڕۆیشتن و لایەلایەیان نووسی. یەحیا ئاریەن پوور دەنووسێ:

یەکێك لە بەهێزترین شیعرەکانی ئەم سەدەمەی لاهووتی، شیعری "لالایی مادر"ە کە لە کۆتایی مانگی محەڕەمی ١٣٢٨ (فیبریوەری ١٩١٠) لە ڕۆژنامەی "ایران نو"دا بڵاوکرایەوە، شیعرەکە، لەسەر ئوسلوب و شێوازی "صابر" هۆنراوەتەوە. مەتلەعی شیری صابر بەم شێوەیە:

"قرینمە اماندور بالا غفلتدن ایلما! لای لای بالا لای لای
اچما گویزیوی، خواب جهالتدن ایلما! لای لای بالا لای لای "

شاعیر بە توند و تیژییەکی نیشتمان پەروەرانەوە، داوا لە نەوەی نوێ دەکات هەموو هێزی خۆیان بۆ پاراستنی ولات لە دەست درێژی بێگانە تەرخان بکەن..." ئەوەش شیعرەکەی لاهووتی، کە ڕاشکاوی زیاتر و بە نیسبەت شیعرەکەی هۆپ هۆپەوە، تەنزی کەمتری تێدایە:

لالایی مادر:
آمد سحر و موسم کار است، بالام لای
خواب تو دگر باعث عار است، بالام لای
لای لای، بالا لای لای
لای لای، بالا لای لای
ننگ است که مردم همه در کار و تودر خواب
اقبال وطن بسته به کار است، بالام لای
بر خیز و سوی مدرسه بشتاب
خاک تن آباء تو با خون شهیدان
برگ تو از آن خاک حصار است، بالام لای
گردیده غمین مادر ایران
تو کودک ایرانی و ایران وطن تست
جان را، تن بی عیب بکار است، بالام لای
تو جانی و ایران چو تن تست
بر خیز سلحشور،تو در حفظ وطن کوش
ای تازه گل، ایران زچه خوار است؟ بالام لای
پس جامه عزت به بدن پوش
جای تو، نه گهواره بود، جای تو زین است
ای شیر پسر! وقت شکار است، بالام لای
بر خیز که دشمن به کمین است
نگذار وطن قسمت اغیار بگردد
با آنکه وطن را چو تو یار است، بالام لای
ناموس وطن خوار بگرد.(آرین پور، یحیی، ۲، ۱۷۱)

**(۴) له فۆرم و قالْب گرنگتر، ناوەرۆکی شیعری لاهووتییه و وا هەیه ئەو بابەته نوێیانەی وا ئەو هێنایه ناو شیعری فارسییەوە گەلێك گرنگتر بن له گۆڕینی فۆرم. هەموو ئەوانەی وا شیعری لاهووتییان هەڵسەنگاندوه لەسەر یەك شت هاودەنگن: لاهووتی، یەکەم شاعیری چینی کرێکاری ئێرانه (بڕوانه: ارین پور، یحیی، از صبا تا نیما، ۲، ۱۷۱).**

دیاره بێعەداڵەتی و نابەرابەری و لەقاودانی زاڵم و لایەنگریی مەزڵوومان بە درێژایی مێژوو، لە ئەدەبی گەلاندا هەبوە و هەتا جیاوازی چینایەتی هەبێت، ئەو هەست و بیرە لە ئەدەب و هونەریشدا وەك سیاسەت، خۆ دەنوێنێت. بەڵام ئەوەی لاهووتی کردی نەك عەداڵەتخوازییەکی بێ‌ئامانج یاخود گلەیی و گازندەیەکی پاسیڤ، بەڵکوو خەباتێکی چالاکانە و بێ‌وچان بۆ سەروەری و سەرفرازی چینی کرێکار بوو. ئەم بیرۆکەیە، لە سەردەمی شۆڕشی ١٩٠٥ی رووسیا و بەتایبەت دوای شۆڕشی ئوکتۆبری ١٩١٧، لەناو کۆمەڵانی گەلانی ئێران و بەتایبەت رووناکبیرانیدا زەق بۆتەوە و، لاهووتیش یەك لەو هەستیارانە بووە کە پەیامی خەبات لەپێناو چینی کرێکاری وەرگرتوە و لە شیعرەکانیدا دەری‌خستووە. ئەو شیعرانەی وا بۆ داکۆکی لە چینی کرێکار و ئاوات خواستنی دواڕۆژی کرێکاریان گوتوویەتی بەشی زۆری دیوانە ٩٠٥ لاپەڕەییەکەی داگرتووە.

ئەوانەی خوارەوە نموونەیەکی کەمی ئەو هەڵوێستە سیاسی کۆمەڵایەتییەن:

گفتم میان خلق کە: خلاق دهر کیست؟
گردن کشید کارگری زان میان کە: من!

گر آنکە در بسیط زمین کارگر نبود،
دنیا نبود و علم نبود و هنر نبود

کارگر هائیم دنیا را بپا ما میکنیم
هر چە را بینی در این دنیا، بجا ما میکنیم

مبارزه، شرف و کار، افتخار من است
نجات فعله و محو ستم شعار من است

لیک من گویم: بدون فعله ویران میشود
لندن و پاریس و برلن، بصره و بغدادهم

فعله، که داده است تخت و تاج به شاهان
کفش به پا و به سر، کلاه ندارد

دو دست فعله، خدای وی است و زحمت، دین
بســـــاط خاک و بســـــیط زمین بود و طنش

**لایەنگری کردنی کرێکار، جیاواز نییە لە پشتگیری کردنی وەرزێر.**

**بەشێکی زۆری شیعرەکانی لاهووتی تەرخانی داکۆکی کردن لە وەرزێر و گوندنشینی چەوساوە کراون:**

داس ارکشد که گردن سلطان همی زنم
اول کسی که در پی دهقان رفتد، منم
من دست از حمایت دهقان چسان کشم؟
چون پرورش به نعمت او یافته، تنم

دانش ای دهقان اثر دارد، نمیدانی مگر؟
معرفت طعم شکر دارد، نمیدانی مگر؟

خان را شراب سرخ به جام و ز فرط جوع
ریزد زدیده دختر دهقانی آب سرخ

زارعان چند جو مفت به هر خر بدهند؟
حاصل کشتهء خود را به توانگر بدهند

**بۆ لاهووتی وەك شاعیری چینی کرێکار، زەحمەتکێشان و چەوساوانی توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگاش گرنگایەتی تایبەتیان هەیەو دەبێ هاوخەبات و هاومەتەرێزی کرێکاران دژ بە چەوسێنەرانی هاوبەشی خۆیان بن، هەر بۆیەشە، کە لاهووتی گەلێك جار کرێکار لە وەرزێر و چەوساوانی تر جیاناکاتەوەو دڵی لای هەموو "رەنجبەر"ێکە:**

جانم فدای رنجبر انقلاب کن
با پتک و داس کاخ ستم را خراب کن

باعث آبادی عالم توئی
رنجبرا! معنی آدم توئی!

باغ جهان بی وجود فعله و دهقان
میوه که سهل است، یک گیاه ندارد

هر که را دیدم برای نفع شخصی میدوید
پشت پا جز فعله و دهقان به خشک و تر زدم

من کارگر، تو دهقان، داد از تو، آه از من
تا چند برند اشراف کفش از تو کلاه از من؟

اگر از کیش لاهوتی بپرسی،
نجات فعله و دهقان پرستد

صنف زحمتکش اگر خواهد شود نایل به فتح،
انهدام مسجد و دربار در کار است و بس.

بەشی زۆری ئەو هەڵوێست گرتنانە، ئاوێنەی باڵانوێنی جیهانی سەردەمی دوای شۆڕشی ئوکتۆبر و ئەو هیوا قورس و قایمەن کە بۆ گۆڕانی هەموو نیزامی سەرمایەداری پەیدا ببوو. کومۆنیستی خاوەن بڕوای ئەودەم لانی کەم لە وڵاتانی جیهانی سێهەم و لەناو چەوساوە و هەژاراندا چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کە یەکسانی و بەرانبەری و ماف و داد، باڵ بەسەر هەموو جیهاندا بکێشێ و چەوسانەوە و بێبەشی بۆ هەمیشە لەسەر رووی زەوی نەمێنێ. ئەو ئاواتە، زۆریش دووری نەدەنواند لەبەرئەوەی بە ماوەیەکی نە زۆر دوای شۆڕشی ئوکتۆبر، سیستەمی سوسیالیستی لە چەندین وڵاتی ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقا دامەزرا و تەنانەت کووبای بن گوێی ئەمریکاش بوو بە وڵاتی خەبات و کار و سوسیالیزم. بەڵام ناتەواوی و تەنگوچەڵەمەی ناوخۆ و زەختی بێئەمانی لاوەکی، کارێکی وای کرد کە "سوسیالیزمی مەوجود" لەناو خۆیدا گنخا و پاشان بە پڵتۆکێکی"گلاسنۆست"ی گورباچۆف بەلادا هات، ئینجا، وڵاتانی دیکەی سوسیالیستی ئەورووپاش بە پەلە پەل کەوتنە شوێنی "سوسیالیزمی دایك" و بێسێودوو، هەموو سیستەمەکە و کەرامەتی خۆیان لەناو سەرابی سەرمایەداریدا تواندەوە.

بەڵام لە سەردەمی لاهووتیدا، حیسابەکان بە شێوەیەکی تر بوون. هیوای هەموان ئەوە بوو لە رێگەی پەرەسەندنی سیستەمی سوسیالیستیەوە ئاسەوارەکانی بێعەداڵەتی و چەوسانەوە بفەوتێن و هەموو ئەو ئەنستیتۆتە کۆمەڵایەتی ئابووری سیاسییانەی وا پەسندی چەوسانەوەی کۆمەڵانی خەڵکیان دەکرد یەكلەدوایەك

دەرگایان دابخرێت و لە گۆڕەپانی ژیانی کۆمەڵایەتی بخرێنە دەرەوە. یەك لەو ئەنستیتۆتە بنەڕەتی و سەرەکیانە، ئایین بوو. بەگوێرەی مارکسیسم، ئایین تلیاکی کۆمەڵانی گەلە و توانای خەبات بۆ دوارۆژی گەشەداریان لێ دەستێنێت. ئەم ئەسڵە لە سەردەمی لێنین واتە دوای سەرکەوتنی شۆڕشیش هەر ئەسڵێکی باوەڕپێکراو بوو، بەڵام تێکەڵاو بە توندوتیژی و توندڕەوی نەببوو. سەردەمی ستالین، بە پێچەوانە، سەردەمی زەبروزەنگ و لێدانی ئایین و ئیمانداران بوو. زۆرێك لە تەکیە و مزگەوتەکان رووخێنران یاخود بوونە عەمباری گەنم یا شوێنی شۆڕای شار و دێ.

بەشێکی بەرچاو لە شیعرەکانی لاهووتی لەو سەردەمەدا، ئاوێنە و رەنگدەرەوەی ئەو هەڵوێست و بۆچوونەن. (بەشێکی شیعرەکانی "لاهووتی" هەڵوێستی زۆر توندیان تێدا بەرامبەر بە دین نوێنراوە، پێویست نەبینرا بە نموونە بهێنرێنەوە).

لەمەڕ شا و دەربار و دیوەخانی شاییش لاهووتی هەڵوێستێکی هاوچەشن دەگرێت و شا بە نوێنەری سەرمایە و بەڕێوەبەری کاری چەوسانەوەی زەحمەتکێشان دەزانێت. لە راستیدا، لاهووتی لە رێگەی شاو دەربارەوە، ماکی چەوسانەوە واتە سەرمایەداری دەداتە بەر تیغی تیژی هێرش وەك چۆن هێرش دەکاتە سەر ئایین و ئەویش بە دارەدەستی دەوڵەتی چینایەتی دەزانێت:

- باده بنوش ای مقیم کشور شورا
شادی ملکی که شیخ و شاه ندارد

- من و آنزمان که کشان کشان، به یتیم های ستمکشان
شه و شیخ را بدهم نشان، که ستمگران شما، هلا !

- شه مست و شحنه راهزن و شیخ، رشوه خوار
دیگر که مدعی است که ایران خراب نیست؟

بر گردن ما بسته است تا رشته موهومات
کی دست کشد هیهات، شیخ از تو و شاه از من؟

**وەك گوتم، لاهووتی دژ کاری هەموو نابەرابەرییەك و داشداری هەموو چەوساوەیەکە.**

**لە کۆمەڵگای چینایەتیدا، ژنان زیاترین زوڵمیان لێکراوە و چەوسانەوەی ژن هەمیشە دووقاتی پیاوبووە. خەبات لە رێگەی سەربەستی و ماف وەدەست هێنانی ژنان لە هەموو شوێنێکی دیوانی لاهووتیدا بەرچاوە و زۆر جار ئەو مافخوازییە، خۆی لە دژایەتیکردنی چارشێو و رووبەندە و نەخوێندەواریی ژناندا دەدۆزێتەوە:**

پس کی تو این نقاب ز رخ دور میکنی -
کی ترک این اسارت منفور میکنی ؟
با مرد همسری تو، کی این حق خویشرا
ثابت به آن ستمگر مغرور میکنی ؟
ای پادشاه پارس در این عصر روشنی
زن را به تیرگی ز چه مجبور میکنی ؟
تف بر سلیقه تو که در چادر سیاه
زنهای زنده را همه درگور میکنی!

- بر خیز ز خواب ای صنم شرق
بر خیز و بیا کن علم شرق

- من از امروز زحسن تو بریدم سروکار
گو به دیوانگیم خلق نمایند قرار

- زین بیش این نقاب سیه را به رو مکن !
مارا میان جامعه بی آبرو مکن !

- ترک چادر کن و مکتب برو و درس بخوان !
شاخه جهل ندارد ثمری جز ادبار

- با آنکه در شریعت خوبان حجاب نیست
یار مرا برای چه شرم از حجاب نیست ؟

- لاهوتیا ! بگوی بمن دختران پارس
کی این نقاب ننگ ز رخساره وا کنند ؟

- هرجا ز حسن روی تو در گفتگو شدم
بحث از نقابت آمد و بی‌آبرو شدم

- زمن بشنو کمی گر شرم داری
زن خود را که ناموست شماری،
اگر پوشیده میداری، چه دانند
که تو ناموس داری یا نداری !

**زمانی لاهووتی وەك شمشیرەكەی تیژە و رەخنەكانی هەموو شتێك وێران دەكەن.**

**ئەم زمانە تیژە هەندێ جار لە جادەی قسە و رەخنە و توورەیی دەردەچێت و لە بیچمی جنێو و سووكایەتیدا خۆ دەنوێنی. هەر كەس بكەوێتە بەر تیغی زمانی لاهووتی، تێدا دەچێ و نامێنێ !**

**بەڵام هەر ئەو توندوتیژی نواندنە دەڵێی بەشێکە لە کەسایەتی لاهووتی و، کاتێکیش مەسەلەی بڕوا و ئایدیۆلۆجی دێتە کایەوە، بەتایبەت لە سەردەمی کوشتوبڕ و لێدانی ناحەزان لە سۆڤیەتی ستالینیدا، ئیتر دەبێتە تیغی دوو دەم و بەم شێوانە خۆی دەنوێنێ:**

- کو انقلاب سرخ که دارای بی شرف
بالا به پیش توده زحمت دو تا کند؟

- قربان آندمی که ز خون توانگران
دریای انقلاب شود پر حباب سرخ
نازم به آن که به نیروی پتک و داس
ملت بنهد به گردن ظالم طناب سرخ

- ز بعد مردن، دیدی ار زمینی را
که شعله خیزد از آنجا، بدان مزار من است

بگو به توده ایران که ترک شکوه کند
جواب ظلم، فقط آبداده شمشیر است

- گوئید ز من ستمگران را
گوئید وداع ما در انرا...
ای پنجه انتقام بفشار
حلقوم فساد مهتران را

- ای خوش آنروزی که دنیا را درون خون ببینم
این فضا را خون و گردون را در آن وارون ببینم
این جهان بستان زشتان است، اینجا چون بمانم؟
این زمین زندان نیکان است، این را چون نبینم؟

دهر، ناکس، چرخ خائن، خلق نادان، دوست دشمن
چون بمانم، چون بخواهم، چون بسازم چون ببینم؟
کاشـــکی لاهــوتی اندر این دو روز زندگانی
یا نبینم این جهان را یا ز خون گلگون ببینم

- داس ارکشد که گردن سلطان همی زنم
اول کسی که در پی دهقان رفتد، منم.

- چون ز راه ظلم بر زحمتکشان، دارا شدند
ملک داران را بروی دار می بایست کرد !
- تفو به غیرت آن بی‌حقوق بی‌ناموس
که بعد این همه زشتی پناه برد به روس

## خۆشەویستی وڵاتی سۆڤیەت و ڕێبەرەکانی:

ئەگەر لاهووتی لەگەڵ ناحەزانی باوەڕەکەیدا بە توندوتیژی دەبزوێتەوە، لەگەڵ هاوبیر و هاو"فیرقە"و هاومەسلەك و ڕێبەرانی کۆمۆنیستی جیهان، بەتایبەت سۆڤیەت، ئەوپەڕی ڕێز و ئیحترامی هەیە. دیوانی لاهووتی دارماڵی شیعری ڕێزگرتن و پێداهەڵگوتنی قارەمانانی سیستەمی سوسیالیستی لە سۆڤیەت و بەشەکانی دیکەی جیهانە: لێنین ستالین، قارەمانانی کاری سوسیالیستی، داکۆکیکەرانی لێنینگراد دژ بە هێرشی فاشیسمی ئاڵمانیا، شاعیرێکی بیلۆرووس، پارتیزانێکی رووس، نووسەرێکی ئازەری، شاعیرێکی ئوزبەك، نووسەرێکی تاجیك و کەسانی تره. ئەگەر زۆربەی ئەو شیعرانە بۆ ناوخۆی سۆڤیەت گوتراون، گەلی کۆریا و خەڵکی ئیسپانیا و تەنانەت

فەرەنسا و ئەمریکاش کە دژ بە چەوسانەوە و"سەرمایە"دەوەستن و شەڕ دەکەن، لە شیعری لاهووتیدا شوێنی تایبەتیان هەیە. ئەم چەشنە شیعرانە ژمارەیان لە دیوانی لاهووتیدا ئەوەندە زۆرە، کە پێویست بە ناوبردن و نموونە هێنانەوە ناکات.

یەك لە جوانترینیان وا هەیە شیعری "يك دسته گل به قبر لنين" بێت کە وەك دواتر دەگوترێ دوور نییە سەرچاوەی شیعرە ناودارەکەی مامۆستا هەژاری خۆمان (بەرەو موکریان) بووبێت (ل ٣٢٣ی دیوان).

## خۆشەویستی ئێران:

ئێران وەك نیشتمان و وەك شوێنی خەبات لە شیعری لاهووتیدا شوێنی تایبەتی هەیە. نەك هەر شیعرەکانی سەردەمی ژیان لە ئێران، بەڵکوو شیعری سەردەمی ژیان لە خاکی سۆڤیەتیشی دارماڵی هەستی خۆشەویستی ئێرانن. کرێکار، وەرزێر، رەنجبەر و خەباتکارانی ئێران لە شیعری لاهووتیدا رێزی تەواویان لێگیراوە، ژنی ماف خوراوی ئێرانی بەرەو سەندنی مافی خۆی هان دراوە، گەلانی ئێران بە فارس و کورد و تورکەوە داوایان لێکراوە هاوشان و هاودەنگ دژ بە چەوسێنەر و داگیر کەر و سەرمایەداری بێگانە و خۆیی خەبات بکەن، شۆڕشگێڕ و خەباتکاری سیاسی ئێران رێزیان لێ گیراوە و بەشان و باڵیاندا هەڵگوتراوە.

ئێران لە هیچ قۆناغێکی ژیانی لاهووتیدا، لە بیر و هۆشی نەچۆتە دەرەوە و تەنانەت لە مەنفای عوسمانی و نیشتمانی دووهەمی شاعیر واتە خاکی سۆڤیەتیش ئەم هەستی خۆشەویستیە نەك تەنیا هەر

ماوەتەوە بەڵکوو تێکەڵاوی نۆستالژییەکی خەست بووە و لاهووتی بۆتە بولبولێکی عاشق کە دوور لە باخچەی وڵاتەکەی شیعری بە سۆز و هەندێ جار سووتێنەری بۆ گوتووە، بەڵام ئەم هەست و عاتیفە ناسکە هەرگیز نەیتوانیوە مەیدان بە بیر و بڕوای سیاسی چۆڵ بکات و ئێران بۆ شاعیر نەك هەر باخچەی گوڵ و ڕێحان، بەڵکوو گۆڕەپانی خەبات و چالاکی سیاسی ماوەتەوە.

## کرماشان لە شیعری لاهووتیدا:

بە گوێرەی بیرەوەری هەندێ کەس کە لاهووتییان لە سۆڤیەت بینیوە، لاهووتی بە خەم و یادی کۆڵانەکانی کرماشانەوە سووتاوە و هەوڵی زۆری داوە ئیجازەی پێ بدەن سەردانێکی ئێران و کرماشان بکاتەوە (بۆ نموونە، بیرەوەرییەکانی ئەنوەر خامەیی کە پێشتر باسی لێوە کرا).

بەڵام ئەم خۆشەویستیە لە شیعری لاهووتیدا ڕەنگی نەداوەتەوە و کرماشان هەرگیز شوێنێکی گرنگی لە شیعری شاعیردا پێ نەبەخشراوە. ئەوەندەی من سەرنجی دیوانی شیعری لاهووتیم دابێت، لە چوار شوێندا ناوی کرماشان هاتووە، کە یەکیان شیعرێکە بۆ ماکسیم گورگی گوتراوە و بە "تەمسیل"ێك دەستی پێ کردووە کە دەڵێ لە منداڵیدا لە بازاڕی کرماشان شێرێکم چاوپێکەوت لەگەڵ شێرەوان واتە خاوەنەکەی، و ئیتر باسەکە دەباتە سەر سەرمایەداری و مەسەلەی کرماشان هەر بەوەندە تەواو دەبێت (بە ماکسیم گورگی، ل ١٨٢ ی دیوان).

شیعرەکانی تریش بە هەمان شێوە، ناوهێنانێکی ساکاری کرماشان یاخود یادی شەڕی مەشرووتەخوازین لەوێ و هەڵگری هیچ چەشنە هەست

یا بۆچوونێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی تر نین. ئەم شیعرانە لە لاپەڕە ۳۵۰، ۳۷۲، و ۵۶۲ی دیوانی لاهووتیدا هاتوون.

## لاهووتی، وەك باوكی شیعری نوێی فارسی:

وەك گوتمان، گەرای گۆڕان و نوێکردنەوە و هانینی شێوازی نوێ هەر لە سەرەتای شاعیرییەوە لە مێشکی لاهووتیدا گوروا بوو و ئەویش بە هۆی ناسیاوی لەگەڵ شیعری فۆلکلۆری و گۆرانی کوردییەوە، بەڵام دەرکەوتنی شیعری نوێ بە واتای وەلانان و فڕێ دانی ئێجگاری سەروا و کێش، هی سەردەمێکە کە لە سۆڤیەت لەگەڵ شیعری مایاکۆفسکی و شاعیرانی تر، هەروەها لە ڕێگەی زمانی فەرەنسییەوە لەگەڵ شاعیرانی ئەورووپای ڕۆژئاوا ناسیاویی پەیدا کرد. لاهووتی بۆ هەمیشە وەك شاعیرێکی "زوالحیاتین" مایەوە واتە هەرگیز شیعری عەرووزی بە تەواوەتی بەجێنەهێشت و هاوکات لە هەردوو بواری کلاسیك و نوێدا ئیشی کرد. تایبەتمەندیی لاهووتی لەوەدایە کە هەر لەو ساڵ و مانگەدا وا شیعرێکی نوێی نووسیوەن هەڵبەستێکی عەرووزیشی هۆندۆتەوە و هیچکامیانی نەکردۆتە فیدای ئەوی تر. باسی شیعرە عەرووزییەکانمان لە لاپەڕەکانی پێشوودا کرد. سەبارەت بە شیعری نوێی لاهووتیش پێویستە ئەم خاڵانە دەست نیشان بکرێن:

۱. زۆربەی هەرە زۆریان لە ماوەی ژیانی سۆڤیەتی لاهووتیدا گوتراون، واتە دوای ئەوەی شاعیر لەگەڵ زمانی رووسی و شاعیرانی رووس ناسیاو دەبێت. دیارە پێشتریش لاهووتی زمانی فەرەنسی دەزانی.

بەڵام ئەو زمان زانینە دووراو دوورە، شوێنێکی ئەوتۆی لەسەر کارە ئەدەبییەکانی دانەنا. بە پێچەوانەوە، هەر لە سەرەتاکانی ژیانی

سۆڤیەتەوە شیعری نوێ بووە بە بەشێك لە كاری لاهووتی. بۆ نموونە، شیعری "اتاق من"ی لە مانگی ئۆگوستی ١٩٢٣ دا گوتووە، كە بەگوێرەی ژیننامەكەی ، تازە گەیشتبووە مۆسكۆ و تەنیا ساڵ و نیوێك بەسەر تەئریخی بە جێ هێشتنی ئێرانیدا تێپەڕ ببوو:

منزلم، در طویله کهنه (وەرگێڕاوی ناوی كۆڵانێكی مۆسكۆیە)
جنب آرباط، خانه سی و هفت
مرتبه پنج، اطاق نمره هشت
سابقا بوده میهمانخانه

**(ل ٦٥٤ی دیوان)**

**ئەم شیعرەشی چوار مانگ دوای ئەو، لە مانگی دیسەمبری ١٩٢٣دا گوتووە:**

ما، زمین را کنیم خون
تاج و تخت شهرا سازیم نگون
ماو دهقانی با داس و کوبک
شاه و یارانش را سازیم زبون
بگذار تا سپاه سرخ
به شاه نو کند هجوم
و ما با دست پر پینهء خود
یکسر می تازیم
ویران می سازیم
آخرین اردوی استبداد

**(سپاه سرخ (ترانه)، ل٦٦٣ی دیوان).**

شیعری نوێی لاهووتی سەرەتا نە ئەو قورس و قایمی و ڕێکوپێکییەی شیعرە عەرووزییەکانی هەبوو، نە وەك ئەوان دەیتوانی بچێتە ناو دڵی خەڵکەوە. بەڵام یەك لەو شیعرە نوێیانە، چارەنووسی لە مردن نزیکی شیعرە نوێکانی لاهووتی گۆڕی و پەسندی زۆری خوێنەرانی بۆ هانی، ئەویش شیعری "وحدت و تشکیلات"بوو کە بۆ ماوەیەکی زۆر ویردی سەر زمانی خەباتکاران و زیندانیان و چالاکانی سیاسی باڵی چەپ بوو. بە بڕوای من، ئەم شیعرە نەك هەر شیعری نوێی لاهووتی بەڵکوو شیعری نوێی فارسی تا ڕادەیەکی زۆر بردە پێشێ و "قەبووڵی خاتر"ی کۆمەڵانی خەڵکی بۆ پێك هێنا:

سر و ریشی نتراشیده و رخساری زرد
زرد و باریک، چونی
سفره ای کرده حمایل، پتوئی بر سر دوش
ژنده ای بر تن وی.
کهنه پیچیده به پا، چونکه ندارد پا پوش.
در سر جادهء ری
چند قزاق سوار، از پیش آلوده به گرد
دستها بسته ز پس، پای پیاده، بیمار
که رود آنهمه راه؟
مگر آن مرد قوی همت صاحب مسلک
که شناسد ره و چاه
خسته بد، گرسنه بد، لیک نمی خواست کمک
نه ز شیخ و نه ز شاه
بجز از فعله و دهقان، نه بفکر دیار.....

(مۆسکۆ، فیبرەوەری ١٩٢٤، ل ٣٦١ی دیوان).

شیعره نوێیەکانی دواتریش هەمان تایبەتمەندی شیعری سەرەوەیان بوو واتە بەگشتی ناوەرۆکی سیاسییان هەبوو و بۆ بارودۆخی سۆڤیەت، هەندێ جاریش سەبارەت بە ئێران گوترا بوون. ناوەرۆك و بابەت هەرچی بێت، فۆڕمەکە لە شیعری نوێی رووس وەرگیرابوو و کەرەسەی کارەکەش هەر هی ئەوان بوو: وشەو عیبارەت و ناو و بۆنە و رووداوەکان زۆربەیان هی سۆڤیەتن و خوێنەری کەم شارەزاش بە سەیر کردنی دیوانەکە دەتوانێ بزانێ ئەم شیعرانە لە سۆڤیەت گوتراون و لە پێوەندی ژیان و رووداوەکانی ئەوێدان: [ ]؛

شیعری "پیروزی پارتیزان دختر" (ل ٤٠١ی دیوان) بۆ یادی "نرۆیا کاسمود میانسکایا" نووسراوە، کە بەشداریی شەڕی فاشیستەکانی ئاڵمانی کردبوو؛ "اعلامیه" (٤٣٩ی دیوان) باسی خەباتکارێکی منداڵ دەکات کە نامەی شۆڕشگێڕان رادەگوێزێت؛ شیعری "اتحاد ما" (٤٦٥)، "پلید" (٤٧٨)، "دوستان به پیش" (٥٦٩)و گەلێکی تر ئەو شیعرە نوێیانەن وا لاهووتی لەمەڕ دیاردەکانی ژیانی سۆڤیەتی گوتوون و شیعری "رزم و پیروزی" (٤٤٥)، "کودکان قالیباف ایران" (٤٤٩)، "جادو" (٤٥٨)، "شبیخون"(٥٣٠)، بەشێکن لە شیعری نوێی لاهووتی سەبارەت بە ئێران و لەمەڕ رووداوەکانی ئێران. جگە لەوانە ، بەشێکی تر لە شیعری نوێی سەردەمی ژیانی سۆڤیەتی لاهووتی، سەبارەت بە گەلی کۆریا، لاتیش (ستۆنی، لیتوانی و لیتۆنی)، ئازەربایجان، تاجیکستان، ئوزبەکستان و ....... گوتراون بەڵام بە درێژایی هەموو دیوانەکەی، هیچ شیعرێك پێشکەش بە گەلەکەی خۆی کورد، نەکراوە و نەك هەر شیعری پێشکەش نەکردوون، بەڵکوو وەك لە

بەشی پاشکۆدا دەبینرێت، وتارێکی لەسەر بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد نووسیوە (١٩٢٣)، کە هیچ دوژمنێك لەوە چاکتری نانووسێت !

ناوی کورد چەند جارێك لە شیعرەکانی لاهووتیدا هاتوون و هەر هەموویان کاتێکن کە ناوی گەلانی تری ئێران دەهێنێ و داوای یەکگرتنیان لێ دەکات، ئیتر باسی ماف و خەبات و خواستی گەلی کورد ناکات، هەرگیز !

من لە سێ شوێنی کتێبەکەدا چاوم بە ناوی کورد کەوتووە کە بریتین لە لاپەڕە ٥٥٣، ٥٤٤، ٦٠١، جارێکیش ناوی شاری سنە (سنندج) دەهێنێت (٣٧٢).وا هەیە لە شوێنی دیکەشدا ناوی کورد هەبێت بەڵام بەگشتی جگە لە بانگەوازی یەکگرتن لەگەڵ گەلانی تری ئێران، هیچ پەیامێك لە شیعرەکاندا بۆ کورد نییە:

ای شیران ترک، ای گردان کرد
ای مردان فارس از بزرگ و خرد
دست به دست داده، از این ره روید
از این ره روید و پیروز شوید

(شیعری "به خلقهای ایران" ١٩٥٠، ل٥٤٤ی دیوان )

بەکورتی، هەرگیز کوردستان یا کرماشان لە شیعری لاهووتیدا شوێنێکی تایبەتیان نەبوە. وەك پێشتر باس کرا، بیرەوەرییەکان وا دەگەیێنن کە لاهووتی نۆستالژی و خەمی سەردەمی ژیانی کرماشانی لە هەموو ماوەی ژیانی سۆڤیەتدا هەبوە و، تەنانەت ویستوویەتی بەسەردان بگەڕێتەوە بۆ ئێران بەڵام کار بەدەستانی سۆڤیەت ئیجازەیان پێ نەداوە.

لام وایە ئەو نۆستالژییە لە هەستێك و عاتیفەیەکی خۆش ویستنی ماڵ و کەس‌وکار و شوێنی ژیان تێپەڕی نەکردووە و نەبۆتە ماتریاڵێکی سیاسی، بەتایبەت لە پێوەندی کێشەی گەلی کورددا.

## شیعری ئاینی:

لاهووتی لە قۆناغێکی ژیانی خۆیدا لە کرماشان، خاوەن ئیمانی ئایینی و فەقێ ودەرویش بوو. ئاشکرایە شیعری ئەو سەدەمانەی مۆرکی ئەو باوەڕ و ئایدیۆلۆجییەی پێوە بێت. نزیك بە هەمووی ئەم شیعرانەش لە دیوانەکەی چاپی ئەحمەد بەشیریدا گردوکۆ کراون. نموونەیەکی شیعری ئایینی لاهووتی تەرکیببەندی "تەوحیدە" کە ١٢ لاپەڕەی کتێبەکەی گرتۆتە بەر. بە داخەوە هیچکام لەم شیعرانە تەئریخیان بۆ نەنووسراوە .

توحید:
کن تماشا به چشم وجدانی
آنچه را ببینی و نمیدانی....
شمس توحید عالم آرا شد
آنچه در پرده بود پیدا شد....(ل ٧١٩)

محمد:
عرش خدا در شب وصال محمد
کسب شرف کرد از نعال محمد (ل ٧٣٢)

علی:
ای همه خوبان جهان عاشقت
صبح، نسیم نفس صادقت...

من به توام عاشق دلباخته
واله آنم که تو را ساخته (ترکیب بند، ل ۷۳۴)

حسین:
ای عزیز مصطفی، دست من و دامان تو!
نور چشم مرتضی، دست من و دامان تو! (ل ۷۴۵)

**ئەم شیعرانە، گەلێك زۆرن و ۹۹ لاپەڕەی کتێبەکەیان گرتۆتەوە (۷۱۹ تا ۸۸۰).**

**بابەتەکانیان ئایینی، سۆڤیانە و دەروێشین. وا هەیە دوای وەرچەرخانی ئایدیۆلۆجیك بەرەو لایەنێکی تەواو جیاواز، لاهووتی بە گوتنی ئەو شیعرانە خۆشحاڵ نەبووبێت و دواتر هەوڵی بڵاوکردنەوەی نەدابێتن، بەڵام بۆ کەسانێك کە لەسەر کەسایەتی لاهووتی وقۆناغەکانی ژیانی ئیش دەکەن گەلێك بەکەڵکن و پێویستە بە وردی بخوێنرێنەوە.**

## چەشنایەتی شیعرەکانی:

**شیعرەکانی لاهووتی خاوەنی کیشن بەڵام نائاسایی و جیاواز لە بەحرە عەرووزییەکان.**

**ئەوانەش وا کێشیان نییە، ڕێك و پێکییەکیان تێدایە کە جێگەی کێشی گرتۆتەوە، بۆ نموونە بەسەروا یاخود "ڕەدیف"ێك پێکەوە بەستراونەتەوە. لاهووتی شیعری ڕەها و سپی گەلێك کەمن و، ئەوانەی وا هەن زیاتر تەرجەمەی شیعری ڕووسین وشوێنی شاعیرانی ڕووس وەك مایاکۆفسکی یان پێوەدیارە.**

شیعرە عەرووزییەکان زۆربەی هەرە زۆریان غەزەلن. چەند "مەسنەوی"یەك لەناویاندا هەن. پێنج خشتەکی و "موستەزاد"یش لە شیعرەکاندا بەرچاو دەکەون کە ئەم موستەزادە خۆی ئالقەیەکی پێوەندیدەرە لەنێوان شیعری کۆن و بڕگەییدا. موستەزاد لە شیعری سەردەمی مەشرووتەی ئێراندا جێگەی تایبەتی هەیە و بۆ دەربڕینی چەمکی نوێ، توانا و مەودای لە بەحرە چوارەچێوەدارە کلاسیکەکان زیاترە.

## تەئسیر هەلگرتن لە شاعیرانی پێش خۆی :

ئەم بوارە کاری زۆری دەوێ و پێویستی بە بەراوردکاری و بەرانبەر دانانی یەك یەکی شیعرەکانی لەگەلْ شیعری شاعیرانی پێش خۆیەتی. شوێنی شاعیرانی فارس و پێش هەموان، سەعدی، حافز، فیردەوسی، خاقانی، و نیزامی بەسەر شیعری لاهووتییەوە دیارە. خۆشەویستی فیردەوسی و "شاهنامە" لەلای لاهووتی لە دوو ڕێگەوە دەردەکەوێت: یەکەم وەرگێڕانی شاهنامە بۆ سەر زمانی رووسی بە یارمەتی "خاتوو ستاریکۆف"ی هاوسەری ودووهەم نووسینی ئۆپێڕای کاوەی ئاسنگەر. لە بەشەکانی پێشوودا نموونەی چەند شیعری لاهوتیم خستە بەرچاو کە شوێنی راستەوخۆی شاعیرانی فارسی وێژی پێش خۆی بەسەریانەوە دیار بوو. جگە لە شاعیرانی کلاسیکی فارسی، باسی "نسیم شمال" واتە ئەشرەفەددینی گێلانیش کرا کە شاعیری هاوچەرخی خۆی بوو و شوێنی لەسەر شیعری لاهووتی دیارە. هەروەها لای کەم لە شیعرێکدا لاسایی ایرج میرزای کردۆتەوە (ئاریەن پوور، یەحیا، ١٩٧٨، ٢، ٤١٨).

شاعیرانی تورك وئازەربایجانیش لەسەر لاهووتی بێ تەئسیر نەبوون.

نموونەی تەئسیری میرزا علی اکبر صابر (هۆپ هۆپ)، راستەوخۆ یا لە رێگەی نسیم شمالەوە (شیعری "لای لای") بەڵام دۆزینەوەی شوێنی پێی شاعیرانی سەردەمی "فەجری ئاتی" عوسمانی لە شیعری لاهووتیدا پێویستی بە هەڵسەنگاندن وبەراوردکاریی زیاتر هەیە و ئەوەش لە وزەی کەسێکدایە ئەدەبی ئەودەمی عوسمانی بناسێت. هەر چۆنێك بێت لاهووتی ماوەی پێنجساڵێك لە ئەستەموولْ ژیاوە و تورکیشی زانیوە. بە هەمان شێوە، تەئسیری شاعیرانی رووس لەسەر لاهووتی، کارێکە دەبێ بکرێت و روون بکرێتەوە کام شاعیری رووس، چەندی شوێن لەسەر لاهووتی داناوە.

من نەمتوانی نموونە یەك لە تەئسیری شاعیرانی کورد لەسەر لاهووتی بدۆزمەوە.

## تەئسیری لاهووتی لەسەر شاعیرانی ئێران:

شیعری لاهووتی لەسەر شاعیرانی نەوەکانی دوای خۆی شتێکی بێگومانە.ئەم تەئسیرە لە دوو بوار دا بووە: فۆرم و ناوەرۆك. لە بواری فۆرمدا، ئەو رچەیەی لاهووتی شکاندی ، دواتر نیما یوشیج پێیدا رۆیشت و وەك بنیاتنەر و "باوك"ی شیعری فارسی ناسرا، گەرچی بەگوێرەی هەر ئەم دێرانە و شاهیدیی دیوانەکەی، لاهووتی گەلێك شیعری نوێی پێش "افسانە"ی نیما هەبوون و تەنانەت چاپیشی کردبوون. "افسانە" لە ساڵی ١٣٠١ی هەتاوی واتە ١٩٢٢ی زایێنیدا چاپ بووە و ئەو ساڵە وەك ساڵی دەستپێکی شیعری نوێی فارسی لە

ئێراندا دەگیرێتە بەر چاو. بەڵام وەك گوترا، شیعری نوێی لاهووتی بە دەساڵیش پێش ئەوانەی نیما یوشیجن. ئەو مەنعەی وا بە درێژایی رژێمی شا لەسەر شیعری لاهووتی و ناوەکەی بوو، نەك هەر مەیدانی بە توێژێنەران نەدەدا ئیشی لەسەر بکەن، بەڵکوو ئەوانەی وا شارەزای شیعری لاهووتیش بوون نەیاندەتوانی لە کتێب یا چاپەمەنییەکدا ناوی بهێنن. مێژوو لەو چەواشە وهەڵەکارییانەی کەم نین ! بەم پێیە، شاعیرانی نوێخوازی ئێران بە نیما یوشیج خۆیەوە، لەسەر سفرەی لاهووتی دانیشتوون و زانراو یا نەزانراو، رازی یا ناڕازی، وە شوێن رچەی ئەو کەوتوون.

لە باری ناوەرۆکیشەوە شاعیرانی توودەیی و چەپی ئێران وەك "ابوتراب جەلی" و سیاوش کسرایی "و سعید سوڵتانپوور" و گەلێکی دی تەئسیری راستەوخۆی لاهووتییان لەسەرە. بۆ نموونە شیعری بە ناوبانگی سعید سوڵتانپوور بە ناوی "ایران" ، ناو و ناوەرۆك و فۆرمی لە شیعری "ایران"ی لاهووتی وەرگرتوە:

ای صحنهء جنگ و دجله خون!
پیوسته به نفع مفتخواران
خاک تو ز خون گلگون
ای آبده عتیق انسان!

(خوجه ند، جون ١٩٣١، ل ٥٩٣ تا ٦٠٧ی دیوان).

"ایران "یەکێك لە شیعرە بەرزەکانی لاهووتییە و تێیدا دەرسی دامەزرانی سیستەمێکی سوسیالیستی لە گەلان و زەحمەتکێشانی ئێران دەدات. شیعرەکە وەك گوترا، بۆتە سەرچاوەیەك بۆ شیعرێکی بەرزی تر، کە سەعید سوڵتانپوور گوتوویەتی:

ایران!
ایران انقلاب های فراموش!
مغلوب!
خاموش!
ای شیر گرسنه خفته به غوغای آسیا!

**(سلطانپور، سعید، ۱۹۷۹، ل۲٤۰).**

**شیعری "میهن من"ی لاهووتی که پێشکەش به منداڵەکانی خۆی کراوه، هەوێنی شیعری "نقشه جغرافیا"ی هادی خورسەندی شاعیر و نووسەری تەنز نووسی ئێرانه:**

به دقت بشنوید ای نور چشمان:
بود در زیر این گردنده گردون
غنی، مسکین، دیاری نامش ایران....

**(لاهوتی، شیعری "میهن من" ، موسکو ۱۹۴۵، ل ۵۳۶ی دیوان)**

بچه ها! این نقشه جغرافیا است
بچه ها! این قسمت اسمش آسیاست
شکل یک گربه اینجا آشناست
چشم این گربه به دنبال شما است
بچه ها! این گربه هه، ایران ماست.

**(خورسەندی، هادی،شیعری، "ایران"، سایتی ئینترنێتی خورسەندی).**

**خورسەندی که له باری بیرو باوەڕەوه زۆر له لاهووتی نزیکه، له چەند پارچه شیعری دیکەی خۆشیدا لاقی ناوەته جێ پێی لاهووتی. بۆ نموونه:**

ما، ز شیخ و شاه خیلی مشت ها وا کرده ایم
همتی یاران ! که ترسم مشت ما هم وا شود!
یا:
پس چه خواهی کشورت بی شاه و بی ملا شود؟

**(هەمان).**

## تەئسیری ژیان و شیعری لاهووتی لەسەر شاعیرانی کورد:

**تەئسیری لاهووتی لەسەر شاعیرانی کوردی رۆژهەڵات گەلێك بەرچاوە. زۆربەی ئەو کەسانەی وا شوێنیان لە لاهووتی هەڵگرتووە وا هەیە لە باری ئایدیۆلۆجیکییەوە لە لاهووتی جیاواز بن، بەڵام دیاردەی هاوبەش لەنێوان ئەوان ولاهووتیدا، برینین لە: یەکەم رۆحی خەبات و بەربەرەکانی، دووهەم دژایەتی لەگەڵ رژێمی پەهلەوی و سێهەم هەست ناسکی.**

**با باسی نموونەکان بکەین:**

**١. عبدالرحمن زەبیحی:**

جواب سرخ
نوشم به شادمانی آندم شراب سرخ
کز شرق انقلاب دمد آفتاب سرخ....
نازم به آن زمان که به نیروی پتک و داس
ملت نهد به گردن ظالم طناب سرخ
ای خواجه! خون رنجبر امروز کم بریز
فردا حساب از تو کشد انقلاب سرخ

**(لاهووتی، شیعری "جواب سرخ"، باکو، ئاپریلی ١٩٢٢، ل ٨٣ی دیوان)**

ئەم شیعرە بە هەندیێ گۆڕانکارییەوە لەلایەن مامۆستا عەبدولڕەحمانی زەبیحی‌یەوە وەرگەڕاوەتە سەر کوردی و لە ژمارە ١٨ی رۆژنامەی کوردستان، ساڵی یەکەم، ٤ی رەشەمەی ١٣٢٤ (٢٣/ ١٩٤٦/٢) دا بڵاوکراوەتەوەو، لەم دواییانەشدا لە کتێبی "ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی"دا جارێکی دیکە چاپ کراوەتەوە (کەریمی، عەلی، ١٣٣):

**شەرابی سوور**

**بە شای لۆغان دەخۆم ئەودەم شەرابی سوور**
**کە بێتە دەر لە شەرقی ئینقلاب ئافتابی سوور**
**چەند خۆشە ئەو زەمانە بە داژداری چەکچ و داس**
**کوردان بکەن لە گەردنی دوژمن تەنابی سوور**
**مەڕژێنە هێندە خوێنی رەنجبەر ئیمڕۆکە، خان !**
**رۆژیێ حیساب ئەکێشیێ لە تۆ ئینقلابی سوور.....**

**(کەریمی، عەلی، ١٣٢)**

گۆڕانکارییەکانی زەبیحی لە شیعری لاهووتیدا، بریتین لە دوو شت: یەکەم چەمکی کوردایەتی هێناوەتە ناو شیعرەکە و لە دوو شوێن باسی "کوردان " و "کوردە" دەکات کە لە دەقی ئەسڵیدا نین، و دووهەم ئەوەی کە نازناوی خۆی خستۆتە "مەقتەع" (فەردی کۆتایی) غەزەلەکەوە و لە شیعری لاهووتییەوە کردوویەتی بە ماڵی خۆی (دەزانین "بێژەن" نازناوی زەبیحی بوو لەکاتی ئەندامیەتی کۆمەڵەی ژێکافدا).

سەبارەت بە عینوانی شیعرەکە و ئەوەی دیوانی لاهووتی بە ناوی "جواب سرخ"و رۆژنامەی کوردستان بە "شەرابی سوور"یان نووسیوە، لام وایە شیعرەکە وەك زۆر شیعری دیکەی لاهووتی و هەر بەگشتی وەك غەزەلی کوردی و فارسی لە ئەسڵدا عینوانی نەبوە و "بەشیری"خۆی عینوانەکەی بۆ داناوە و بە هەمان شێوەش مامۆستا زەبیحی. دیارە تەرجەمە کوردییەکەی لە چاو دەقی فارسی کەم و کووڕی تێدایە بەڵام دەبێ ئەوەش بگیرێتە بەر چاو، کە زەبیحی شاعیر نەبوە و ئەم شیعرەشی تەنیا لە باری سیاسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر کوردی.

هەر لە پێوەندی مامۆستا زەبیحی و لاهووتیدا، دوکتۆر عزالدین مستەفا رەسووڵ باسی شیعرێکی لاهووتی دەکات کە زەبیحی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و ئەویش پێیدا چۆتەوە:

".....[زەبیحی] دیوانێکی لاهووتی دەست کەوتبوو، ئەبولقاسمی لاهووتی تاجیکستان. ئەو دیوانە، بەتایبەت شتێکی هەیە لەسەر نەورۆز، ئەوەی کرد بە عەرەبی و منیش عەرەبییەکەم چاك کرد، بەڵام ئیتر بڵاونەکرایەوە و نازانم نوسخەکەی چ لێکرد...."

(کەریمی،عەلی،٢٤١).

ئەوەی دوکتۆر عزالدین دەڵێ لاهووتی "شتێکی هەیە لەسەر نەورۆز"، بە بۆچوونی من دەبێ چیرۆکە شیعرە ناسراوەکەی لاهووتی بێت بە ناوی "کاوە ئاهەنگەر" کە دواتر کرایە ئۆپێرا.

دیارە لاهووتی شیعری دیکەشی هەن کە تێیاندا باسی نەورۆزی کردبێت، یەك لەوانە شیعری "نوروزیە"یە کە دەگوترێ لە سالانی

ژیانی خۆی لە ئەستەمووڵدا گوتوویەتی و بەگوێرەی پەراوێزی دیوانی چاپی بەشیری، لە جەژنی نەورۆزی ساڵی ۱۹۲۰ لە باڵوێزخانەی ئێران لە ئەستەمووڵ خوێندوویەتەوە. شیعرەکە دارماڵی هەستی ئێرانیچیەتی و تەنانەت شاپەرەستییە و من بە هیچ شێوەیەك لام وا نییە زەبیحی شیعری ئەوتۆی وەرگێڕابێتە سەر عەرەبی. (نوروزیە، دیوان، ل ٦٦٩). بە پێچەوانە، تارادەیەکی زۆر دڵنیام شیعرەکە دەبێ هەمان چیرۆکە شیعری ناسراوی "کاوە ئاهنگر" بێت. بڕوانە دواتر، بەشی تایبەت بە "کاوەی ئاسنگەر".

۲. قانع:

لە پێوەندی ئەم شیعری "ئینقلاب سرخ"ـەدا دەبێ بڵێم کە شاعیری ناسراوی کورد "قانع" لەژێر تەئسیری ئەو شیعرەدا، پارچە هەڵبەستێکی هۆندۆتەوە کە جگە لە یەك فەردی هیچکام تەرجەمەی شیعرەکەی لاهووتی نین، بەڵام کێش، قافیە و تەنانەت ناوەرۆکی کۆمەڵایەتی سیاسی شیعرەکە، وێچوونیان لەگەڵ شیعری لاهووتی هەیە ولەژێریدا نووسراوە کە دوا فەرد واتە "مەقتەع"ـەکەی وەرگیراو لە شیعرێکی لاهووتییە:

چەکی یەکیەتی :

چەن خۆشە ئەو زەمانە لە کوێستان و خوارو ژوور

فەرقێ نییە لە بەینی برا و خاڵ و خوشك و پوور...

چەن خۆشە ئەو وڵاتە کە جووتیار و رەنجبەران

تیایا ئەبن بە خاوەنی حوکم و سوپای جەسوور
چەن خۆشە ئەو زەمانە کە کوێستان و گەرمیان
یەکسەر ئەبێتە جونبشی دەریای هێزی سوور...
"شادم بە ئەو زەمانە، بە داشداری رنجبەران"
وەرزێر ئەنێتە گەردنی ئاغا گوریسی سوور"
لە دێڕە شیعرێکی لاهوتیەوە وەرگیراوە.

(قانع، دیوان، لاپەڕە ۸۷).

۳. ئاوات:

لە شیعری سید کامل ئیمامی (ئاوات) دا، وا هەیە شوێنی تەئسیری لاهووتی بە باشی هەڵبگیرێت. من تەنیا دوو نموونەی دەهێنمەوە:

شنید ستم غمم را میخوری، اینهم غمی دیگر
دلت بر ماتمم می سوزد، اینهم ماتمی دیگر...
بجان دوست غیر از درد دوری از دیار خود
در این دنیا ندارد جان لاهوتی غمی دیگر

(لاهووتی، شیعری "غم دیگر"، ئەستەمووڵ، جولای ۱۹۱۹، ل ٦٤ی دیوان).

وەکوو بیستم خەمت خواردم ئەویش بۆ من خەمێکی دی
دڵت بۆ ماتمم سووتا، ئەویشم ماتەمێکی دی
"ئیمامی"ت کوشت بە تیری غەمزە، گەرچی چاوتە چارەی
تەماشای گەر بفەرمووی نایەوێ قەت مەڵحەمێکی دی

(ئاوات، شیعری "خەمێکی دی، گەردیگلان، ۱۳۲۰ هەتاوی (۱۹٤۱ی زایینی، ل ۸٦ی دیوان).

لەم شیعرەی خوارەوەشدا، ئاوات هەندێ بە سەربەستی دەجوولێتەوە و واتا و چەمکی جیاواز لە لاهووتی دێنێتە ناو شیعرەکەیەوە بەڵام لە چوارچێوەی گشتیدا بە شیعری لاهووتی وەفادار دەمێنێتەوە.

فقط سوز دلم را در جهان، پروانه میداند
غمم را بلبل آواره از کاشانه میداند....
به امیدی نشستم شکوه خود را به دل گفتم
همی خندد بمن، اینهم مرا دیوانه میداند...
نمیداند کسی کاندرسر زلفش چه خونها شد
و لیکن موبمو، این داستانرا شانه میداند
نصیحتگر! چه می پرسی علاج جان بیمارم
اصول این طبابت را فقط جانانه میداند

(لاهووتی، شیعری "فقت جانانه میداند"، ئەستەموولّ، سپتەمبری ١٩١٨، ل ٦٠ی دیوان).

بە تەنیا گیانەکەم سۆزی دڵم پەروانە دەیزانێ
خەمی دڵ بولبولێکی بێ گوڵ و بێ لانە دەیزانێ
وەها پا بەندی بسکی شێت و پێتم، بێ خەبەر ماوم
لە خۆم و حاڵ و باڵم، حاڵی من دێوانە دەیزانێ
لە رازی بسکی پڕ پێچ و خەمی عالەم سەراسیمەن
دەزانی ئەو تەلەسمە موو بە موو هەرشانە دەیزانێ....
ئیمامی ناوی گەورە و شاری ویرانە کە تێ فکرێ
لە مەعنای شیعرەکانم هەر دڵی وێرانە دەیزانێ.

(ئاوات، شیعری "پەروانە دەیزانێ"، ل ٨٣ی دیوان).

وەك دەبینین، ئاوات گۆرانی بەسەر هەندێ شوێنی شیعرەکەدا هێناوە و ناوی خۆشی خستۆتە کۆتایی شیعرەکەوە و بەم شێوەیە، وەك زەبیحی و قانع ویستوویەتی بیکات بە ملکی خۆی، ئەوەش دیاردەیەکی سەمەرە یاخود کەم و کورتییەك بۆ شاعیرەکان نییە. هونەرمەند وەك هەموو مرۆڤێکی خولقێنەری تر، لە پرۆسەی خولقاندندا شوێن لە دەورووبەری خۆی هەڵدەگرێت و بە هەمان شێوە، شوێنیش دادەنێت.

٤. هەژار:

_ مامۆستا هەژاری موکریانیش لەو شاعیرانەی رۆژهەلاتی کوردستانە کە شوێنی لاهووتی هەڵگرتوە و ئەگەر سەیری دیوانەکەی بکرێت وا هەیە شوێنەواری ئەو تەئسیرە لە چەند شوێنێکدا بدۆزرێتەوە.

الف ـ لایە لایە

وەك پێشتر گوترا، شیعری لایە لایە سەرەتا میرزا عەلی ئەکبەری سابیر (هۆپ هۆپ) بە زمانی ئازەربایجانی گوتوویەتی و پاشان نسیم شماڵ و لاهووتی بە فارسی هۆندوویانەتەوە. لایەلایەی هەژار کە زۆر شاعیری کوردی تر و لەوانە قانیع و "وەفا"، لاساییان کردووەتەوە و شوێنی لاهووتی هەڵگرتوە بەلام هەژار چەرخێکی گەورەی پێ داوە واتە ناوەرۆکە کەی گۆڕیوە و گردوویەتە بابەتێکی تەواو کوردی کە کاتێ لەگەڵ لایەلایەی لاهووتی بەرانبەریان دادەنێی، هاوبەشی

ئەوتۆیان تێدا بەر چاو ناکەوێت. واتە هەژار لایەلایەی تەرجەمە نەکردووە و تەنیا "مەفکوورە"کەی وەرگرتوە:

رۆڵەی جەرگ و دڵ، هێزی هەناوم !
چۆڵەمەی ئەستۆم، رەگی حەیاتم !
هەنگوین و قەند و نۆقڵ و نەباتم !
هەی لایە لایە رۆڵە لای لایە
شەوگار درەنگە بۆ خەوت نایە..."

ب.
یک دسته گل به قبر لنین
امروز دل کارگران همه عالم
در مرگ لنین است عزادار و پر غم...

(لاهووتی، مۆسکۆ، جانیوەری ۱۹۳۱، ل ۲۲۳ی دیوان)

لە م شیعرەدا، لاهووتی بە بۆنەی کۆچی دوایی لێنینەوە چیرۆکێکی شاعیرانە هەڵدەبەستێت و دەڵێ بەو بۆنەیەوە دەبێ چەپکە گوڵێك ببەستین و لەسەر گۆڕەکەی دابنێین. جا لاهووتی چەپکە گوڵەکە بەم شێوەیە دەبەستێت: لە حاسڵی هەر کوڵخوزێکی دوور و نزیك لقێك گوڵ دێنێت، دەیداتە فابریکێك بۆ ئەوەی رێکی بخەن، ئینجا لە کارخانەی پۆڵاوە شریتێکی پانکەڵە دێنێ ودەستە گوڵەکەی پێ دەبەستێت، تراکتۆرێکیش لە شاری ستالین گراد واتە دوو شەنبە دێنێ و بە سەدان ئاڵای سوور دەیڕازێنێتەوە، جا کرێکاران هەمووی دەکەونە شوێن تراکتۆرەکە و دەیبەنە سەر گۆڕی لێنین.

وێدەچێ مامۆستا هەژار شیعری گەلێ ناو داری "نامە بۆ وارشەو"ی لەژێر تەئسیری ئەم شیعرەدا گوتبێ بەڵام وەها کردوویەتە

بابەتێکی خۆماڵی و کوردی، کە ناکرێ بەهاسانی بیبەیەوە سەر ئەسڵەکە. هەژار بۆ ئەوەی گازندەی کورد بنووسێ و بینێرێتە فستیڤاڵی لاوانی جیهان لە شاری وارشەو (١٩٥٥)، چاو بۆ کوردێکی چابك و پتەو دەگێڕێت کە بە شەو سەفەرێکی بۆ بکات لە پێشدا بچێتە مهاباد و لە داری سێدارەی قازی و سەیف تلاشێك لێ بکاتەوە، لە ئاگری داغ نیزەیەکی خوێناوی بهێنێ، دارەکە بەو نیزەیە دا بدات و قەڵەمێکی لێ دروست بکات ئینجا خوێنی خەستی بارزانییە شەهیدەکان بە ئاوی چاوی کوڕ کوژراوانی بەر دەرکەی سەرا لە سلێمانی شل بکاتەوە و وەك مەرەکەب بیکاتە کەللەی مستەفا خۆشناوەوە، لە جلکی شڕی هەتیوبار و دەربەدەران ریشاڵێك بێنێت بۆ هەژار، کە بە و خوێن و بەو قەڵەمە سکاڵای کوردی لەسەر بنووسێ و بینێرێتە کونگرەکەی وارشەو.

وەك دەبینین لێزانی و وەستاکاریی هەژار پێش لاهووتی کەوتووە و شیعرەکەی لە جوانی و شوێن دانانی سەر خوێنەردا لەسەرووی ئەوشیعرەی لاهووتییەوەیە کە من لام وایە سەرچاوەی وەرگرتنی بیرۆکەی شیعرەکە بووبێت.

٥ .هێمن:

شوێنی لاهووتی لەسەر هێمنیش بەر چاو و لەچاو هەژار زەقتر و ئاشکراترە، بڕوانە ئەم دوو نموونەیە:

ئا) بت نازنینم، مه مهربانم

چرا قهری از من؟ بلایت بجانم

عزیزم چه کردم که رنجیدی از من؟
بگو تا گناه خودمرا بدانم
زمن عمر خواهی بگو تا ببخشم
بمن زهر بخشی، بده تا ستانم
**(لاهووتی، شیعری "درس محبت"، مۆسکۆ، ئاپریلی١٩٢٥، ل ٥٨ی دیوان).**

**عەزیزم بۆ چی تۆراوی لە خۆڕا؟**
**چ قەوماوە دڵی تۆ بۆ چی گۆڕا؟......**
**لە من ڕا خۆ هەتایەك رووی نەداوە**
**ئەدی بێ مەیلی بۆ رووی دا لە تۆڕا؟....**
**سەرو ماڵ و ژیان و هەرچی هەمبوو**
**لە داوی بسکی تۆدا پاکی دۆڕا**
**سەر و ماڵ وکەماڵ وبیر و هۆشم**
**لە نەردی عیشقی تۆدا پاکی دۆڕا**
**(هێمن، شیعری "گۆمی خوێن"، تاریك و روون، ل ١٢١).**

**ب)** زین بیش این نقاب سیه را به رو مکن
ما را میان جامعه بی آرو مکن
**(لاهووتی، شیعری، "مکن"،ئه ستەمول، مارس ١٩١٨، ل ٨٨٦ی دیوان)**

**هەتا چارشێو بەسەر تۆوە دەبینم نازەنینی کورد!**
**بەسەر بیبیلەکەی چاوی منا دەکشێ تەمێکی تر.**

**(هێمن، شیعری "عیشق و ئازادی"، ١٩٧٧، ناڵەی جودایی، ل ٥١) .**

٦. گۆران:

له ديوانی چاپكراوی مامۆستا گۆراندا، گەرچی تەرجەمەی شیعری نازم حیكمەت و هەروەها شاعیری پێشكەوتنخوازی ئێران "ابوتراب جلی" هەیە، بەڵام چاوم بە تەرجەمەی شیعری لاهووتی نەكەوت ـ گەرچی دڵنیام لای كەم دوای سەفەری سۆڤیەت، لاهووتی بۆ گۆران ناوێكی ناسیاو بووە. تاقە بابەتێكی هاوبەش كە لە دیوانی هەردوو شاعیردا دیبێتم، ئەو شیعرەیەكە تێیدا لاهووتی كەڵك لە مەتەڵێكی كوردی وەردەگرێت كە دەڵێ:

"دەست، دەستی ئەستی و پا، پای كەر"

گۆران هەمان شیعری لە شاعیرێكی هاوچەرخی لاهووتی واتە "عشقی همدانی" وەرگێڕاوەتە سەر كوردی و هەمان ئاكامی لێ وەرگرتووە. مەتەڵەكە، كوردییە و هی ناوچەی سنە و كرماشانە، لاهووتی كرماشانی بووە و "عشقی"ش كە بە هەمدانی نزیك سنە و كرماشانەوە پێوەندی هەیە باوكی كورد و خەڵكی سنە بووە:

داستانی هەیاسی و كاكە عابیدین:

لە كوردستانا، لە قاسم ئاوا          كاكە عابیدین ناوێك بوو، كوێخا

(گۆران، عبدالله، ٤٧٤).

هەر لەم پێوەندییەی نێوان شیعری لاهووتی و گۆراندان دەبێ دەست نیشانی بیرەوەری مامۆستا عزالدین مستەفا ڕەسووڵ بكەم. لە وتووێژ لەگەڵ كاك عەلی كەریمیدا د. عزالدین دەڵێ: ".....من ئەوەم لەبیرە كە مامۆستا گۆرانیش شتێكی هەیە لەسەر نەورۆز ئی

"ليبرتۆ"یە. لە مۆسكۆ پێمگوت شتێكی چاكت كردووە، وتی ئەوە ئی من نییە، ئەوە ئی ئەبولقاسمی لاهووتییە و من تەرجەمەم كردووە. وتم كوا لاهووتی لەكوێ گوتوویەتی:

"بۆ كچە كورد ژینی دیلی، ژین نییە
بە دەمی دیل هەنگوێنیش شیرین نییە"؟

وتی خۆ كاكە، پیاو دەبێ دەستكارییەكی ئاواشی بكا! وتی باشە، تۆ لەكوێ وا ئاگاداری لاهووتی؟ وتم بابە ئێمە تەرجەمەمان كردووە بە عەرەبی!" (كەریمی، عەلی، ٢٤١). دیارە، د.عزالدین كە باسی تەرجەمەی عەرەبی دەكات، ئاماژەیەكە بە تەرجەمەی مامۆستا عەبدولڕەحمان زەبیحی لە هەمان پارچە شیعری سەبارەت بە نەورۆز. (بۆ ئەم باسە، بڕوانە پێشەوەتر، باسی زەبیحی و لاهووتی).

سەبارەت بە شیعرەكەی گۆرانیش دەبێ بگوترێ ئەو فەردەی وا د. عزالدین ناو بردەی كردووە، بەشێكە لە "ئۆپەریتی ئەنجامی ئەژدەهاك"، كە لە لاپەڕە ٣٥٢ تا ٣٥٩ی "سەرجەمی بەرهەمی گۆران" بەرگی یەكەمدا هاتووە و كاك محەمەدی مەلا كەریم لە پەراوێزی لاپەڕەی یەكەمیدا نووسیویە: "مامۆستا گۆران ئەم ئۆپەرێتەی لە ژمارە ٤ی بەرگی ٢ی ئایاری ١٩٥٩ی گۆڤاری "بەیان"دا بڵاوكردۆتەوە كە بە سەرپەرەشتی خۆی لە سلێمانی دەرئەچوو" (گۆران، ١٩٨٠، ل ٣٥٢).

ئەوانە چەند نموونە لە تەئسیری بێ سنووری شیعری لاهووتی لەسەر شاعیرانی كوردی ڕۆژهەڵاتی كوردستان بوون. وردبوونەوە لە شیعری هەر ئەو شاعیرانە و گەلێك شاعیری دیكەی وەك مامۆستا خالیدی حیسامی (هیدی)و حەقیقی و عومەری سوڵتانی (وەفا)و

محەمەدی نووری و خاڵەمین و بەگشتی شاعیرانی سەردەمی کۆمار و نەوەی دواتریان، دەری دەخات کە خەباتی گەلی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ئیلهامێکی بە هێزی لە شیعری لاهووتی وەرگرتووە و بابەت نووسینی مامۆستا حەسەنی قزڵجی لەسەر لاهووتی و وەرگێڕانی یەکێك لە شیعرەکانیشی هەر لەو پێوەندییە دا واتا دەکرێتەوە.

(بۆ نووسراوەکەی قزڵجی بڕوانە پاشکۆی ژمارە ٥)

# بەشی سێهەم
## کارە ئەدەبی و هونەرییەکانی تر

جگە لە شیعر گوتن، وا هەیە گرنگترین شوێنەواری بەجێماوی لاهووتی، تەرجەمەکانی بێت. من ئاگاییەکم لە کاری تەرجەمەی سەردەمی ژیانی ئێران و ئەستەمووڵی لاهووتی نییە و تەنیا بە هەواڵی وەرگێڕاوەکانی سۆڤیەتی دەزانم.

یەك لەو تەرجەمانە، "سروودی ئینتر ناسیۆناڵ"ە کە بەپێی زانیاریی من لاهووتی یەکەم کەس بووە وەریگێڕابێتە سەر زمانی فارسی ـ گەرچی دوای ئەو کەسانی تریش کردوویانەتە فارسی:

برخیز، ای داغ لعنت خورده!
دنیای فقر و بندگی،
جوشیده، خاطر ما را برده
به جنگ مرگ و زندگی
باید از ریشه براندازیم
کهنه جهان جورو بند
آنگه نوین جهانی سازیم
هیچ بودگان هر چیز گردند
روز قطعی جدال است
آخرین رزم،

انترناسو نال است
نجات انسانها......

**لاهووتی زیاتر شیعری به شیعر تەرجەمە کردووە و یەك لەوانە، شیعرە ناسراوکەی مایاکۆفسکیە بەناوی "وتوویژی لەگەڵ رەفیق لێنین":**

از خرمنها کار
اوضاع نوین
روز،
کم کم تاریک شده
آرمید
دوتن در اتاق:
منم و لنین
عکس او
روی دیوار سفید
دهان باز
در پرشور سخنرانی...

**بەشێك لە تەرجەمەکانی لاهووتی وێدەچێ بابەتی رەسمی بۆ مەراسیم و کۆبوونەوەکان بووبێتن، وەك "سروودی نێونەتەوەیی خوێندکاران"، "سروودی لاوانی دیموکراتی جیهان"، "سروودی ئاشتی"، "سروودی نیشتمان"، "سروودی هەڵۆ" و "پەیکی تۆفان" کە هەر هەموویان لە رووسییەوە وەرگێڕراونەتە سەر زمانی فارسی و ئەو دوانەی کۆتاییان شیعری ماکسیم گورگین. شیعرێکی ڤیکتۆر هۆگۆ"شی وەرگێڕاوە کە روون نییە ئایا لە فارسییەوە تەرجەمەی**

کردبێت یاخود لەبەر تەرجەمەی رووسی شیعرەکە. ئەوانە و چەند وەرگێڕاوێکی تر لە لاپەڕەکانی دیوانی لاهووتی چاپی ئەحمەدی بەشیری، لاپەڕە ٦٨٩ تا ٧١٨ دا رەنگیان داوەتەوە. بابەتی لە تورکیشەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی و یەك لەوان لە کۆتایی دیوانەکەیدا (چاپی ئەحمەدی بەشیری) چاپ کراوە.

کارێکی تەرجەمەی دیکەی لاهووتی، وەرگێڕانی هەندێك لە چوارینەکانی خەییامە بۆ سەر زمانی فەرەنسی. ژمارەی چوارینە تەرجەمە کراوەکانی بۆ من روون نییە و بۆ ئەوە، پێویستە نوسخەی گۆڤاری "پارس" چاپی ئەستەمووڵ سەیر بکرێت. لاهووتی لە ساڵانی ١٩١٨ تا ١٩٢١ و لە ماوەی ژیانی ئەستەمووڵی دا هاوکاری "حسن مقدم"ی کردووە و پێکەوە گۆڤارێکی فارسی فەرەنسییان بڵاوکردۆتەوە. بەشی پاشکۆی دیوانی چاپی ئەحمەد بەشیری، کلێشەی دوو لاپەڕەی گۆڤارەکەی تێدایە، کە یەکیان وەرگێڕاوی فەرەنسی و دەقی فارسی دوو چوارینەی خەییامە. دیارە نیازیشم لەو گۆڤارەی وا لە ئەستەمووڵ چاپیان کردووە، گۆڤاری "پارس"ـە.

## شیعر بۆ گۆرانی:

لاهووتی هەروەها شیعری بۆ هەندێك گۆرانی داناوە کە هەوای گۆرانیەکان هی "عەتیە"ی کچی یاخود کەسانی تر بووە. بەڵام وا هەیە گرنگترین کاری لەم بوارەدا، دانانی ئۆپێرای "کاوەی ئاسنگەر" بووبێت، کە بە یەکەمین ئۆپێرای تاجیکی دەزانرێت وا لە تاجیکستان بەرێوە براوە. من دڵنیانیم، بەڵام وا هەیە "کاوە ئاهنگر"، یەکەم

ئۆپێرای فارسی لە ئێران و ئەفغانستانیش بووبێت کە تا ئەودەمە چوو بێتە سەر شانۆ. من کاتێ ئەو ئەرك و زەحمەت و پچەشکێنیانەم لە لاهووتی دەدیت، خەمی گەلی کوردم دەخوارد و دەمگوت ئەگەر لاهووتی ئەو ئەرکانەی بۆ زمانی زگماك واتە کوردی بەڕێوە ببردایەن ئێمەش گەلێك قۆناغمان زووتر لە ئێستا دەبڕی، هەر بۆش بوو لاهووتیم بە "هێلکەی دۆڕاو" دانابوو و ناوی نامیلکەی سالی ١٩٩٧م سەبارەت بە لاهووتی لەو چەمکە وەرگرتبوو. هەر چۆنێك بێت، لاهووتی بە تاقە بالێ بە قەدرایی دەیان کەس خزمەتی کۆمەلگای ئێران و زمانی فارسی کرد، بەلام ئەگەر پێشتر تەنیا رژیمەکانی حاکم بوون هەولی کوێرکردنەوەی ناو و شوێنەواری لاهووتیان دەدا، ئێستە ئێرانییەکان خۆشیان رێزی پێویستی لێ ناگرن و وا هەیە چەند نەوەی تر ئەو هەموو کار و خەباتەی وا بە قەلەم و قەدەم بۆ ئێرانی کرد ببێتە بلقی سەر ئاو. ئەگەر ئەو وای لێ بەسەر بێت، وەزعی خزمەتگوزارانی بچووکی گەلان چی دەبێت جگە لە فەرامۆشی تەواو! (بۆ پەسندی ئەم بۆچوونە، بڕوانە بەشی سەفەرنامەی تاجیکستانی "نسیم خاکسار" لە لاپەڕەکانی پێشوودا).

## لاهووتی و شاهنامە:

شاهنامەی فیردەوسی توسی، (دەورووبەری ١٠٢٥ ـ ٩٤١ ز) یەکەم شانامەی فارسی نەبوە بەلام گرنگترین و ناو بەدەرەوەترینیانە. شانامە لە راستیدا تێکەلاوێکی مێژوو و ئەفسانە و خولقاندنی هونەریی مێژووی ئێرانە. ئەوەی تائێستا لە ئێران و بەگشتی جیهاندا وەك راستی وەرگیرابێت

ئەوەیە کە رۆستەم و پاڵەوانانی تری شانامەی فیردەوسی لە رۆژهەڵاتی ئێران ژیابێتن. بەڵام بە درێژایی مێژوو، ناوچەی کوردستان بە کرماشان و لورستانەوە زیاترین شەوقیان بە نیسبەت شانامەوە نیشان داوە و تەنانەت ئێستاش گەلێك ناوی کوڕو کچ لە شاری سنە، ناوی شانامەییە:

فەرەیدوون، فەریبورز، جەمشید، بەهرام،...و تاد.

هۆی ئەو خۆش ویستن و لایەنگرییە تا ئەم دواییانە نەزانراو بوو، هەتا لێکۆڵەری زەحمەتکێشی کرماشانی نەمر "عمادالدین دەوڵەتشاهی" دوو بەرگ کتێبی لەسەر ئاڤێستا بڵاوکردەوە و دوای وەرگێڕانی هەندێ بەشی کتێبەکەی زەردەشت، بەڵگەی گەلێك روونی هێنایەوە بۆ ئەو بۆچوونە نوێ و شۆڕشگێڕانەیەی کە زەردەشت دوای ئەوەی لە دەوروبەری گۆلی ورمێ "چیچە ست" لەدایك دەبێت، بە پێچەوانەی باوەڕی باو، ناچێ بۆ رۆژهەڵاتی ئێران و لای شاری بەڵخ، بەڵکوو رووداکاتە شوێنی ئێستای سنەو کرماشان و لوڕستان و هەتا مردنیش هەر لەوێ دەمێنێتەوە (دوڵەتشاهی، عمادالدین، ١٩٨٤). دەوڵەتشاهی لە کتێب دووهەمی خۆیدا، بەشێك لە "یەشت"ـەکانی ئاڤێستا وەردەگێڕێتە سەر فارسی ولەبەر چاوی سەر سووڕماوی هەموو لایەك دەری دەخات کە:

١ . ئەو دەقە، بە تەواوەتی کوردییە،

٢. وەرگێڕراوی پێشووی" پووورداوود"بۆ سەر زمانی فارسی هەڵەی زۆری تێدایە، و

٣. لە هەمووان گرنگتر، ئەوەی کە"یەشت"ـەکان لە راستیدا شینگێڕی رۆستەمن دوای ئەوەی زۆرابی کوڕی بە دەستی خۆی دێتە کوشتن. (دەوڵەتشاهی، عمادالدین، ١٩٩٨).

کاتێ سەرنجی ئەو بۆچوونە مێژووییەی دەوڵەتشاهی دەدەین، دەگەینە ئەو ئاکامەش کە خۆشەویستی شانامە و قارەمانەکانی لە لای کورد و لوڕ بێبنەما نییە و لەخۆوە پەیدا نەبوە. ڕۆستەم، قارەمانێکی کوردە و شانامەی فیردەوسیش داستانی قارەمانیەتی ئەو و شەرحی هەندێ ڕووداوە، کە بەشێکیان لە پێوەندی ناوچەکەدان.

ئێمە دەزانین "شانامەخوانی" سوننەتێکی دێرینی کوردستانە و هەتا پەیدابوونی رادیۆ و تەلەفیزیۆنیش لە گەلێك شوێنی کوردستان رەچاو کراوە. تەنانەت من بە تەمەنی خۆم لەبیرمە لە بۆکان میرزا مەحموودی غەوسی و میرزا حەمەکەریمی کەریمی شانامەیان دەخوێندەوەو بۆ خوێندنەوەی، بانگ دەکرانە ماڵی خزم و دۆست و دەر و دراوسێ. شانامەخوانێکی ناوداری سنەییش لە ڕێوڕەسمێکی فەرمی ئێراندا لە کێبەرکێی شانامە خوێندنەوەی شاری "تووس" شوێنی ژیان و مردنی فیردەوسی لە خۆراسان، پلەی یەکەمی هێنایەوە (حەقشناس، محی الدین، شریتی "شارەکەم سنە").

شانامەی فیردەوسی ئەگەر سەرجەمیشی وەرنەگەڕابێتە سەر کوردی، لای کەم هەندێ لە بەشەکانی واتە داستانی "ڕۆستەم و زۆراب"، "ڕۆستەم و ئەسفەندیار"، بیژەن و مەنیجە" و.....کراونەتە کوردی گۆرانی و دەقی دەستنووسیان ئێستاش هەر پارێزراوە و چاوەڕوانی چاپ و بڵاوبوونەوەن.

ئەم خۆشەویستیەی شانامە لە کرماشان وسنە و لوڕستان، لە لاهووتیشدا بەدی دەکرێت و هەر لە سەردەمی ژیانی ئێرانیشیەوە لەگەڵی بووە، ڕەجەز خوێندنەکانی سەردەمی منداڵیشی بێگومان

تەئسیری شانامەیان لەسەر بووە تەنانەت ئەگەر بە کوردیشی گوتبن، لەبەر ئەوەی شانامە لە راستیدا بەشی زۆری هەر "رەجەزنامەیە". من لێرەدا دەست نیشانی چەند شیعرێکی لاهووتی دەکەم کە لە هەمان بەحری "متقارب"دا گوتراون وا شانامەی پێ هۆنراوەتەوە، بۆ ئەوەی دواتر بچمە سۆراغی کارێکی مەزنی لاهووتی و هاوسەرە رووسییەکەی لەمەڕ شانامەی فیردەوسی.

گرنگترین شیعری لاهووتی لە "اقتدا"و پێشوازیکردنی شیعری فیردەوسیدا، پارچە هەڵبەستێکە بەناوی "بەیرەق":

شب آمد بخانه، نگفت و نخفت
چو مادر سبب جست، با اوبگفت
کە: مادر! چە پرسی تو از درد من؟
نبینی مگر چهرە زرد من؟
بریگاد من در شکست اوفتاد
تو را نام فرزند، پست اوفتاد....

(شیعری "بەیرەق"، ستالین ئاوا ـــ مۆسکۆ، جون تا ئوگوستی ١٩٣٥، ل٢٨٤ی دیوان).

نموونەیەکی دیکەی ئەو شیعرانەی وا لاهووتی لە پێشوازیی فیردەوسی و شانامەدا گوتوویەتی ئەوەی خوارەوەیە:

بە کلخور بدیدم یکی مرد پیر
بە قامت چو سرو وبقوت چو شیر
بگفتم چە سراست در این میان
کە موی تو پیراست و زورت جوان؟...

(شیعری "هوای بهشت"، مۆسکۆ دیسەمبری ١٩٣٥، ل ٤٣٧ی دیوان).

بەڵام کاری هەرە گەورەی لاهووتی وا هەیە یارمەتیدانی هاوسەری دووهەمی خۆی بێت بۆ تەرجەمەی شانامەی فیردەوسی بە زمانی رووسی. سیسیل بانو، لاهووتی بە "مامۆستا" ناو دەبات (بڕوانە نامەی ١٩٧٩/ ٢/ ٢٢ بۆ دوکتۆر کەریم سەنجابی وەزیری کارو باری دەرەوەی ئێران و نامە بۆ ئەحمەد بەشیری لە دیوانەکەی لاهووتیدا). سیسیل بانو بەرگی یەکەمی کارە گەورەکەی خۆی کە لەژێر چاوەدێریی لاهووتیدا بەڕێوە چووبوو، لە سەردەمی ژیانی هاوسەرەکەیدا بڵاوکردەوە و دواتر خەریکی بەشی کۆتاییەکەی بوو. بەگوێرەی زانیاری من، ئەو بەشەش ئێستا کۆتایی پێ هاتووە و تەرجەمەی سەرجەمی شانامەی فیردەوسی ئێستا لەبەر دەستی خوێنەرانی رووسیدایە.

## ئۆپێرای "کاوەی ئاسنگەر":

وەك پێشتر گوترا، ئەوە یەکەمین ئۆپێرای زمانی تاجیکی و وڵاتی تاجیکستانە. لاهووتی ئەو ئۆپێرایەی لەسەردەمی ژیانی سۆڤیەت و بە یادی رابوردووی ئێران هۆندۆتەوە کە بۆ ئەو پڕ بووە لە شانازی و سەروەری. لاهووتی وەك زۆر ناسیۆنالیستی دیکەی ئێرانی، مەزنایەتی ئیمپراتۆریەتی ئێرانی پێش هێرشی عەرەب گەورە دەکاتەوە و عەرەب بەهۆی دواکەوتوویی وڵات دەناسێت، هەر بۆیەش رووەدەکاتە شانامە و هاودەنگ لەگەڵ فیردەوسی شیوەنی ئەو رابوردووە دەکات و یادی ئەو سەردەمە زیندوو رادەگرێت.

ئۆپێرای کاوەی ئاسنگەر هەنگاوێکە لەم بوارەدا: ئۆپێراکە، ٥ پەردەیە و لە باری فۆڕمەوە تێکەڵاوێکی شیعری بڕگەیی، شیعری

عەرووزی و شیعری نوێیە. کەسانی چیرۆکەکە، بریتین لە کاوە و زەحاك و ١٢ کەس و ژمارەیەك ئاپۆرە. یەکەم شانۆ، بازاڕی ئاسنگەرانە ولاوان ئەم سرووده دەخوێننەوە:

آن سلسله مو آید اگر بر سر بازار
بازار شود از نفسش تازه چو گلزار
کمان دارد ز ابرو
کمند آرد زگیسو
شکر در خنده او
به پیشش خم شده سرها ز هر سو
بت ما جادو است البته جادو...

(لاهووتی دیوانی چاپی مۆسکۆ، ١٩٥٧)

لە شانۆی ڕووبەڕووبوونەوەی کاوە لەگەڵ زەحاکدا (پەردەی پینجەم)، کاوە بە زەحاك دەڵێ:

ایا دیو خونخوار بیداگر!
ز انصاف و رحم و حیا بی خبر!
ز جور تو این ملک ویران شد
طربخانەی ما عزا خان شد
در این سرزمین یک دل شاد نیست
ز تیغ تو، یک گردن آزاد نیست
ستم چند بر حال محزون ما؟
کی آخر شوی سیر از خون ما؟
شنو این صدای خروشان خلق
هراسان شو از خشم جوشان خلق.....

(لاهووتی، دیوان چاپ اداره نشریان بزبانهای خارجی، مۆسکۆ، لل ٣٣٧ تا ٤١٠).

بە گشتی، کاوەی ئاسنگەر، یەك لە کارە سەرکەوتووەکانی لاهووتییە و چەندەها جار چاپ کراوەتەوە. ناوەرۆکی شۆڕشگێڕانەی شیعرەکە بۆتە هۆی ئەوەی لە یەکیەتی سۆڤیەتی بایەخی زۆری پێ بدرێت. لە شیعرەکەدا رووی قسەی لەگەڵ شای ئێران و خەباتکارانی ئێرانی سەردەمی خۆیەتی بەڵام بە شێوەی تەمسیلی.

## وشەی نوێ:

لاهووتی جگە لەوەی قاڵبی شیعری فارسی نوێ کردەوە، ناوەرۆکێکی نوێشی پێ بەخشی، واتە بابەتی نوێی ئەوتۆی هێنایە ناو شیعری فارسییەوە کە پێشتر پێشینەی نەبوو. بەم پێیە شۆڕشی لاهووتی ناوەرۆك و فۆرمی شیعری فارسی بەیەکەوە نوێ کردەوە. بەشێك لەو نوێخوازییانەی ناوەرۆك، لە شیعری سەردەمی مەشرووتەی شاعیرانی وەك ایرج میرزا و عارف قەزوێنی وفرخی یزدی دا رەنگی داوەتەوە، بەڵام بەشێکی تری تایبەت بە لاهووتین. لاهووتی یەکەم شاعیری چینی کرێکارە کە لە روانگەی کاری رێکخراوەیی چەپەوە هانی شۆڕشی چینایەتی و بە دەستەوە گرتنی دەسەڵاتی سیاسی کرێکارانی داوە و لایەنگری لە دیکتاتۆریەتی پرۆلتاریا و هاو پشتی خەبات لەگەڵ چینی کرێکاری گەلانی دیکەی رۆژهەڵات و هەروەها پشتگیری شۆڕشی ئوکتۆبری سۆڤیەتی کردووە.

لەو سەردەمە و تەنانەت تا ماوەیەکی دواتر ـ هەتا دامەزراندنی حزبی کۆمۆنیستی ئێرانی دوکتۆر ئەرانی و پاشان دامەزرانی حزبی توودەی ئێرانیش کە شاعیرانی وەك ابوتراب جلی و سیاوش کسرایی

و......تاد سەریان هەڵدا، ئەم بابەتانە تایبەت بە لاهووتی بوون و جگە لەو، هیچ شاعیرێکی ناسراوی ئێران بەلایاندا نەچوو بوو. ئەم بیر وئایدیۆلۆجییە، بە تایبەت دوای چوونی لاهووتی بۆ سۆڤیەت پتەوتر و هەستی لایەنگری کرێکاران  بە هێز تر بوو. ئیتر لە سالانی دوای ١٩٢٤ وئەندام بوونی لاهووتی لە حزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتدا، هاو هەنگاو لەگەڵ کارو ئەرکی رۆژانە بۆ پتەوکردنی پایە وئەساسی یەکیەتی سۆڤیەت و کۆماری سۆڤیەتی تاجیکستان، شیعرەکانیشی خستە خزمەت ئەو ئەرك و کارەوە و بە گشتی شیعری ئەو سەدەمانەی ئاوێنەی بالانوێنی کاروباری رۆژانە  و ئەرکی حزبی و دەوڵەتی ئەون.

ئەم بوارە نوێیەی کار، و ئەرکی حزبی و دەوڵەتی، بۆ ئەوەی ببنە مادە و لە شیعرەکانیدا رەنگ بدەنەوە، پێویستی بە کەرەسەی نوێ هەبوو. بۆ نموونە پلان و پرۆگرامی "نێپ"ی سەردەمی ستالین بۆ ئەوەی بێتە ناو شیعری شاعیرەوە، دەبوایە وشەو زاراوە کەشی لەگەڵ خۆیدا بهێنێت. ناوی قارەمانانی کاری سوسیالیستی و شەهیدانی شەڕی دژی فاشیسم، ناوی رێبەرانی حزب و هەروەها "حزبی برا" لە ولاتانی دیکەی جیهان، دەبوایە لە شیعرەکانیدا خۆ بنوێنن بۆ ئەوەی رێزیان لێ بگیرێت. بە هەمان شێوە، دوژمنانی ئاشتی و سوسیالیزم دەبوایە لە شیعرەکاندا ناویان هەبێت بۆ ئەوەی هێرشیان بکرێتە سەر. هەر بۆیەش شیعری ئەو سەردەمانەی لاهووتی دارماڵی وشەی نوێن کە پێشتر لە شیعری هیچ شاعیرێکی دیکەی فارسدا نەبینراون. ئەم وشەو و زاراوانەی خوارەوە تەنیا بەشێکن لەو دەیان وسەدان وشە بێگانەیەی کە من لە دیوانی لاهووتیدا بە چاوم کردوون:

"کۆڵخۆزچی، تراکتۆریست، ئوکتۆبر، لێنین، ستالین، مارکسیسم، سوسیالیزم، لێنینیسم، فابریك، تکنیك، س. س. ر، کۆمسۆمۆل، فاشیسم، فاشیست، فاشیستان، پلان، فابریکچی، کلوب، بریگاد، رومانف، کرێملین، بۆلشویکی، س. س. س، پایونێر، سکا، ار. کا. پ. الکتروستال، و سەدانی تر....

هەروەها لاهووتی هەندێك وشەی تاجیکی لە رێگەی شیعرەکانیەوە هێنایە ناو فارسی ئێرانییەوە، وەك: باسمەچی، کمبغل، بای و... کە لە بواری نزیك خستنە وەی زمانی فارسی نوێی ئێران لەگەڵ زمانی دەری و تاجیکیدا خاوەنی بایەخی خۆیەتی، گەرچی لاهووتی ددانی خێری بەسەر زمانی تاجیکیدا نەدەهێنا و لای وابوو بە هۆی وشەی "هاوردە"ی رووسی‌یەوە، پاکی و بێ خەوشی زمانی فارسی ئێرانی نییە و لەسەر ئەو مەسەلەیە لەگەڵ هەندێ لە نووسەرانی تاجیکستان دەمەقاڵەی هەبوو.

## کرۆنۆلۆجی شوێنی ژیانی لاهووتی بەگوێرەی تەئریخی شیعرەکانی

سەیرێکی دیوانی لاهووتی چاپی ئەحمەد بەشیری وا هەیە یارمەتیمان بدات بۆ ئەوەی شوێنایەتی ژیانی لاهووتی دیاری بکەین. لە کۆتایی زۆربەی زۆری شیعرەکاندا ناوی شوێن و تەئریخی گوتنی شیعرەکە دیاری کراوە. من نازانم ئەو تەئریخانە چەندە راستن و چەندەیان هەڵەتێدایە یاخود دەستکردن. بەڵام بەگوێرەی سەرچاوەیەك، لای کەم تەئریخی یەك لەو شیعرانەی وا لە دیوانی

چاپی تەورێزدا بڵاو کراوەتەوە هەڵەیە. دوکتۆر شەفیعی کەدکەنی لە کتێبی "ادوار شعر فارسی از مشروتیت تا سقوت سلتنت"دا کاتێ باسی ئەدەبی کرێکاری دەکات دەنووسێ: "لاهووتی پێش ئەوەی لە ئێرانیش بڕواتە دەرەوە شیعری کرێکاری زۆری هەبوە و یەك لەوانە بریتییە لەم شیعرەی خوارەوە:

ای رنجبر سیاه طالع !　　　　بیچاره پا برهنه زارع !

ئەو شیعرە لە ساڵی ۱۹۰۹دا لە تاران گوتراوە بەڵام لە دیوانی چاپی تەورێزیدا بە هەڵە ۱۳۰۹ نووسراوە" (شەفیعی کەدکەنی، محمد رەزا، ۲۰۰۱) سەرەڕای هەڵەیەك و دوانی وەك ئەوەی د. شەفیعی باسی لێوە دەکات، دەبێ زۆربەی تەئریخەکان راست بن و گونجاو نییە گومان لە هەمووان بکرێت. هەر بۆ یەش من هەوڵم دا کرۆنۆلۆجییەك لە شیعرەکان پێك بهێنم کە وا هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر یارمەتی توێژێنەران بدات. لەم کرۆنۆلۆجیە دەردەکەوێت لاهووتی لە چ ساڵێکدا لە چ شار و وڵاتێك ژیاوە:

| مانگ | ساڵ | شوێن |
|---|---|---|
| کانوونی یەکەم | ۱۹۱۷ | کرماشان |
| ئادار | ۱۹۱۸ | ئەستەموول |
| نیسان | ۱۹۱۸ | ئەستەموول |
| ئەیلوول | ۱۹۱۸ | ئەستەموول |
| مایس | ۱۹۱۹ | ئەستەموول |
| حوزەیران | ۱۹۱۹ | ئەستەموول |

| | | |
|---|---|---|
| تشرینی یەکەم | ١٩١٩ | ئەستەمووڵ |
| کانوونی دووەم | ١٩٢٠ | ئەستەمووڵ |
| شوبات | ١٩٢٠ | ئەستەمووڵ |
| نیسان | ١٩٢٠ | ئەستەمووڵ |
| مایس | ١٩٢٠ | ئەستەمووڵ |
| کانوونی دووەم | ١٩٢١ | ئەستەمووڵ |
| حوزەیران | ١٩٢١ | ئەستەمووڵ |
| تشرینی یەکەم | ١٩٢١ | تەورێز |
| ؟ | ١٩٢٢ | تەورێز-شەرەفخانە |
| شوبات | ١٩٢٢ | نەخچەوان |
| ئادار | ١٩٢٢ | تفلیس |
| نیسان | ١٩٢٢ | باکۆ |
| حوزەیران | ١٩٢٢ | باکۆ |
| تەمووز | ١٩٢٢ | باکۆ |
| ئاب | ١٩٢٢ | باکۆ |
| شوبات | ١٩٢٣ | مۆسکۆ |
| ئادار | ١٩٢٣ | مۆسکۆ |
| ئەیلوول | ١٩٢٣ | مۆسکۆ |
| ئەیلوول | ١٩٢٣ | کریمە (قرم) |
| تشرینی یەکەم | ١٩٢٣ | مۆسکۆ |
| کانونی دووەم | ١٩٢٤ | مۆسکۆ |
| ئادار | ١٩٢٤ | مۆسکۆ |

| | | |
|---|---|---|
| تشرینی دووەم | ١٩٢٤ | مۆسکۆ |
| شوبات | ١٩٢٥ | مۆسکۆ |
| نیسان | ١٩٢٥ | مۆسکۆ |
| تەمووز | ١٩٢٥ | دووشەنبە |
| ئاب | ١٩٢٥ | دووشەنبە |
| ئاب | ١٩٢٥ | سەمەرقەند |
| تشرینی دووەم | ١٩٢٧ | تاشکەند |
| نیسان | ١٩٢٨ | مۆسکۆ |
| ئادار | ١٩٢٩ | تاشکەند |
| مایس | ١٩٢٩ | تاشکەند |
| حوزەیران | ١٩٢٩ | تاشکەند |
| ئادار | ١٩٣٠ | مۆسکۆ |
| ؟ | ١٩٣٣ | ستالین ئاوا (دووشەنبە) |
| تشرینی یەکەم | ١٩٣٣ | مۆسکۆ |
| شوبات | ١٩٣٤ | مۆسکۆ |
| مایس | ١٩٣٤ | ستالین ئاوا (دووشەنبە) |

کرۆنۆلۆجیەکەی من ناتەواوە و دەکرێ تەواو بکرێت، واتە دەبێ بە یارمەتی هەموو شیعری ناو دیوانە چاپکراوەکانی لاهووتی روون بکرێتەوە کە شاعیر لە چ مانگ و ساڵێکدا لەکوێ ژیاوە.

بەڵام هەر ئەم جەدوەلەی منیش بەگشتی لەگەڵ رووداوە مێژووییەکاندا یەك دەگرێتەوە بۆ نموونە، دەبینین لاهووتی لە کۆتایی

ساڵی ۱۹۱۷دا لە کرماشان بووە و سێ مانگ دواتر لە مارسی ۱۹۱۸ گەیشتۆتە ئەستەموول یاخود لە مانگی ۱۰ی ساڵی ۱۹۲۱ گەڕاوەتەوە تەوریز و لە مانگی ۲ی ساڵی ۱۹۲۲دا، دوابەدوای تێکشکانی شۆڕشی سووری تەورێز، لە نەخجەوان و پاشان لە تفلیس و باکۆ سەری دەرهێناوە،..... بە هەمان شێوە ساڵانی ژیانی لە سۆڤیەتیش دیاری دەکرێت و دەزانرێت لە کامە ساڵدا لە مۆسکۆ یاخود تاجیکستان ژیاوە گەرچی وا هەیە کەم تا کورتێك گێژ و گومی لە هەندێ ساڵ و شوێندا هەبێت، بۆ نموونە، دەبێ هاتوچۆی نێوان مۆسکۆ و شاری دووشەنبە لە ساڵی ۱۹۳٤، هەڵەی تێدا بێت، یاخود لاهووتی وەك کەسایەتیەکی گرنگی سیاسی لە هاتوچۆی زۆری نێوان شارەکاندا بوو بێت.

# بەشی ٤

# پاشکۆکان

## پاشکۆی یەکەم:

## سەبارەت بە خۆم (١)

نووسینی

ابوالقاسم لاهوتی

کاتیٚ لە خۆم دەپرسم چی بوو منی هێنایە سەر ئەوەی ڕێبازی شاعیری بگرمە بەر و چ شتێك بەرەو درێژی ڕێگام دەبات، بیرم دەگەڕێتەوە بۆ رابردوو و یەکەم تێگەیشتنەکانم لە ژیان.

سالانی مندالیم لە ئێرانی فیۆدالیدا تێپەڕبوو، شوێنێك کە زەبروزەنگ و بێدادم تێیدا دەبینی. کاتیٚ خەلکی هەژارم دەدیت سووکایەتییان پێدەکرێت و خراپیان لەگەلدا دەجوولێنەوە، متمانەم بەوەزیاتر و زیاتر دەبوو کە تەنیا فرمێسك و تووك و نزا و هەڕەشە لە زالم، سوود نابەخشێت. زالم ئەو شتانەی پێخۆشە، و وا هەیە بیانکات بە بیانوو بۆ ئەوەی قوربانییەکانی خۆی زیاتر پیٚ بریندار بکات.

شانۆی سەر شەقامێکم دێتەوەبیر لە ڕۆژانی "شاخسی و واخسی" کردن، کە مەراسمێکە خەلکانی فناتیکی شیعە بۆ یادی کچەزای کوژراوی "محەممەد" واتە "حەسەن و حوسێن" بەڕێوەی دەبەن.

بازرگانێکی زەبەلاح بە هەڵکەوت لاقی بە لاقی کوڕێکدا نا، کە لەگەڵ تاقمەکەدا دەڕۆیشت و وێڕای موسوڵمانانی دیکە لە سینگی خۆی دەدا. لە وەڵامی ناڕەزایی دەربڕینی کوڕەکەدا، بازرگانی گۆڕین تووڕە بوو و بەربووە لێدانی کوڕە.

کوڕەکە بە دڵشکاوی و ئێش و ئازارەوە کەوتە جنێودان. خەڵك بە تووڕەیی لێی وەکۆبوون و پێیانگوت: هەتیوە لاتە ! چۆن لە ڕۆژێکی ئەوتۆدا لەسەر جادە جنێو بە خەڵك دەدەی؟ ئینجا بێ بەزەییانە خستیانە زەوی و بەربوونە لێدانی. بازرگان بە ڕق و کینی خێرخوازانەوە بەشداریی لێدانی کوڕەکەی دەکرد. منیش دەمڕوانییە ڕووداوەکە و لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە ئەگەر بێن و لە من بدەن، نە دەگریم و نە دڵڕەنج دەبم. ئەم کارە سوودی نییە، دەبێ کارێکی دیکە بکرێت.

گەلێك زوو، ڕێبازی هەمە چەشنەی بەربەرەکانێم ناسی. ئاشکرایە، بۆ کوڕانی بوودەڵەی هەندێ خەڵکی دەوڵەمەند، کە سێ خزمەتکاری تێڵابەدەست دەیانبردن بۆ قوتابخانە و بە جادەی بەرماڵی ئێمەدا تێدەپەڕین، کارێکی هاسان بوو تەوس لە ئێمەمانان بگرن. بەڵام ئێمەش وەڵاممان بۆیان هەبوو: پێستەکاڵەکمان دەخستە سەر ڕێگایان بۆ ئەوەی دوژمنەکانمان هەڵبخزێن و بکەونە سەر زەوی. من تەنانەت لەو ڕۆژانەشدا هێزی وشەم ناسیبوو. خەڵکی ئاساییم دەبینی کە بە خوێندنەوەی شیعر بۆ حەسەن و حوسێن جەزم دەبوون. خەڵکم دەبینی چۆن بە خوێندنەوەی "شانامە" واتە ئەو شیعرەی وا فیردەوسی هەزار ساڵ پێش ئێستا هۆندوویەتەوە و تا ئەمڕۆش لای

خەڵك هەر خۆشەویست ماوەتەوە، حەماسەتیان بەرز دەبووەوە. قارەمانانی شیعرەکە، ئەو پاڵەوانانەی سەردەمی کۆنن کە دەهاتنە مەیدانی شەڕ و لەگەڵ پاڵەوانانی هۆردووی دوژمندا دەجەنگێن.

ئەو شەڕنامانەی وا بە شیعر دەخوێنرانەوە، هەندێ جار حەماسە و شەڕئامێز، هەندێك جاریش گاڵتەجاڕ و پڕجنێو بوون و "رەجەز"یان پێدەگوترا. پاڵەوان دەبوایە ئەوەندەی شیروەشێن و شێرکرۆژی باش بێ، ئەوەندش "رەجەزچڕ"ێکی چاك بێت. منیش لاسایی پاڵەوانانی قەدیمم دەکردەوە و بۆ شەڕەگەڕەکی منداڵان رەجەزم دەگوت. ئەم شیعرانە یارمەتی هەڤاڵەکانمیان دەدا باشتر بجەنگن.

باوکم وەك ئیش‌وکار پینەچییەتی دەکرد، هەندێکیش خوێندەوار بوو. زۆر شیعری ئایینی دەهۆندەوە و پێیاندەگوت "حەکیم ئیلاهی"یەك لە باشترین شاعیرانی شارەکەمان بوو. من ئێستاکە بیر لە باوکم دەکەمەوە و بەند و شیعرەکانی وەبیر دەهێنمەوە و، خەفەت دەمگرێ و دەڵێم بۆچی شیعرەکانی باوکم ناوەرۆکێکی باشتریان نەبوو. کاتێ گوێم لە شەڕە شیعری باوکم و هاوڕێیانی دەگرت شیعری خۆیان یان شیعری سەعدی و حافزیان دەخوێندەوە، ئاگاداری شوێندانانی هەندێ لەو شیعرانە لەسەر گوێگران بووم و هەوڵم دەدا تەئسیری لە گوتن نەهاتووی شیعر بناسم.

منیش لە شیعر گوتنی خۆمدا لاسایی شیعری باوکم دەکردەوە، بەڵام لە عەینی کاتدا هەوڵم دەدا ساکار و شوێندانەر بن بۆ ئەوەی منداڵانی هاوتەمەنم لێی تێبگەن. من کەم و زۆر بێ ئەوەی خۆم بە مەسەلەکە بزانم، لەگەڵ شیعردا گەورە بووم گەرچی وەك هەزارانی

دیکەی هاوتەمەنی خۆم، چارەنووسی بێبەختیم ئەوەبوو نەتوانم بچمە قوتابخانە. سەردەمی مێرمنداڵیم تاقە یەك شەقڵی پێوە دیار بوو ئەویش بەختکردنی تەمەنی منداڵی بە باوەڕهێنان بە خودای توانا بوو، هەر بەم شێوەیەشم بۆ چووەسەر، چونکە لەو سەردەمەدا ئێران وردە وردە خەریك بوو لە خەوی سەدە و ساڵیان رادەپەڕی، لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، وەرزێرانی گەلێك شوێنی وڵات راپەڕین. ئاواتە ناسیۆنالیستەکانی وردەبۆرژوازی و خاوەن پیشەسازییەکان لە بیچمێکی سەمەرەدا خۆی دەنواند. زۆر فیرقەی ئایینی ، لۆژی فراماسۆن و رێکخراوەی دیکەی هاوچەشن وەك کارگ هەڵدەتۆقین. هەموویان بە هەڵەپرووزە خەریکی ئەوەبوون وەفاداریی لاوەکانی بەرە و خۆیان رابکێشن.

هەوڵی سەردەمی لاوەتیم لە بواری شاعیریدا، بە هۆی تەئسیری باوکم و دەروێشایەتییەوە پشتگیرییەکی باشی "خەڵکی" بەشوێندا هات. رۆژێکیان داوا لە باوکم کرابوو منیش لەگەڵ خۆیدا بەرێتە کۆبوونەوەیەکی فیرقەی بەهایی. لە کۆبوونەوەکەدا کەسێك بەوپەڕی رێزەوە پەیامێکی عبدالبها رێبەری فیرقەکەی خوێندەوە کە ئەودەم لە عەرەبستان دەژیا. لە پەیامەکەدا گوترابوو گەنجێك بە ناوی ئەبوالقاسم "من خۆم"، لە رێگەی ئیلهامی خوداییەوە پیرۆز کراوە و چارەی وا نووسراوە ببێتە خاوەن کرامات و لایەنگری عبدالبهای مەزن.

باوکم ددانی لە دەمدا نەمابوو، هەر بۆیەش بڕیارمدا هێزی کەراماتی خۆم بەبێ هەست و خوست بخەمە کار و بە دوعا کردنی شەوانە، کارێك بکەم ددانی تازەی باوکم دەربێنەوە ئەوەش بۆ

کەسێکی خاوەن کەراماتی راستەقینە، کارێکی گەورە نەبوو. ئەو شەوە هەمووی خەریکی دوعاکردن بووم، سبەینێ بەیانی کاتێ هێشتا باوکم لە خەودا بوو، بە دزییەوە چوومە سەر جێگاکەی و تامی تاڵی وشیاربوونەوە لە خەون و خەیاڵم لە زار گەڕا. دوای ئەو شەوە ئیتر زەوقی ئەوەم نەما ببم بە "واعز"ێکی بەهایی.

زۆری پێنەچوو ئەنجومەنی ماسۆنەکان.[لۆژی فراماسۆنری] ناردمی بۆ تاران بۆ ئەوەی لەوێ دەرس بخوێنم، بەڵام قوتابخانەکەی "لالەزار" شەقامی سەرەکی [ئەودەمی تاران] تاران، جێگایەك نەبوو کوڕە پێنەچییەك دەرسی لێ بخوێنی. بۆ ماوەیەکی کەم لەوێ مامەوە و ئیتر خەفەتی بە جێهێشتنم نەخوارد.

ڕووداوی گەلێك مەزن بەرێگەوە بوو. لافاوی بە هێزی بزووتنەوەی خەڵك وزەی پێبەخشیم. بانگەوازی شۆڕشی ١٩٠٥ی رووسیا لە ئێران دەکەوتە بەر گوێ. من چوومە نێو بازنەیەکی شۆڕشگێڕییەوە. یادی ئەو هۆدەیەم هەرگیز لەبیر ناچێت کە بە پەڕۆیەکی سوور، دروشمێکی سوور و دەمانچەیەکی سەر مێزەکە، رازابۆوە و من لەوێدا سوێندم خوارد بۆ هەمیشە سەربازێکی وەفادار و بە ئەمەگ بم. وەك ئەندامێکی بازنەکە "شەونامە"م دەنووسی و بڵاوم دەکردەوە. ناوەرۆکی شەونامەکان دژ بە شا و ئەشرافیەتی فیۆداڵ بوو. لە کۆبوونەوەکانیشدا هەر باسی ئەو بابەتانە دەکرا و پەیام بۆ شۆڕشگێڕانێك دەنێررا، کە جلوبەرگیان گۆڕیبوو و خۆیان کردبووە کاروانچی. یەکەم سەرکەوتنی گەل و بەربەستکرانی دەسەڵاتی شا لەلایەن نوێنەرانی گەلەوە، جەژن و شادییەکی زۆری کۆمەڵانی خەڵکی

بەدوادا هات. لەو رۆژانەدا شیعرەکانی من ببوون بە سروود و کۆمەڵانی خەڵك دەیانگوتنەوە. لە عەینی کاتدا، ئەشرافیەتی فیۆداڵ و پارەدارەکانیش بێکار دانەنیشتبوون و دەستێکی بە هێزیان لە کۆنترۆڵکردنی مەجلیس ی تازە دامەزراوی شۆڕای میللی و هەروەها ئەو مافانەدا هەبوو، کە خەڵك بە خوێنی خۆیان وەدەستیان هێنابوو.

ساڵی ١٩٠٨: کۆنەپەرستان، رۆژ لەگەڵ رۆژ بێباکتر دەبوون و تفەنگەکان لە تاران شریخەیان دەهات. محەممەد عەلیشا، بینایەی مەجلیسی دایە بەر تۆپ. شۆڕشگێڕان تەنیا تفەنگیان بەدەستەوە بوو و پارێزگاریی دوایین مەتەرێزی ئازادییان پێدەکرد. تۆپەکان، ئەو رۆژە بردیانەوە، بەڵام شۆڕش تێك نەشکا و ژیلەمۆی شۆڕش جارێکی دیکە لە تەورێز ئەو شوێنەی کە "سەتتار خان" رێبەرایەتی بزووتنەوەکەی دەکرد و هەروەها لە "رەشت" هەڵگیرسایەوە. من لەگەڵ تاقمێکی دیکەی هاوڕێیان کە دەیانویست خۆبشارنەوە، چووم بۆ شاری رەشت. لە رێگا لایەنگرانی شا ئابلۆقەیان داین، کەسێکمان کە ویستی بەربەرەکانییان بکات کوژرا و پاشماوەمان براین بۆ شارێکی نزیکی شوێنەکە واتە "کەرەج" و لەوێ لە تەویلەیەکی تاریك و بۆگەندا زیندانی کراین.

تەویلەکە، دوو سەد کەسێکی تێخرابوو، تەختی زەوییەکەی پڕبوو لە قوڕ و چڵپاو. خەڵك تێیدا مردبوون و چەند حەوتوو بوو نەبرابوونە دەرەوە. رۆژێکیان گوێم لێبوو پاسەوانێك گۆرانی کوردی دەگوت. من دایکم لە هۆزێکی کورد بوو و خویشم زمان و نەریتی کوردیم دەزانی. جا بەهێمنی گۆرانییەکەم بۆ گێڕایەوە. پاسەوانی گۆرین هاتە ژوور و لەگەڵمدا کەوتە قسە.

"توونیەتی تۆ بە کامە کانیاو دەشکیٚ؟"

منیش بە کوردی وەڵامم دایەوە:

"کانیاوێك کە هەرگیز وشکایی نایێت! "

هەمان شەو، سەربازە کوردەکە یارمەتی دام هەڵێم. دەبوایە بە چیا بەفرینەکاندا رێگا ببڕم، بە کوێرەڕێدا بڕۆم و بە رەگ و ریشەی ئەو گیایانە بژیم کە لەژێر بەفر دەرم دەهێنان. لە ریزەکانی شۆڕشی رەشتدا، بارودۆخ باش نەبوو. جاسووس و خراپەکاران لەنێو ئازەربایجانی و فارس و ئەرمەنیدا، شەڕەی نەتەوەیی‌یان دەنایەوە. ئەوانەی وا دژ بە شەڕ و دووبەرەکی بوون، پشتیوانیان لە من دەکرد، داوام لێکردن یەك بگرن. قسە و کردەوەی ئێمە شوێنی پێویستیان دانا و یەکیەتی باڵی بەسەر بزووتنەوەکەدا کێشا.

ساڵی ١٩١١: بریتانیا و رووس ئۆلتیماتۆمیان دا بە ئێران. هەموو ئەوانەی وا لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیدا بوون پشتیان هاتە لەرزین. ئایا دەبیٚ هەڕەشەکەیان قەبووڵ بکرێت یان نا ؟ بەندێك لە بەندەکانی ئۆلتیماتۆم دەیگوت ئێران جگە لە جەندرمە، نابیٚ هێزی چەکداری سپایی هەبێت. رێبەرانی شۆڕش، کۆبوونەوەیەکی نهێنیان کرد. ئێمە جارێکی تر لەژێر دروشمی سووردا، سوێندمان خوارد بە شۆڕش وەفادار بمێنینەوە و لەبەرگی جەندرمەدا، ناوکی چەکداریی شۆڕش بپارێزین. من نێررامە "قوم" بۆ ئەوەی لەویٚ تاقمێك [جەندرمە؟] رێکبخەم و هەوڵم دا، ئەو ناوەندە بکەمە شوێنی حاوانەوەی شۆڕشگێڕانی "هەڵاتوو".

ساڵی ١٩١٤: فەرماندەی بریتانیایی و رووسیی هێزە داگیرکەرەکانی ئێران، چاویان بەرایی ئەوەی نەدەدا تاقمێکی

جەندرمەی وەك ئێمە ببینن كە ڕق و كینەی هێزی داگیركەرمان لە دڵدابوو. تاقمەكەی ئێمە هەڵوەشێنرایەوە و من كە لەودەمدا لەوێش نەبووم حوكمی ئیعدامم بۆ دەرچوو. ئینجا سنووری تورك و ئێرانیم بەزاند و بۆ ئەوەی زیاتر لە پێوەندیی شۆڕشدا بمێنمەوە، لە شارۆچكەی سلێمانی لەسەر سنووری تورك مامەوە. بەڵام توركیاش تێكەڵاوی شەڕ بوو. سنوور داخرا و هەموو پێوەندێك پچڕا. چۆن لە دەرەوەی وڵات بژیم و لە وڵاتی خۆم دابڕم ؟ بە پێیان چووم بۆ بەغدا و لەوێوە بۆ كرماشان. لەوێ بەشداریی شەڕی پارتیزانی دژ بە هێزی داگیركەرم كرد و بوومە یەكێك لەسەر نووسەرانی ڕۆژنامەی شۆڕشگێڕی "بیستوون". لێرە، لەو شوێنەدا كە ناوەندی ڕووداوەكان بوو، ژیانم تووشی گۆڕانكاری هات. ڕێگاكە هەنگاو بە هەنگاو بەرەو ژوور هەڵدەكشا.

لە ڕۆژانی مانگی فیبرەوەی ساڵی ١٩١٧ی ڕووسیادا، ناڕەزایی لەنێو هێزەكانی سوپای ڕووس لە كرماشان سەری هەڵدابوو. من هاوكاریی بۆلشڤیكەكانم دەكرد كە ترسیان دەخستە دڵی سەربازە ڕووسەكانەوە و لە كۆبوونەوەكانیاندا وتارم دەدا. هاوڕێ لەگەڵ ئەواندا بوومە ئەندامی ئەو كۆمیتە شۆڕشگێڕەی وا"پۆلیسی غەرب"ی تێكوەمەكان دا، ڕێكخراوەیەك كە لەلایەن بریتانیاوە دامەزرابوو. من، بەشداریی دامەزرانی یەكەمین ڕێكخراوەی كرێكارانی ئێرانم كرد و یەكەمین بەیانەكانیشی هەر خۆم نووسیم و چاپم كرد. كەم و زۆر لە هەموو ژمارەیەكی "بیستوون"دا شیعر و وتارم دەنووسی كە ناوەڕۆكیان بریتی بوو لە یەك شت: شۆڕش دەستی پێكردووە ! دوای

ئەوەی حوکمی سۆڤیەتی دامەزرا، سوپای رووسی لە ئێران کشایەوە، گاردە سپییەکانیش رۆیشتن، بەڵام پێش رۆیشتنەکە، کەڵکیان لە زۆریی ژمارەی خۆیان وەرگرت و شەڕێکی خوێناوییان بەسەر شۆڕشگێڕە ئێرانییەکاندا سەپاند.

من جارێکی دیکەش دەبوایە هەڵێمەوە بۆ تورکیا و ئەمجارەیان بۆ ئەستەمووڵ. لێرەدا، کەلەبەرێك دەکەوێتە بیرەوەرییەکانمەوە، وەك ئەوەی کات بەسەریدا تێپەڕ نەبووبێت. منداڵی بێخانەو لانەی ئەستەمووڵ منیان بە بێهۆشی لەسەر شەقام دۆزییەوە، چاودێرییان کردم و لە مردنیان رزگار کردم. شیعرێکی خۆم پێشکەش بەو منداڵانە کردووە و ناوم ناوە "هەتیوانی شەڕی جیهانی". لە ئەستەمووڵ، لە بەندەر و چێشتخانە و چاپخانە، هەروەها وەك مامۆستای قوتابخانە ئیشم کرد، بوومە سەر نووسەری گۆڤارێکی فارسی کە گەلێ زوو لەلایەن دەسەڵاتداریەتی تورکەوە وەستێنرا، چەند کۆمەڵە شیعری بچووکی خۆیشم چاپ کرد. شیعرە بەربڵاوە لیریکەکانی ئەستەمووڵم بە "کینایە" و "تەمسیل" نووسراون، دەنا سانسۆری سوپای تورك (کە لەلایەن بریتانیاوە کۆنترۆڵ دەکرا) هیچکام ئیجازەی بڵاوبوونەوەیانی نەدەدا. لەو شیعرانەدا خۆم بە پەپوولەیەك چواندوە و وڵاتەکەشم بە باخچەیەکی ژاکاو. لە شیعرەکەدا بریتانیا، ئەو زستانە نەفرەت لێکراوە بوو، کە گوڵاڵە سوورەی باخچەکەی هەڵدەوەراند یا ئەو راوچییە بێبەزەییە بوو کە پەپوولەی بریندراری ئەسیر دەکرد.

کاربەدەستانی تێنەگەیشتووی دەوڵەت، بە دیتنی ئەوەی بابەتی شیعرەکانم وەك زۆربەی شیعرە ماقووڵە فارسییەکان، بریتین لە باسی

پەپوولە و گولاڵە، بێدەنگێك ئێجازەیان دەدا شیعرە دژی ئیمپریالیستەكانم چاپ بكرێن و بنێردرێنەوە بۆ ئێران. لەوێ، ئەوانەی وا شیعرەكان روویان لەوان بوو، واتای راستەقینەیان دەزانی و شۆڕشگێڕان تێدەگەیشتن كە بانگەوازی من دژ بە ئیمپریالیستەكانە و هێرشە بۆ سەر سەرەك وەزیری نۆكەری بریتانیا "سید زیائەلدین تەباتەبایی"یە.

ساڵی١٩٢١: هەواڵ گەیشت كە شۆڕش جارێكی دیكە لە شاری "رەشت" هەڵگیرساوەتەوە. دەسەڵاتداریەتی توركیا، فیزەی چوونە دەرەوەیان پێ نەدام و سەرلەنوێ ناچاربووم بە گۆڕەپانی بێپایانی بیاباندا بڕۆم كە دواتر لە شیعری "نابێ ناڕازی بم"دا باسم لێوە كردووە. پێش ئەوەی بگەمەوە ئازەربایجانی ئێران، راپەڕینێكی ناوچەكە لەلایەن رەزاخانی وەزیری جەنگەوە كە درەنگتر بوو بە دیكتاتۆرێك، تێكشكابوو. سەرەڕای چاوەدێریی پۆلیس، توانیم پێوەندی بە هاوڕێیانی پێشووی نێو سوپاوە ببەستم، دەست بە پڕو پاگەندە لەنێو سوپاكەدا بكەم، و هێزێكی شۆڕشگێڕی نوێ كۆبكەمەوە. ئینجا لە مانگی جانیوەری ١٩٢٢دا، لەگەڵ ئەوان بچمە نێو شاری تەورێز.

هێزەكانی شا، لەوپەڕی تەسەلی و چەكداریدا بوون و لە باری ژمارەشەوە گەلێك لە ئێمە زیاتر، لەبەرانبەر هێزەكانی ئێمەدا، كە خواردن و چەكی تەواویشمان نەبوو و تەنیا بە هۆی ئەو راستیەوە كە خەباتكارانی ئێمە شۆڕشگێڕ بوون، ئەوان تێكشكان. لە یەكەم رۆژی مانگی فیبرەوەریدا، دەسەڵاتی شاری تەورێز كەوتە دەست "كومیتەی

شۆڕشگێڕ" کە ئازادی و نان و دامەزراوەیی بۆ خەڵك دابین کرد. یازدە ڕۆژی لەبیرنەچووی تەورێزی ئازاد و تێکشکانی دواتری ڕاپەڕینەکە لەلایەن هێزی یەکگرتووی دژی شۆڕشەوە، شتێك نین بە چەند دێڕ بێنە گێڕانەوە. من ئەم بابەتە لەسەر خۆم و ژیانی شاعیری خۆم دەنووسم و بۆ ئەو هاوڕێ گەنجانەی خۆم کە دڵنیگەرانی ئەوەن خەباتی سیاسی لە کاری خوڵقێنەریان دووربخاتەوە تاقە یەك شت دەڵێم:

ڕاست لەو ڕۆژانەدا کە زۆر جاران پێداویستی خواردن و خەویشمان لە بیردەچووەوە، من شیعری ڕاستەقینە لە دەروونمدا دەجۆشا و ئەگەر ڕۆژانێکی وا سەخڵەتم نەبوایە هەرگیز ئەو شیعرانە نەدەخوڵقان. هێزی سزادان [ی دەوڵەت]، لەسەر شەقامەکانی شاری تەورێز دەستیان کرد بە وێرانی و تالانکردن. بەشێك لە ڕاپەڕیوەکان ڕوویان کردە چیا و پاشماوەی ئێمە، بە شەڕکردن بەرەو سنوور کشاین. جادەکانی ئێران داخرابوون و ڕژیمی شا، ناوی ئێمەی وەك سەربزێو ڕاگەیاندبوو و جائیزەی بۆ سەرمان دانابوو. ئیتر وا دەردەکەوت وا کۆتایی ژیانم بێت.

بەلام لەو شەوە شوومەدا، کاتێ ئەسپەکەم لە ئاوی چۆمی ئاراسی دا، ڕووناکایی ڕۆخێك دەرکەوت. هەستم سەبارەت بەو کاتە، لە پارچە شیعرێکدا دەربڕیوە بە ناوی "بۆ گەڕان بەدوای حەقیقەتدا هاوار دەکەم". لە ساڵی ١٩٢٣دا گەیشتمە مۆسکۆ و وەك "پیتچن"لە "چاپخانەی ناوەندی گەل" لە یەکیەتی سۆڤیەتدا دەستم بە ئیش و کار کرد. گەلێك زوو، کتێبی شیعرەکانی خۆم، کە هەر خۆیشم پیتەکانم چنیبوون لەچاپ هاتەدەر. دواتر، لە هەمان چاپخانەدا بووم بە

کرێکاری ئەدەبی و لە رۆژێکی لەبیرنەچووی ساڵی ۱۹۲٤دا، بە ئەندامەتی حیزبی کۆمۆنیست وەرگیرام. ژیانی دوور لە وڵات و هاوزمانان بۆ شاعیر هاسان نییە. کاتێ بیستم لە تاجیکستان ئەو شوێنەی وا فیردۆسی و سەعدی بەرادەی نیشتمانی من ئێران لەنێو خەڵکدا خۆشەویستن، کۆماری سۆڤیەتی دامەزراوە چوومە ئەوێ و دەستم بە ئیش‌وکار کرد. ئێستا چەندە خۆشە سەیری شاری ستالین ئاوا بکەی و گوندی "دووشەنبە"ی پڕ قوڕ و چڵپاوی سی ساڵ پێش ئێستا واتە ئەو سەردەمەی من چووم، بێنیەوە بەر چاو. لەم ساڵانەی دواییدا، وا هاتوومەتە مۆسکۆ و لێرە دەژیم. بە بەر نووسینی شیعرەوە (کە ئێستا بریتییە لە ژیننامەکەم بە وێنە و شیعر)، خەریکی وەرگێڕانی شیعر و نووسراوەی پوشکین، گورکی، مایاکۆفسکی و، شاعیرانی هاوچەرخی سۆڤیەتم.

لەم دووییانەدا، ئۆتێلۆ، رۆمیۆ و ژولیەت و "لیشا"ی شکسپیر و شانۆگەرییەکانی "لووب دێ ڤیگا"م بۆ تێئاتری دراماتیکی ستالین ئاوا وەرگێڕاوە، دەستیشم کردووە بە وەرگێڕانی کۆمیدیای نەمری Wit works woeی گریبایدۆف.

## پەراوێزەکان:

(١) وتارەکە سەرەتا لەم گۆڤارە رووسیەدا چاپ کراوە:

Soviet Literature, No. 9, 1954, pp. 138-142.

ئینجا وەرگەڕاوەتە سەر ئینگلیزی ولەم سەرچاوەیەدا بڵاوبووەتەوە:

Abdulkasim Lahuti, "About Myself", Critical Perspectives on Modern Persian Literature, edited and compiled by Thomas M. Ricks, Washington DC., Three Continents Press, 1984, pp. 373-377.

(٢) کوڕە پینەچییەکی دایك کوردی لە کرماشان لەدایکبوو، بۆ راکێشان و هاندانی منداڵانی هاوتەمەنی خۆی زۆر وا هەیە "رەجەزە"کانی خۆی بە کوردی گوتبێت بۆ ئەوەی هاوتەمەنەکانی لێی تێبگەن. بەداخەوە نموونەی ئەو شیعرانە بە دەستەوە نین.

(٣) لاهووتی دەروێشی خانەقای نیعمەتوڵڵاهی و موریدی "سەید ساڵحی حەیرانعەلیشا"بووە.

(٤) لاهووتی نێوی ئەو رێکخراوەیە ناهێنێ، بەڵام وا هەیە حیزبی سوسیال دێمۆکراتی ئێران بووبێت.

(٥) تاوانی کوشتنی ئەفسەرێکی سوێدی و دوو کەسی ئێرانی درایە پاڵ لاهووتی و هەر ئەوەبوو بە هۆی یەکەم هەڵاتنی بۆ

عوسمانی، بەڵام لێرەدا باسی هۆی ئەم و هەڵاتنە و هۆی دەرچوونی حوکمی ئێعدام بۆ خۆی ناکات.

(٦) گۆڤاری پارس.

(٧) ئاماژەیە بە بزووتنەوەی ناسراو بە "خیابانی" (١٩١٩-٢١) لە تەورێز و ئازەربایجان. رێبەری بزووتنەوەکە شێخ محەممەدی خیابانی لەلایەن رژێمی رەزاشاوە کوژرا. بۆچوونی لاهووتی لەمەڕ رەزاخان، رەنگدانەوەی سیاسەتی سۆڤیەتە، کە رەزاخانی پەهلەوی (دواتر رەزاشا) لە سەرەتای دەسەڵات سەندنیدا، بە "عونسوورێکی میللی و دژی ئیمپریالیستی" دەناسرا و وای بۆ دەچوون کە دەتوانێ بەرگری لە دەسەڵاتی ئینگلیزییەکان لە ئێراندا بکات.

(٨) لاهووتی باسی تکاکاریی خۆی لە "مخبرئەلسەڵتەنەی هیدایەت" والی ئازەربایجان بۆ گەڕانەوەی نێو ریزی جەندرمە ناکات.

(٩) سیسیلی بانو، کاری تەرجەمەی رووسی شاهنامەی فیردەوسی لەدوای مردنی لاهووتی درێژە پێدا و هێنایە کۆتایی.

ئەم وتارە پێشتر لە ژمارە ٢٨ی گۆڤاری گزنگ چاپی سوێد (هاوینی ساڵی ٢٠٠٠) دا بڵاو کراوەتەوە.

# پاشکۆی دووهەم

## کورد و کوردستان

**نووسینی ئەبولقاسم لاهووتی**

**وەرگێڕانی دوکتۆر جەبار قادر**

دوکتۆر جەبار قادر لە رووسیەوە کردویە
بە کوردی و پێشەکی و تێبینی بۆ نووسیوە،
هۆڵەندە، ١٩٩٨.

**پێشکەشە بە هەڵگرانی بیری خاوێنی کوردایەتی و کوردستانێتی و هەموو ئەوانەی ئامادەن لەپێناوی سەرکەوتنی ئەو بیرە پیرۆزەدا و گەشتنی کورد بە سەربەخۆیی و ئازادی و دیموکراسی تێبکۆشن. وەرگێڕ**

## پێشەکی

بابەتی ئەم نامیلکەی لەبەر دەستی خوێنەری ئازیزدایە پێش سێ چارەکە سەدە بە زمانی رووسی تۆمار کراوەو چەند ساڵێکە کراوە بە کوردی. مخابن لەبەر کۆمەڵێ هۆ کە لای خوێنەری کورد ئاشکران و پێوەندییان بە باری گشتی رۆشنبیری و چاپەمەنی کوردییەوە هەیە، بلاوکردنەوەی دواکەوت. نووسەری ئەم باسە شاعیری کۆمۆنیستی

ئێرانی ئەبوالقاسمی لاهووتییە کە ڕۆژهەڵاتناسانی یەکیەتی سۆڤیەتی جاران بە شاعیرێکی شۆڕشگێڕی ئێرانی بەڕەچەڵەک کوردیان لە قەڵەم داوە. لاهووتی وتارەکەی لەژێر ناونیشانی "کورد و کوردستان"دا لە گۆڤاری ڕۆژهەڵاتی نوێ" "دا لەساڵی ١٩٢٣ لە مۆسکۆ بڵاو کردۆتەوە.

کاتێ لاهووتی باسەکەی بڵاوکردەوە زۆر نەبوو گەیشتبووە یەکێتی سۆڤیەت و وادیارە هێشتا زمانی ڕووسی بەو شێوەیە نەزانیوە کە وتاری پێ بنووسێ، بۆیە باسەکەی بە فارسی نووسیوە و دوایی کراوە بە ڕووسی. پێم وایە بە خۆی یارمەتییەکی زۆری وەرگێڕەکەی داوە، چونکە باسەکە زنجیرەی ڕووداوەکان بە ڕێکوپێکی دەگێڕێتەوە و هەڵەی زۆری تێدا نیە بەتایبەتی لەنێوی کەسایەتی و نێوچە و ئاوایی و چیاو باژێڕەکاندا. نێوی وەرگێڕەکە لە هیچ شوێنێکی باسەکەدا بەرچاو ناکەوێ، تەنها بە هۆی دوو پەراوێزەوە کە لەلایەن وەرگێڕەکەوە نووسراون دەزانین کە ئەم باسە لە بنەڕەتدا بە فارسی نووسراوەو لە دواییدا کراوە بە ڕووسی.

بۆ یەکەمین جار نێوی ئەم باسەم لە ناوەراستی حەفتاکاندا لە هەندێ کتێب و لێکۆڵینەوە و سەرچاوەی ڕووسیدا بەرچاو کەوت و بەوردی خوێندمەوە و بۆ ئامادەکردنی دوکتۆرنامەکەی خۆم کەڵکم لی وەر گرت.دوای ئەو ڕۆژانە بە بیست ساڵ جارێکی تر لەگەڵ وتارەکەی لاهووتیدا ڕووبەڕوو بوومەوە، کاتێ برای هێژا و وردەکار کاک عەبدوڵا مەردۆخ داوای لێکردم ئەو باسە بکەم بە کوردی بۆ ئەوەی لە ژمارەی یەکەمینی گۆڤاری (بڕوا)دا، کە بە تەمای دەرکردنی بوو، بڵاوی

بکاتەوە. دوکتۆر عەبدوڵا مەردۆخ بەتەما بوو هەر لەو ژمارەی گۆڤارەکەیدا وتارێکی تێر و تەسەلیش لەسەر ژیانی لاهووتی بە خوێنەران پێشکەش بکات. مخابن وا بوو بە چوار ساڵ ئەو هیوایەی کاکە مەردۆخ نەهاتە دی و وەرگێڕاوەکەی منیش هەروەکوو خۆی بە تۆمارنەکراوی مایەوە. بۆیەکا ناچار بووم لە شێوەی ئەم نامیلکەیەدا بڵاوی بکەمەوە. هیوادارم و گومانیشم نیە لەوەی کاک عەبدوڵا مەردۆخ لە هەر کوێیەک بێت دڵی بەم کارە خۆش دەبێ.

ئەوەی راستبێ لەو رۆژانەدا کە من باسەکەم کرد بە کوردی زانیارییەکی ئەوتۆم لەبارەی ژیننامەی (بیۆگرافیای) لاهووتییەوە لەبەر دەستدا نەبوو و زۆریشم بە پێویست نەدەزانی، چونکە باسەکە دەبوایە وەکوو وتارێك لە گۆڤارێکدا کە لە هەمان ژمارەدا وتارێکی تری لەمەڕ ژیانی لاهووتی دەگرتە خۆی بڵاوبکرابایەتەوە. کە ئەوە بەدی نەهات و ئێستا لە شێوەی ئەم نامیلکەدا بڵاو دەبێتەوە، ئەوا بە پێویستی دەزانم هەرچەندە بە کورتیش بێ خوێنەری هێژا لەگەڵ رووداوە گرنگەکانی ژیانی لاهووتیدا ئاشنا بکەم. مخابن ئەو سەرچاوە رووسییانەی کە من دەستم دەیانگاتێ زانیارییەکی ئەوتۆ لەمەڕ ژیان و بەرهەم و چالاکییەکانی لاهووتی پێشکەش ناکەن.

خۆشبەختانە لە کۆتایی ساڵی رابردوودا برایانی بەرێزی رۆژنامەی "پەیام" کە لە لەندەن دەردەچێ، دیارەییەکی بەنرخیان لەگەڵ ژمارەی یەکەمینی ئەو رۆژنامەیەدا بۆم نارد، ئەویش نامیلکەیەك بوو بە نێوی "هێلکەی دۆڕاو" لەسەر ژیانی ئەبوالقاسمی لاهووتی کرماشانی، کە لەلایەن کاك ئەنوەر سوڵتانییەوە نووسراوە. ئەو نامیلکەیەی کاك

ئەنوەر سوڵتانی گەلێ زانیاری لەسەر ژیانی لاهووتی تێدایە و لە نیشاندانی رووداوە گرنگەکانی ژینی لاهووتیدا یارمەتیدەری نووسەری ئەم چەند دێڕە بوونە. جێگەی خۆیەتی لێرەدا دەستخۆشی لە کاك ئەنوەر سوڵتانی بکەم و سوپاسی برایانی دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی "پەیام"یش بکەم.

کوردناسی رووس م. س. لازەرێڤ لە بارەی لاهووتییەوە دەڵێ "شۆڕشگێڕی فارس ئەبولقاسمی لاهووتی کە بە رەچەڵەك کوردە یەکێتی سۆڤیەتی کرد بە نیشتمانی دووەمینی خۆی و هەر لێرەش نێوبانگی دەرکرد، لە یەکەمین لێکدانەوەی مەسەلەی کوردا لە بۆچوونێکی مارکسییەوە، کە تاوەکووئەمڕۆش گرنگیی زانستی خۆی لە دەست نەداوە، ئاماژەی بۆ ئەم چوار هێڵ و رێبازە کردووە لە بزاڤی کوردا لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیی:

١. سەربەخۆیی تەواو کە پرۆگرامی رۆشنبیران بوو.

٢. ئۆتۆنۆمی نێوخۆیی لەژێر چاوەدێری تورکدا کە دروشمێکی ناپەسەند و لەلایەن کۆمەڵێکی بچووکی سیاسەتمەدارانی کوردەوە بەرز کرابووە.

٣. سەربەخۆیی لەژێر سەرپەرشتی ئێرانا کە ئامانجی دەستەیەکی سیاسەتمەداری نێوداری کورد بوو بە رابەرایەتی سەرۆکی شاندەی کورد لە پاریس شەریف پاشا کە لەم بارەیەوە تەنانەت گفت و گۆشی لەگەڵ وەزیری ئێرانا موشاورئەلمولك کردبوو، بەڵام کابینەی وەزیرانی ئێران کە سەر بە ئینگلیز بوو لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نەبوو.

٤. کوردستانی سەربەخۆ لەژێر مەنداتی بریتانیادا، نوێنەرانی ئەم رێبازەش لایەنگرانی شێخ عەبدولقادر وموستەفا پاشا و کوردە پایە بڵندەکانی تر بوون.

له شوێنێکی تردا لازەرێڤ کە پەنا دەباتە بەر وتارەکەی لاهووتی لە بارەی نووسەرەیەکەوە دەڵێ "لاهووتی بە خۆی رۆژانێك تێکەڵاوی کاروباری کورد بووە و لە چاەرنووسیاندا بەشداری کردووە".

ئەم باسەی لاهووتی بۆ ئەو رۆژانە زانیارییەکی باشی تێدا بووە و ئەوەی دەردەخست کە نووسەرەکەی لەنزیکەوە ئاگاداری باری سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردەواری بووە لەمبەر و ئەوبەری سنوور. ئەوەی لەم بوارەدا گەلێ یارمەتی لاهووتی داوە ئەو راستییەیە کە بە خۆی چالاکانە لە رووداوەکانی ئەو دەمانەی باسیان لێوە دەکات بەشداری کردووە. سەردانی ئەستەموولێ بۆ دوو جاران هەلی ئەوەی بۆ رەخساندووە لەنزیکەوە ئاگای لە خەبات و چالاکی کۆمەڵ و رێکخراوە و کەسایەتییە نێودارەکانی کوردی ئەو شارە هەبێ. ئەم کاتە ئەو شارە مەڵبەندی سەرەکی بزاڤی رۆشنبیری و سیاسی کورد بووە و زۆربەی هەرە زۆری سیاسەتمەدارانی کورد لەوێ گردببوونەوە و خەریکی دامەزراندنی رێکخراوە و بڵاوکردنەوەی رۆژنامە و گۆڤار بوون. بە دووریش نازانرێ لاهووتی بەشداری لە هەندێ لەو چالاکییانەدا کردبێ. هەروەها ژیانی لەنێو عێڵی سەنجابیدا بۆ ماوەیەك هەلێکی فرەباشی بۆ رەخساندووە کە لەنزیکەوە تاقیبی ژیانی رۆژانەی خێڵە کوردەکان بکاو بە باشی ئاگای لە خوو و نەریتیان هەبێ و بتوانێ سەرکەوتووانە هەندێ دیاردەی کۆمەڵی کوردەواری لێکی داتەوە.

بە لێکدانەوەی چەند دێڕێکی شیعری هەندێ لە شاعیرانی کورد کە لە باسەکەدا بڵاوکراوەتەوە، مرۆڤ دەتوانێ بڵێ کوردییەکی باشی زانیوە و ئاگای لە ئەدەبیاتی کوردیش هەبوە. هەموو ئەو هۆیانە

باسەکەی لاهووتیان لای رۆژهەلاّتناسانی یەکێتی سۆڤیەت گرانبا کردووە و دەتوانم بڵێم لەم سێ چارەکە سەدەی پێشوودا بە دەگمەن بەرهەمێکی زانستی گرنگ هەیە بە زمانی رووسی کە لە مێژووی نوێ و هاودەمی کورد دوابێ و ئاماژەی بۆ ئەم بەرهەمەی لاهووتی نەکردبێ. دەڵێن گوایە لینینیش یەك دوو جاری خوێندۆتەوە. وا دیارە لاهووتی لەم وتارە زیاتر هیچی لە بارەی کوردەوە بلاو نەکردۆتەوە، چونکە خاتو موسائیلیانیش لە "بیبلۆگرافیای کوردۆلۆجیا"دا تەنها باسی ئەم وتارەی لاهووتی کردووە. موسائیلیان نێوەرۆك و بابەتەکانی باسەکەی لاهووتی بەم شێوە فراوانە بە خوێنەرانی بیبلۆگرافیاکەی خۆی ناساندوە: کوردستانی تورکیا گرێ کوێرەی ململانێی تورکیای کەمالی و سیاسەتی ئینگلیز بۆ داگیرکردنی باکووری میزۆپۆتامیا و دامەزراندنی بنکەیەکی کوردی لە نزیك نەوتی مووسڵ، هەڵکەوتی جوگرافی کوردستان، رەچەڵەکی ئێرانیی کورد، دابەشبوونی کورد بەسەر کوردی کۆچەری تورکیا و کوردی زیاتر نیشتەجێی ئێران، ئابووری کورستان، سیستەمی پەتریارخی (باوکێتی)، ئاین، باری ژنان، ئەدەبیات وشیعر، خوو و نەریت، پەروەردە و فێرکردن، بزووتنەوەی کوردەلاوەکان و بنەمای چینایەتیان، کورد و ئیمپریالیزمی ئینگلیز، و بزاڤی کوردان بەسەرۆکایەتی سمیتکۆ).

خوێنەری باسەکەی لاهووتی یەکسەر هەست بەوە دەکات کە نووسەرەکەی شارەزاییەکی باشی دەربارەی باری سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد هەبوە، هەڵبەتە بە کێش و پێوانی ئەو دەمە کە زانیاری دەربارەی کێشەی کورد و باری سیاسی کورد زۆر کەم بووە و

بۆ کوردناسانی نەك هەر ئەو دەمەی یەکێتی سۆڤیەت کە تەنها یەك ساڵ بوو وەکوو دەوڵەتێك دامەزرابوو، بەڵکوو بۆ ساڵانێکی دوور ودرێژ کوردناسانی ئەو وڵاتە هەر پەنایان بۆ دەبرد. تەنها بۆ نموونەی ئەو نرخاندنەی سەرەوەی لازارێڤ بۆ باسەکەی لاهووتی تەنها دوو ساڵ پێش لەنێوچوونی یەکێتی سۆڤییەت تۆمار کراوە. هەندێ لێکدانەوەی لاهووتی بەتایبەتی دەربارەی رێبازە سەرەکییەکانی بزاڤی نەتەوەیی کورد لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانیی تاوەکوو ئەمڕۆش لەلایەن کوردناسانی رووسیاوە پەیڕەو دەکرێ.

هەروەها پێناسەی لاهووتی بۆ ناسیۆنالیزمی کوردی و دەستنیشانکردنی سروشتی ئەو ناسیۆنالیزمە بە هەڵسەنگاندنێکی زانستی و دووربین لەقەڵەم دەدرێ. هەروەها پێناسەی لایەنەکانی ئەو ناسیۆنالیزمەی لێکداوەتەوە و گەیشتوەتە ئەو ئەنجامە کە گوایە ناسیۆنالیزمی کورد راستە هەوڵ بۆ سەربەخۆیی کوردستان دەدا، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو ناسیۆنالیزمە لاواز و بێهێزە، ئامادیە هەر بە خۆی ئەو سەربەخۆییە بخاتە ژێر رکێفی بیانیەوە کە ئەو کاتە بریتی بوون لە ئینگلیز و تورك و فارس. ئەو ناتەواوییەی ناسیۆنالیزمی کوردیشی وەکوو بەرهەمێکی سروشتیی کۆمەڵی دواکەوتووی کوردەواری بینیوە. ئەو ناسیۆنالیزمە بە بۆچوونی لاهووتی نەدەگەیشتە ئاستی ناسیۆنالیزمی تورك و فارس و هند و تەنانەت هەندێ لە وڵاتە عەرەبییەکانیش وەکوو میسر و زۆریش لە بزاڤی ناسیۆنالیستەکانی عیراق و سووریا و لوبنان، کە ئەوانیش کەوتبوونە ژێر رکێفی ئینگلیز و فەرەنسییەکانەوە، جودا نەدەکرایەوە.

هەندێ لە وتە و بۆچوون و تۆمەتەکانی لاهووتی لەمەڕ بزاڤی نەتەوەیی کورد کە لەگەڵ لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی ستالیندا لەمەڕ ناسیۆنالیزم و بزاڤی نەتەوەیی گەلانی ژێردەستەی یەکیان دەگرتەوە، بوون بە بنێشتی بن دانی کوردناسان و ڕۆژهەڵاتناسانی یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتانی تری بە نێو سۆسیالیزم و تاوەکوو شەستەکانی ئەم سەدەیە لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتناسایی ئەو وڵاتانەدا بە شێوەیەکی زەق بەر چاودەکەوتن. مەبەست ئەو دیتن و بۆچوونە بوو کە گوایە بیروباوەڕی جووڵانەوەی کوردایەتی و دامەزراندنی کۆمەڵ و ڕێکخراوەکانی کورد لەلایەن ئینگلیزەوە دروست کراون و سەرانی کورد پیاوی ئینگلیزن و زوو بە زوو هەڵوێستیان دەگۆڕن و هەر جارەی بە هان و فیتی لایەك دژی دەوڵەتانی نێوچەکە رادەپەڕن. ئەم بۆچوونانەی لاهووتی کە لەلایەن کوردێکەوە (تاوەکوو ئێستا نازانرێ ئاخۆ لاهووتی خۆی بە کورد زانیوە، یان فارس یاخود تاجیکی یانیش بە کۆمۆنیستێکی ئینتەرناسیۆنالیست کە گوایە بەلایەوە گرنگ نیە رۆڵەی چ گەلێکە، بەڵکوو بۆ ئەو ئەوە گرنگە رۆڵەی کام چینە) نووسرابوون و بە یەکەمین راڤەکردن و لێکدانەوەی مارکسیانەی دۆزی کورد لەقەڵەم درابوون، بوونە مۆرێك بە نێوچەوانی بزاڤی نەتەوەیی کوردەوە و لە بەرهەمی ڕۆژهەڵاتناسانی یەکێتی سۆڤیەت و لە پاشان لە وڵاتانی تری بەرەی بەنێو سۆسیالیستدا و بەرهەمی هەموو فەریکە کۆمۆنیستێکی گەلانی سەردەستە و وشکە دەروێشێکی مارکسی نێوچەکە و جیهاندا هەتا سەرەتای شەستەکانیش هەر دەگوترانەوە.

بۆ تێگەیشتنی هەندێ لەو مەسەلانە و گەلێ بابەتی تر کە پەیوەندی بە لاهووتیەوە هەیەو، لەبەر ئەوەی لە زۆر سەرچاوە و

لێکۆڵینەوەدا نێوی ئەم باسەی لاهووتی دێتە پێشەوە، پێم وایە لە جێی خۆیدایە خوێنەری کورد هەلی ئەوەی هەبێ بە زمانی کوردی بیخوێنێتەوە. ئەگینا مرۆڤ بۆی هەیە بپرسێ ئایە دەبێ نرخی زانستیی وتارێك کە سێ چارەکە سەدە پێش ئەورۆ تۆمار کرابێ و لە چوارچێوەی بیر و بۆچوونێکدا نووسرابێ کە ئەورۆ زۆر باوی نەمابێ و کاڵ بووبێتەوە، چی بێ هەتا بکرێ بە کوردی؟

لاهووتی ئینتەرناسیۆنالیست لەم باسەیدا لەبیری نەچوە هیچ نەبێ بەرامبەر بە کورد ئێرانچێتییەکی تۆخ بکا و هەلی لەدەست نەداوە بۆ چەسپاندنی بیری لکاندنی کورد و کوردستان بە ئێرانەوە وگرێدانی زمان و کولتوور و ئەدەبیاتی کورد بە زمان و کولتوور و ئەدەبیاتی فارسەوە. وەرگێڕی رووسییەکەی تەنها دوو پەراوێزی بۆ باسەکە نووسیوە. بە نووسینی دوو پیتی (و.ر) لە کۆتایی ئەو پەراوێزانەدا لە تێبینی و پەراوێزەکانی خۆمم جودا کردوونەتەوە.

## کوردستان و کورد

**نووسینی: لاهووتی**

ئەو رۆژانە کوردستانی تورکیا (١) بووەتە گۆڕەپانی سەرەکیی ململانێ و دژایەتی و زۆرانبازی لەنێوان تورکیای کەمالی و هەواڵەکانی ئینگلیزدا بۆ داگیرکردنی باکووری میزۆپۆتامیا و دامەزراندنی بنکەیەکی کوردی نزیك کانگا نەوتەکانی ویلایەتی مووسڵ (٢). لەم پێشبڕکێ و ململانێیەدا هەردوولا هەوڵ دەدەن تایبەتمەندییەکانی بزاڤی نەتەوەیی کورد لەپێناوی وەدیهێنانی

ئامانجەکانی خۆیاندا بە کار بێنن. بیروباوەڕی ناسیۆنالیزم و جوداخوازی کورد کە بە شێوەیەکی زیرەکانە لەلایەن دیپلۆماتە ئینگلیزەکانەوە جۆش دەدریٚ، ئەو چەکەیە بە دەستیانەوە کە دەبیٚ ببێتە هۆی لاوازی وشکستی سیاسەتی تورکیا لە میزۆپۆتامیادا. کوردستانی سەربەخۆ بە سەرۆکایەتی شێخ محموودی گوێڕایەڵی ئینگلیز، دەبیٚ دەوڵەتۆکەیەکی بەربەست و جوداکەرەوە بیٚ لەبەردەم تورکیای کەمالیدا و تا رادەیەکیش دژی ئێران. ئەمە بوو پلانی ئینگلیز لە کوردستانی تورکیادا، بەڵام پلانەکە تووشی کۆمەڵی تەنگوچەڵەمەی سەخت هاتووە. جاریٚ مەسەلەی دڵسۆزیی شێخ مەحموود بۆ سیاسەتی ئینگلیز خۆی لە خۆیدا کێشەیەکی گەورەیە.

هەروەها دەرکەوت کە بزاڤی نەتەوەیی کورد زۆر لەوە ئاڵۆزتر و سەربەخۆترە کە ئینگلیزەکان بتوانن وەکوو داردەستێکی دڵسۆز بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەردەوام بەکاری بێنن. بروسکە و نامەکانی ئەو دواییەی شێخ مەحموود بۆ نوێنەرانی وڵاتە ئەورووپاییەکان کە تێیاندا ناڕەزایەتی و تووڕەیی خۆی بەرامبەر بە سیاسەتی زۆردارانەی ئینگلیز لە کوردستاندا دەربڕیوە، هەروەها دەرچوونی لە شاری سلێمانی و دەستکردنەوەی سەرلەنوێی بە خەبات و چالاکی لەپێناوی دەستگرتنەوە بەسەر بزاڤی نەتەوەیی کوردا، هەموو نیشانەی دابڕانین لەگەڵ فەرماندەی سوپای ئینگلیزدا.

ئەو رووداوانە ئەوەمان پیٚ رادەگەیەنن کە بزووتنەوەی کوردان پێی ناوەتە سەردەمێکی نوێوە و لەپێشکەوتندایە. ئەگەر بێتو سەرکردەکانی تورکیای کەمالی بە باشی لەو ئەرکە بگەن کە نێوچەکە پێویستی پێیەتی،

واته ئەرکی دامەزراندنی بەرەیەکی گشتیی دژی پیلانەکانی ئیمپریالیزم و دان بە ماف و تایبەتمەندییەکانی جووڵانەوەی کوردا لە چوارچێوەی تورکیایەکی نوێدا بنێن، ئەوا دەتوانن کارتەکە لەدەست ئینگلیز وەدەربێنن و شوێن پێ بۆ خۆیان لە باشووری کوردستاندا پەیدا بکەن و ببن بە خاوەن دەسەڵات بەسەر هەموو باکووری میزۆپۆتامیادا، چونکە ئەو بەشەی کوردستان بە راستی خاوەن دەسەڵاتە بەسەر هەموو باکووری میزۆپۆتامیادا. کوردستانی تورکیا ئەمڕۆ بەسەر دوو لایەندا دابەش بووە. باشوور کە پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ ئینگلیزدا هەیە و پلانەکانی ئەوان رەچاو دەکاو، باکوور کە وادیارە چەکێکی کارایە بەدەست کەمالییەکانەوە و لەوەیە ببێتە بنکەیەکی سەرەکی بزووتنەوەی کورد و ئاسۆیەکی نوێ بە هەموو واتای ئەو وشەیەوە لەبەردەم مەسەلەی کوردا بڕەخسێنێ. ئاشکرایە کە لەم کاتانەدا لێکدانەوەی بزاڤی کورد و هەموو پرسەکانی کورد و تورك گرنگییەکی تایبەتی هەیە.

هەر لەبەر ئەوەش بە رای من کاتی ئەوە هاتووە هەندێ بایەخ بدرێ بە شیکردنەوە و لێکدانەوەی دۆزی کورد کە تاوەکوو ئێستا بایەخێکی کەمی پێدراوە. ئەگەر بە چاوێکی گشتیی بڕوانینە وڵاتی کوردان و ئەو نێوچانەی کورد تێیدا نیشتەجێ بوونە، ئەوا دەبینین ئەو وڵاتە نێوچە سنوورییەکانی نێوان تورکیا و ئێران پێکدێنێ. دەتوانین بڵێین کە وڵاتی کوردەواری لە باشوورەوە دەگاتە مووسڵ و لە باکوورەوە خۆی لە مەرزەکانی لازستانی دەدا و لە رۆژئاواوە تاوەکوو ناوەڕاستی ئەنادۆڵ دەکشێ و لە رۆژهەڵاتیشەوە لە کرماشان و سابڵاخەوە تاوەکوو قەدپاڵەکانی ئارارات دەگرێتەوە.

هەموو نووسەرە ئەورووپاییەکان کە خۆیان بە لێکدانەوە و شیکردنەوەی دۆزی کوردەوە خەریك کردووە، هاوبیرن لەو بۆچوونەدا کە کورد هیچ کاتێ مێژوو و کولتووری نەتەوەیی خۆی نەبوە(۳). هەروەها رۆژهەڵاتناسانی ئەورووپایی گەلێ بیر و بۆچوونی جیاوازیان لەمەڕ بنەچەو رەچەڵەك و رەگەزی کوردەوە هەیە. بۆ نموونە یەکێ لەوانە کە سێر جۆن ماڵکۆڵمە ماوەیەکی زۆری بۆ دۆزینەوەی رەچەڵەکی کورد و کردنەوەی گرێکوێرەکانی ئەو پرسە لە رێگەی داستان و ئەفسانە دێرینەکانی رۆژهەڵاتی کۆنەوە بەسەر برد. لە کۆتاییدا گەیشتووەتە ئەو باوەڕە کە ئەو ئەفسانە و داستانە دیرۆکیانە نێوی کوردیان نەبردووە وە شوێنەواری کوردیان پێوە دیار نیە.

یەکەمین و تاقە مێژوونووسی کورد شەرەفخانی بدلیسی کە لە ساڵی ۱٥۳۲ هاتۆتە دونیاوە و کتێبێکی لەبارەی مێژووی کوردەوە بە نێوی "شەرەفنامە"وە نووسیوە (٤). ئەم کتێبە بووەتە سەرچاوەی هەرە گرنگ بۆ هەموو نووسەران و هەمیشە زانیاری لێوە هەلدەگۆزن. نووسەری شەرەفنامە لەو باوەڕەدایە کە کورد بە رەگەز گەلێکی ئێرانیە و لەوکاتەدا کە ئەژدەهاك ئێرانی داگیر کردووە، کوردەکان پەنایان بردۆتە بەر ناوچە شاخاوییەکانی ئەو کوردستانەی ئەوڕۆ و لەوێدا خۆیان حەشار داوە و ئیتر لەوکاتەوە خاوەن دەسەڵات نەبوونە و هەمیشە لەلایەن دراوسێکانیانەوە، بەتایبەتی لەلایەن ئێرانەوە فەرمانڕەوایی کراون. مێژوونووسە ئەورووپاییەکان نێوەرۆکی ئەفسانەکەی ئەژدەهاکیان روون کردۆتەوە و گرێکانیان کردۆتەوە و ئەوەیان بە راشکاوەیی راگەیاندووە کە لە مێژوودا کەسێك بە نێوی

ئەژدەهاکەوە نەبوە. بەلای ئەوانەوە ئەو نێوە تەنها نموونەی هێزێکی بێگانە بووە کە بۆ هەزار ساڵ دەستی بەسەر ئێراندا گرتووە. ئەو هێزەش بە باوەڕی هەموویان ئاشوورییەکان بوونە.

هەروەها ئەو مێژوونووسانە لەوباوەڕەدان کە ئەو دەمە کوردەکان هەردەکانی ئێرانیان بەجێهێشت و بەرەوچیاکانی کوردستانی ئەوڕۆ باریان کرد. بەڵگە زمانەوانییەکانیش بە شێوەیەکی گومانلێنەکراو ئەو راستیەمان لا دەچەسپێنن کە کورد بە رەچەڵەك ئێرانییە. رێزمانی زمانی کوردی و وشە و رەستەکانی هەر وەکوو ئەوەن کە لە زمانی فارسیدان، بەڵام لە کاتێکی دەرنگدا کۆمەڵی وشە و زاراوە لە زمانە دراوسێکانەوە وەکوو عەرەبی و تورکی وگورجی و ئەرمەنی..... هتد هاتوونەتە نێو زمانی کوردییەوە (٥).

هەروەها ژیانی کوردەواریش بەڵگەی روون و ئاشکرای ئێرانێتی کوردن. داب و نەریتەکانی کورد و جەژنە نەتەوەییەکانیان هەر ئەوانەن کە لە ئێراندا باون. جەژنەکانی ئێران واتە جەژنەکانی بەهار و پاییز کە پەیوەندییان بە خۆرپەرەستییەوە هەیە و بە هاتنی ئیسلامیش لەنێو نەچوون، جەژنی سەرەکی کوردیشن. لێرەدا مەبەست جەژنەکانی نەورۆز و میهرەگانە. ئەمەی دواییان ئێستا لە ئێراندا ئاهەنگی بۆ ناگێڕدرێ، بەڵام تاوەکوو سەرەتای سەدەی رابردوو هێشتا لە هەندێ نێوچەی ئێراندا پێشوازی لێدەکرا. بەم شێوەیە مەسەلەی ئێرانێتی کورد واپێدەچێ بڕابێتەوە. بەهۆی زنجیرەیەك شەڕ و بەیەکدادانەدا لەنێوان تورکیا و ئێراندا خێڵ و هۆزە کوردیەکان بە شێوەیەکی ناڕێك لەنێوان هەردوولادا دابەش بوون. زۆربەیان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی

تورکیاوە و بەشە کەمەکەیان بەر ئێران کەوت. دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەو دابەشکردنە بە گشتی لەسەر بناغەی ئاینیی بوو، چونکە کوردەکانی ئێران بەزۆری شیعەن و ئەو کوردە سونییانەی لە ئێران دەژین زۆربەیان لە کوردستانی تورکیاوە هاتوونەتە ئێران و تاوەکوو ئێستاش پەیوەندییان بە هێزە لەگەڵ ئەو ناوچانەی لێوەی هاتوون (٦). تەنها کوردەکانی کەڵهوڕ و کولیایی شیعەی راستین، چونکە کوردەکانی تر ئەلیەلاهین (عەلی ئیلاهی یا عەلیەلاهی.ج).

گەلێ جیاوازی لەنێوان کوردەکانی تورکیا و ئێراندا هەیە. بۆ نموونە هۆزە کوردەکانی ئێران ئێستا ژیانێکی نیمچە نیشتەجێ دەژێن، تەنانەت کوردە کۆچەرەکانیش بەشێکی ساڵ بە کشت وکاڵ و وەرزێرییەوە خەریکن، لە کاتێکدا کوردەکانی تورکیا بە شێوەیەکی سەرەکی خەریکی مەڕ و مالأت و پەز و ئاژەڵ بەخێوکردنن و ژیانی وەرزێری و کشت وکاڵ کەمتر سەرنجیان رادەکێشێ.

جۆری ژیانیش هەڵبەتە لە داب و نەریت و ژیانی کۆمەلأیەتی هەردوولادا رەنگی داوەتەوە. کوردەکانی ئێران لەلایەن جلوبەرگ و ژیانی خێزانییەوە زیاتر کەوتوونەتە بەر کاریگەریی شارستانێتی و ژیانیان رۆژ لەدوای رۆژ لە ژیانی دانیشتوانی شارەوە نزیك دەبێتەوە. ئەم دیاردانە لای کوردەکانی ئێران گەلی روون و زەقترن لەوەی لای کوردەکانی تورکیا. زمانی کوردەکانی تورکیاش کە لە بنەڕەتدا هەر بە فارسی ماوەتەوە، زیاتر وشەی تورکی و گورجی و رووسی تێکەلأو بوونە و ئاوازێکی ناسازیان داوەتێ (٧).

کوردەکان بەسەر کۆمەڵێ عەشیرەتدا دابەش بوونە، کە ئەمانەش بەسەر چەندین هۆز و خێڵ و تیرە و بنەماڵەدا دابەش دەبن. لێرەدا

تەنها نێوی هۆز و عەشیرەتە گەورەکانی کورد دەبەین. کوردەکانی ئێران لەم عەشیرەتانەی خوارەوە پێکهاتوون: کەڵهوڕ، سەنجابی، قەڵخانی، نەیرەژی، قولیایی، جوانڕۆیی، ئەردەڵان، ئوچانلۆ، جاف، دیرازی، سەقزی، بانەیی، هەورامانی، کەرەندی، (ئەم چوار هۆزەی دوایی بە نێوی شوێنەکانیانەوە نێونراون)، گوڵباگی، گەڵباخی، مەندەمی، مەندومی، موکری، مامەش، شکاك و هۆزەکانی نێوچەی ماکۆ. هەریەکە لەم خێڵانە ناوچەی تایبەتی خۆی هەیە و لێی نیشتەجی بووە. بێجگە لەمانە کۆمەڵێ عەشیرەتی تری کورد هەن لەنێوچە و ئۆستانەکانی تری ئێراندا دەژین. ئەم کوردانە لەکاتی خۆیدا، بەتایبەتی لە کاتی سەفەوییەکاندا، بۆ ئەم ناوچانە راگوێزراون (٨).

عەشیرەتە سەرەکییەکانی کوردی تورکیاش ئەمانەن: بابان، جاف، سویدی، بەرزنجی، عێلی تۆڤار؟، زەنگنە، هەمەوەند، بازیان، شکاك، نومەیران، بیلیلیان، پازۆکی، برادۆست، رۆژەکی، رەدکانی، مامی، موکری، خالیدی، بەرزان، تیلاکۆ، گورکیلی، پیرۆز، بلباس، ڤالیس، حەیدەران، رەشوان، مەحموودی، میکایلی، باسەکی، داوودی، رێشی، مەراڤی، چەکڤەنی، شیکاری و یەزیدی.

لەم هۆزانە بابان وشکاك و موکری و رۆژەکی و مامەش رۆڵێکی گەورە لە بزاڤی نەتەوەایەتی کوردا دەبینن. لە گۆڕ شێوەی گوزەرانیش کورد دەبن بە دوو بەشی ناهاوسەنگەوە. زۆربەیان کۆچەرن و لە رەشماڵدا دەژین و خەریکی پەز و مەڕومالات و ئاژەڵ بە خێوکردنن و زۆربەی کەرەستە و پێداویستییەکانی ژیانیان بەرهەمی مەڕ

وماڵاتەکانی خۆیانن. لە هەمان کاتدا خەریکی ئاڵوگۆڕ و کڕین و فرۆشتنی شیر و خوری و رۆن و پەنیر...هتدن. بێجگە لە مانە قاڵی و جاجمیش دەچنن. کاری تەون و جۆلایی تەنانەت لەکاتی بار و کۆچیشدا پەکی ناکەوێ. بەشی دووەمیش کە کەمینە پێکدێنن، کوردی نیشتەجێن کە خەریکی کاری کشت وکاڵ وەرزێرین. چ ئەمانە و چ ئەوانی تر هەموو چەکدارن. لە راستیدا ژیانی هۆزانی کورد بە ژیانی سەربازگەیەکی میری دەکات. مرۆڤی کورد دەتوانێ بە مانگان تەنها بە نانەرەق و گوێز و بەڕوو گوزەران بکات. ئەم خۆراك و بژێوەی لە هەمانەیەکی چەرمدایە و هەمیشە بە کۆڵێوەیە. بەم جۆرە نانە دەڵێن بێژی (بژێو، ج)و ئەمەش لە وشەی ژیانەوە وەرگیراوە. وەرزێریی و زەوی کێڵان لە کۆمەڵی کوردەواریدا گەلێ دواکەوتووە و تاوەکوو ئێستاش جوتیاران هەر بە قرۆمە و گاوەسن و پاچ کێڵگەکانیان دەکێڵن. بەرهەمی کشت و کاڵیی جوتیارانی کوردیش بریتییە لە گەنم و تووتن و گەنمەشامی نیسك و نۆك و پەموو (لۆکە).

جوتیارەکان زۆر گەنم تۆو ناکەن، تەنها ئەوەندە کە بەشی ئاغا و خانەکان بکات. دارایی و کەرەستەی سەرەکیی دەوڵەمەندی و هەروەها بابەتی سەرەکیی ئاڵوگۆڕ و کڕین و فرۆشتن لە بازاڕی ناوخۆی وڵاتی کوردەواریدا تووتن و پەموو و خوری و قاڵین. بازرگانێتی لە کوردستاندا تاوەکوو ئێستا لە شێوەی ئاڵوگۆڕ و رەد و بەدەڵدایە و بە دەگمەن پارە و پوول بە کار دەهێنرێ. لە بازرگانیی نێوخۆدا ئاڵوگۆڕ و کڕین و فرۆشتن لەنێوان ئاوایی (لادێ، گوند، دێ) و بازێڕ (شار) دا رۆڵێکی گەورە دەبینێ. بازرگانە جوولەکەکان، کە پێیان دەڵێن

سەوداکەر یا چەرچی، هەموو پێداویستییەکانی خێزان و پیشەکانی دێ وەکوو داو و دەرزی و دوگمە و گوش و سیرە و شەکر و چای و ...هتد لە شارەوە دێنن(٩). هەروەها لای بازرگانەکانی شار کەرەستەکانی خۆجوانکردنی ژنان پەیدا دەبن. جلوبەرگی پیاوان هەر لەنێو خودی هۆزەکاندا دروست دەکرێن و خامەکەی گەلێ رەختەن و بەرگە دەگرن. بازرگانان تەنها رێگە و ئامرازی پەیوەندین لەنێوان شار و هۆزەکاندا و گەلێ جار قسەیان دەڕواو رێزێکی تایبەتیان لێدەگیرێ. کۆچەرەکان، بێجگە لە مەڕومالات بەخێوکردن، خەریکی زەوی کێڵانیش دەبن. لە زستاندا کاتێ بۆ نێوچە گەرمەکان دادەبەزن (بە هەوارگەی زستانی کۆچەرەکان دەڵێن گەرمەسێر)، لێرەدا گەنم و گەنمەشامی تۆو دەکەن و لەکاتی بەهارەهەواری هۆزەکەدا چەند پاسەوانێکی چەکدار بۆ پاراستنی کێڵگەکان تەرخان دەکەن و لەوێ بەجێیان دێڵن. کاتێ لە هاوینەهەوارەکانیان (سەردەسێر) دەگەڕێنەوە، دەغڵ و دانەکانیان پێدەگەن و کاتی کۆکردنەوەیان هاتووە. دەستوبرد دروێنەی دەکەن و لە عە مبار و کاداندا قایمی دەکەن.

زۆربەی هۆز و خێڵەکانی کورد وەکوو ئێزیدی و گوڵباگی و گەڵباخی و پێنجوێنی و گۆران و جوانڕۆیی و مەندومی جلوبەرگی خۆماڵی کە لەلایەن ژنانی هۆزەکانەوە چنراون لەبەر دەکەن. خام و جاوی ئەو جلوبەرگانە ئەوەندە رەختەیە لەباوکەوە بۆ کوڕ بە میراتی دەمێنێتەوە و هەندێ جار چوار پشت دەکات. باری کۆمەڵایەتی و گوزەرانی کورد بەرهەمی پەیوەندییە پەتریارکی (باوکی، باوکسالاری)یەکانی نێو هۆزەکانە. هۆزەکان لەلایەن سەردارەکانیانەوە

بەڕێوە دەبرێن و ئەمانە دەسەڵاتێکی یەگجار زۆریان بەسەر ئەندامانی هۆزەکەدا هەیە. وەکوو باوە ئەم سەردارانە هەمیشە ئەندام و رۆڵەی بەهێزترین و دەستڕۆترین بنەماڵەی ئەو هۆزەن. ئەگەر ئەندامی ئەو بنەماڵەیەش نەبن، ئەوا بە رێگەی ژن و ژنخوازییەوە ئەو پایە و پلەیە بەدەست دێنن. لە کۆمەڵگایەکی باوکسالاری وادا دەسەڵاتی ئاینی هەمیشە بە شێوەیەکی توند گرێدراوە بە ئەرکەکانی بەڕێوەبردنەوە. ئەو سەرۆك هۆزانەی کە دەسەڵاتی ئاینیش لەدەستی خۆیاندا کۆدەکەنەوە، ئەوا یەکجار بەهێز و خاوەن دەسەڵاتن. هیچ گومان لەوەدا نیە کە هەموو ئەندامانی خێڵ و هۆزەکان بەبێ یەك و دوو ملکەچی خواست و ویستەکانی سەرکردەکانیانن. لەگەڵ ئەوەشدا لە کاروباری نێوخۆی هۆزەکاندا ئەڵقەی دەوروبەری سەرۆکهۆز واتە کوێخاو رووسپی (دەم سپی، ریش سپی، ردێن سپی) و خانە بچکۆڵەکان بەشداری دەکەن و هەموو مەسەلە گرنگەکان بە ئامادەبوونی ئەمان و هەموو ئەندامە خاوەن پلەوپایەکانی هۆزەکە چارەسەر دەکرێن و سەرۆك هۆز ناتوانێ داخوازی و ئارەزوو و خواستەکانیان پشتگوێ بخات.

لەگەڵ ئەوەی وێنەی دەرەوەی پەیوەندییەکانی نێوان مەلاکان و ەرۆك هۆزەکان وا پیشان دەدا کە سەرۆك هۆزەکان گوێڕایەڵی مەلاکانن، بەڵام لەڕاستیدا مەسەلەکە بە پێچەوانەوەیە، چونکە مەلاکان بەبێ یەك و دوو ملکەچی ویستەکانی خان و ئاغاکانن و داردەستێکن بە دەستیانەوە. هەموو هۆزێك شێخ و مەلا و سەیدی خۆی هەیە کە سەرپەرەشتی کاروباری ئاینی و کۆمەڵایەتی خێڵەکە دەکەن. باڵاترین

دەسەڵات بەدەست سەیدەکانەوەیە، چونکە ئەمان بە نەوەی پێغەمبەر لەقەڵەم دەدرێن. شێخەکانیش نوێنەری قوتابخانە و تەریقەتە ئاینییە جیاوازەکانی کوردستانن کە بەهێزترینیان قادری و نەقشبەندین. یەکەمیان بە نێوی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و دووەمیان بە نێوی سەیدی نەقشبەندەوە نێو نراون.

لەلایەن بیروباوەڕی ئاینییەوە، کورد دەبنە چوار کۆمەڵەوە کە دوانیان -واتە شیعە و سوننە- ئیسلامن. سوننییەکانیش سەر بە چوار رێبازن: حەنبەلی، مالیکی، شافعی و حەنەفی. هەموو ئەم رێبازانە شافعی لێدەرچێ زۆر دژی شیعەن، لەبەر ئەوە شیعەکان گەلێ جار خۆیان لەژێر پەردەی شافعیدا دەشارنەوە. کوردە ئێزیدییەکان و عەلی ئیلاهیەکان (عەلیولاهیەکان) سەر بە ئاینی ئیسلام نین. ئێزیدیەکان کۆمەڵێکی سەربەخۆی دوالیستین [واتە باوەڕیان بە دوو هێز هەیە. ج] و لەگەڵ دەوروبەری خۆیاندا پەیوەندی ناکەن و تێکەڵاو نابن. بۆیەکا کۆمەڵێکی داخراو و تایبەتییان پێکهێناوە و بوونەتە هۆزێکی کوردی خاوەن تایبەتمەندێتی. ئەم کۆمەڵە گەلێ بەرگەگرو زەحمەتکێشن و خاوەنی مێژوویەکی دوورودرێژن. لە هەوڵی خۆپاراستنا لە هەڕەشە و هێرشی موسوڵمانان، گەلێ جار ناچار بوونە خۆیان بە موسوڵمان پیشان بدەن. هەر لە بە ئەوەشە گەلێ جار لەسەر کێڵی گۆڕی ئێزیدیان ئایەتی قورئان دەبینین.

عەلیولاهییەکان لە بنەڕەتدا موسوڵمان بوون، بەڵام لە ئیسلامەتی لایان داوە و گەلێ دیاردە و بیروباوەڕی ئاینە کۆنەکانی ئێران تێکەڵ بە باوەڕەکەیان بوون. تەنها بۆ نموونە خوداوەند لای ئەمان هەمیشە لەنێو

خەڵکدا دەژی و خۆی لە مرۆڤێکدا دەنوێنێ وئەو مرۆڤەش دەبێ هەر ئیمام عەلی بێ. هەروەها بەلای عەلیولاهییەکانەوە، پێغەمبەر تەنها بە یارمەتی ئیمام عەلی توانی سەرکەوتن وەدەس بێنێ، بەڵام لەبەر ئەوەی هەندێ لە فەرمایشتەکانی عەلی وەپشت گوێ خست، ئەوا کارەکەی تووشی شکستی هات و بۆی نەچوە سەر و، تەنانەت پێغەمبەر بە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام تاوانبار دەکەن. ناوەندی پیرۆزی عەلیولاهییەکان شوێنێکە بە نێوی داری گومبەت لە چیاکانی دالاهو کە لوتکەکانی بەفر داپۆشیوە. لە نەهالەکانی نێوان ئەو کێوانەدا پەرستگایەك بە گومەتەوە بۆ رێزلێنان لە عەلی دروست کراوە. بەگوێرەی هەندێ ئەفسانەی مێژوویی ئەو پەرستگایە، کە لەسەر بەرزترین لوتکەی ئەو کێوە بووە، لەکاتی خۆیدا قەلای دوا شای بنەماڵەی ساسانیان یەزدگورد بووە، کە بەهۆی هێرشی عەرەبەوە دەسەلاتی لە دەست دا. ئەم شوێنە پیرۆزەی عەلیولاهییەکان دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای کرماشانەوە لەنێوەراستی سێگۆشەیەکدا کە دەکەوێتە نێوان کەرەند و قەسری شیرین و سنوورەکانی تورکیاوە [مەبەست لە سنوورەکانی ئەوڕۆی نێوان عێراق و ئێرانە.ج]

لە قەسری شیرینەوە ئاو راکێشراوە بۆ ئەم پەرستگایە کە دەکاتە سەد فەرسەخ، هەر فەرسەخێك ٦ کیلۆمەترە. سەیر لەوەدایە بەرزی هەندێ لەو شوێنانە کە ئاوەکەی پێدا دەڕوا، خۆی لە پێنج هەزار سازین (هەر سازینێك مەترێك و سێزدە سەنتیمەترە.ج) دەدات. ئەمە پیرۆزترین مەڵبەندی عەلیولاهییەکانە. لەبەر ئەوەی ئیمام عەلی بەلای ئەوانەوە هەمیشە لە شێوەی مرۆڤدایە، هەڵبەتە نەك هەموو مرۆڤێك

بەڵکوو لە شێوەی سەید و شێخدایە، بۆیەکا ئەمانەی دوایی رێز و پایەیەکی یەگجار زۆریان لەناو عەلیولاهییەکاندا هەیە. لەنێو سەیدەکانیشدا سەی براکە لە هەموویان پایە بەرزتر وبەنێوبانگترە و نەوەکانی رۆڵێکی مەزن لەنێو عەلیولاهییەکانی ئێراندا دەگێڕن. لەنێو عەلیولاهییەکانی دەوڵەتی ئۆسمانیشدا سەی رۆستەم کە لە نزیک شاری کەرکووك دادەنیشیٚ ئەو رۆڵە دەبینیٚ.

مرۆڤ دەتوانیٚ بە شێوەیەکی زەق باری ژنانی کورد لە گەلانی موسوڵمانی دراوسیٚ جودابکاتەوە. ژنانی کورد، بەتایبەتی لەنێو هۆزە کۆچەرەکاندا، رۆڵێکی مەزن دەبینن. هەڵبەتە لێرەدا ژنانی سەرۆك هۆز و گەورەپیاوانی هۆز رۆڵیان لە ژنانی تری هۆزەکە زیاترە. هەمووژنان سەرفرازن و بەبیٚ رووپۆش و پێچە هاتوچۆ دەکەن و لە کاروباری خێڵەکەدا بەشدرای دەکەن. پێشوازیکردن لە میوان و بە رێخستنیان ئەرکی سەرشانی ژنانە. کاتیٚ پیاوانی عەشیرەت دەچن بە لایەکدا، ئەوا ژنان ئەرکی بەڕێوە بردنی کاروبارەکانی هۆز دەگرنە ئەستۆی خۆ و، تەنانەت پیاوخراپان داد دەکەن و سزایان دەدەن و گەلیٚ جار هەر بە خۆشیان سزاکان بەجیٚدێنن. کێشە و بابەتەکانی شەڕ، ئاشتی، هاوکاری، بەستن و هەڵوەشاندنەوەی پەیمان لەگەڵ هۆز و خێڵانی تردا و پەیوەندی بە میری ودەسەلاتی ناوەندییەوە بە ئامادەبوون و بەشداریکردنی ژنان دەخرێنە بەر باس و لێکدانەوە و بڕیاریان لەسەر دەدریٚ و چارەسەر دەکرێن. لەم جۆرە کۆبوونەوانەدا ژنان هەمان مافی پیاوانیان لە رادەربڕین و دەنگداندا هەیە و چالاکانە لە کارو باری گشتیی هۆزەکاندا بەشداری دەکەن.

بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەرکی ژنان بە راستیی زۆر سەختە، بۆ نموونە هەموو ئیش و کارەکان دەکەونە ئەستۆی ژنان بەتایبەتی لای ئەو هۆزە کۆچەرانەی بە کشت و کاڵەوە خەریك نین، چونکە لێرە پیاوان تەنها خەریکی شەڕ و تاڵانکردن و راوکردنن. باری ژن لای هۆزە نیشتەجێکان هەندێ باشترە، چونکە هەموو کاری وەرزێری و کێڵگەکان پیاوان دەیکەن و ژنان لێرەدا رۆڵی یارمەتیدەر دەبینن.

هەروەها هەندێ لە کوردەکانیش سەر بە ئاینی نەستوورین و گرنگترین مەڵبەندەکانیان دەکەونە نێوان مووسڵ و کەرکووکەوە. کوردە نەستوورییەکان نیشتەجێن و بە کشتوکاڵەوە خەریکن و بە هۆی پەیوەندییەکانیانەوە بە مسیۆنێرە (پەیامبەرە)ئەورووپاییەکانەوە لە کوردەکانی تر پێشکەوتووترن.

پێویستە هەندێ دەربارەی ئەدەبیات و هونەری کوردیش بدوێین. ئەوەی ئاشکرایە ئەدەبی کوردی بە زەقی مۆرکی خۆماڵیی پێوە دیارە و لە ژیانی کوردەوارییەوە هەڵقوڵاوە. شاعیرانی کورد شێوە و ناوەرۆك و کێشی شیعری فارسیان وەرگرتووە و تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای کوردەواریان تێکەڵی کردووە، بە تایبەتی داب و نەریتی ژیانی رۆژانەی هۆز و خێڵە کوردەکان.

دەتوانین لەگۆڕ شێوە و نێوەرۆك یەکسەر شیعری فارسی کە بەرهەمی ژیانی نیشتەجێیی و کولتووری شارە لە شیعری کوردی کە بەرهەمی ژیانی کۆچەرانە جودا بکەینەوە. تەنها بۆ روونکردنەوەی ئەم بۆچوونە چەند نموونەیەك دێنمەوە. شاعیری مەزنی فارس سەعدی شیرازی بەم جۆرە هەستی خۆی دەربڕیوە (١٠). "چەند خۆش دەبوو

لەم ساتەی سەر لە ئێوارەدا کە یار و مەی و خواردن و شیرینیم هەموو لا کۆبوونەتەوە، بە دیداری دۆستانیش شاد بوومایە". ئا بەم شێوەیە شاعیری فارس کە خۆشەویستی بەلایەوە یەکێك لە دیارییە بەنرخ و رازاوەکانی ژیانە، دەیەوەێ بە شێوەیەکی جوانتر لە کۆڕی دۆست وهەڤالانیدا بینرخێنێ.

شیعری کوردی سەد دەر سەد نموونەیەکی پێچەوانەمان دەخاتە بەر دەست. لێرەدا پەنا دەبەمە بەر شیعرێکی شاعیری سەدەی نۆزدەهم نالی کە دەڵێ: "چ بکەم لە تیشکی مانگی چواردە و تاکەی لە چاوەروانیدا بم و کەی خێڵ چاوی دەچێتە خەو و بە دیتنی یار شاد دەبم". لێرەدا کوردی عاشق لە هەموو کۆڕێکی دۆستان هەڵدێ. ئەو چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە نیوەشەو بێ و هەموو ئەندامانی خێڵ چاویان بچێتە خەو بۆ ئەوەی بەبێ رەقیب لەسەر کانیاوێك لەگەڵ دڵبەرەکەیدا بەیەك بگەن. مخابن مانگی چواردە کە خەرمانەی داوە خەریکە هەموو هیوا و پلانەکانی تێك دەدات.

شاعیری خێڵی کوردی جافیش [تاهیر بەگ) بەم شێوەیە هەستی خۆی لەمەڕ هەمان کێشە دەردەبڕێ: "بەدوای خاڵەکانتا هاتم و کەوتمە داوی زوڵفەکانتەوە. هەروەك نەچیرێکی بێئاگا و ساکار نەمدەزانی لەژێر دەنکە گەنمێکدا تۆڕم بۆ نراوەتەوە. "هاتم بە هیوای خاڵت تووشی داوی زوڵفت بووم * تەیرێکی نابەڵەد بووم نەمزانی دانەو داوە". بەم جۆرە شاعیری عێڵی جاف باسی ئەوەمان بۆ دەکات چۆن گیرۆدەی ئەڤین بووە و لەلایەن دڵبەرەکەیەوە دیل کراوە، کە ئەمە بۆ خۆی دیاردەیەکی ئاسایییە لە ژیانی رۆژانەی راوکەردا کە رۆژ نیە

ڕووبەڕووی کێشە و مەترسی نەبێتەوە. دڵداری بەلای ئەمەوە وەکووپێشبڕکێییەك وایە کە تەنها ژیرترین ڕاوچی، کە بە چاکی لەگەڵ ژیانی جەنگاوەری و ڕاوکردندا ڕاهاتووە، تێیدا سەر دەکەوێ.

نابێ ئەو ڕاستیەش لەیاد بکەین کە ژیانی نیشتەجێیی و وەرزێریش کەرەستەیەکی دەوڵەمەند دەخەنە بەردەستی شاعیری کورد، کە گەلێکیان هەوڵیان داوە لە شیعرەکانی خۆیاندا وێنەی ژیانی سەختی جوتیاران بکێشن. شاعیری کورد یاقووب کرماشانی دەڵێ (١١): "بە برژانگی چاوەکانت سینگی خۆم کێڵاو تۆوی خۆشەویستی تۆم تۆو کرد و بە داسی برۆکانت دروێنەم کرد و بە دڵی کون کونم لە سەرەنم دا". وێنە شیعرییەکانی ئەم شیعرە باسی کولتووری کۆمەڵگای وەرزێران دەکات، کە هەنگاوێکە بۆ پێشەوە ئەگەر لەگەڵ کولتووری کۆچەراندا بەراوردی بکەین. بۆیەکا دەبینین وێنە و دیمەنەکانی ئەم شیعرە لە ژیانی ڕۆژانەی جوتکارانەوە وەرگیراون وەکوو زەوی کێڵان و تۆو کردن و دروێنە و لە بێژنگدان. گەلێك لە شاعیرانی کورد بە پێچەوانەی وێنەکانی کرماشانیەوە، شیعرەکانیان پڕن لە وێنە و دیمەنی شەڕ و بەیەکدادان و ئاژاوە و هێرش و هەست و نەستی جەنگاوەر و ڕێگر و چەتە کە هەموو ژیانیان لە جەنگ و بگرە و بەردە و چەتەییدا بەسەر دەبەن.

هەر لەبەر ئەوەشە دەبینین شاعیری کورد تیری چاوی یارەکەی کە دڵی پێکاوە، لەگەڵ هێرشی ڕێگر و چەتەدا بۆ سەر کاروانەکان بەراورد دەکات. (چاوە ڕەشەکانت دانی برژانگەکانت دەدەن هێرش ببەتە سەر دڵەی بێچارەم هەر وەکوو ئەو هێزە خوێنڕێژانەی خەریکی هێرش و

تالانکردنن). به گشتیی دەتوانین بڵێین که شیعری کوردی ئاوێنەیەکی ڕاستەقینەی کۆمەڵی کوردەوارییە. بۆیەکا لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئەو شیعرانە کارێکی پڕ چێژ و بەسوودە (١٢). شیعری کوردی لە ئێراندا شوێنی خۆی کردۆتەوە، بەڵام لە تورکیادا کە ڕژێمەکەی سەرکوتکردنی گەلە ناتورکەکانی پەیڕەو کردووە و پەیڕەوی دەکات و نووسین و بڵاوکردنەوەی بە کوردی قەدەغە کردووە، تەنها لە کاتی شەڕی جیهانیدا دەست کراوە بە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی بە زمانی کوردی (١٣).

ئەوەی لە ژیانی کۆمەڵایەتی کورد بکۆڵێتەوە سەر سوڕ دەمێنیّ لەو جیاوازییە زۆرەی لەنێوان کورد و گەلانی دراوسێدا، بەتایبەتی فارس و تورك، هەیە. ژیانی خێڵایەتی کورد هەندیّ دیاردەی لای ئەم گەلە دروست کردووە کە بە هیچ جۆرێك لە کۆمەڵگای فارس و تورکدا بەدی ناکرێن. لە کۆمەڵی کوردەواریدا مرۆڤ پابەستە بە خێڵەوە و ئەندامەتی لەو خێڵەدا و ئەرکەکانی بەرامبەر بەو، پێش هەموو ئەرکەکانی تری دەکەون. لەکاتێکدا لە کۆمەڵگای فارس و تورکدا مرۆڤ ئەندامی کۆمەڵێکی گەورەترە و لەلایەن دەزگاکانی دەوڵەتەوە کاروباری بەڕێوە دەبریّ و ئەرکەکانی دەستنیشان دەکرێن (١٤). هەروەها ژنان لە کۆمەڵی کوردەواریدا گەلیّ سەربەست و ئازادترن لە ژنانی فارس و تورك کە گیرۆدەی ژیانی حەرەمن و بە زۆر لە کۆمەڵ دابڕاون(١٥).

لە هەموو وەرزێکی ساڵا، بەتایبەتی کاتیّ ئاووهەوا خۆش دەبیّ، کوردەکان بە پیرو لاو و ژن و پیاوەوە کۆدەبنەوە و ڕەشبەڵەك دەبەستن و دەیکەن بە شایی. یەکێك لە هەڵپەڕکێکەران جا پیاو یا ژن لە

ناوەڕاستی ڕەشبەڵەکەکەدا گۆرانی دەڵێ و بە تەنها هەڵدەپەڕێ و دوو داریشی بەدەستەوەیە. ئەمە پێی دەڵێن سەرچۆپی [ڕاستیەکەی ئەمە پێی دەوترێ سەرچۆپیدکێش.ج]. ئەو ئامێرە مۆسیقاییانە کە لەم شایی و گۆڤەندانەدا بەکار دەهێنرێن بریتین لە دەهۆڵ و زوڕنا. ئەم دیاردەیە واتە ئەوجۆرە بەزم و گۆڤەندانە بە هیچ شێوەیەك لەنێو تورك و فارسەکاندا بەدی ناکرێن.

لەم ڕۆژانەدا زۆربەی ڕووناکبیر و سیاسەتمەدارە کوردەکان گوێ ڕایەڵی ئینگلیزن و دوای پڕوپاگەندەی ئەوان کەوتوون. مێژووی خودی بزاڤی نەتەوەیی کورد و لایەنگریکردنی ئینگلیز لە مەسەلەی سەربەخۆیی کوردستان، دەتوانن هۆیەکانی ئەم هەڵوێستەی کوردمان بۆ ڕوون بکەنەوە. بیری سەربەخۆیی کوردستان بەتوندی لای کورد پەرەی سەند و بەهۆی ئەو ڕژێمە ناسیۆنالیستییەوە کە تورکە لاوەکان لە دەوڵەتی ئۆسمانیدا دایانمەرزاند. دوای ئەوەی کۆمەڵەی یەکێتی و پێشکەوتن (ئیتحاد و تەرەقی) دەسەڵاتی لەو دەوڵەتدا گرتە دەست(١٦). ڕەگەزپەرستیی ئەم ڕژێمە بەتایبەتی لە بواری پەروەردە و فێرکردندا بە زەقی خۆی دەنواند. لێرەدا دەتوانین بڵێین کە سیاسەتی نەتەوەپەرستی و پانتورکیی تورکە لاوەکان بەتایبەتی لە قوتابخانە و فێرگەکاندا بووە بەهۆی پەرەسەندنی بزاڤی نەتەوەیی کوردە لاوەکان(١٧). چونکە بەرپەرچدانەوە و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو سیاسەتە بە هەمان جۆر هەستی نەتەوەیی توندی لەلای کورد و عەرەب و ئەرناووت [ئەلبانی.ج] و گەلانی تری دەوڵەتی ئۆسمانی هێنایە جۆش(١٨).

وەکوو دەزانین پرۆگرامەکانی خوێندن لە هەموو فێرگەکانی تورکیادا تا شۆڕشی ساڵی ١٩٠٨ لەسەر بناغەی ئاینی ئیسلام و شەریعەت دارێژرابوون و بیروباوەڕی ئیسلامی و یەکێتی ئۆسمانی باڵی بەسەر هەموو لایەنەکانی خوێندنا گرتبووەوە. بیری ئیسلامەتی باڵادەست لە دەوڵەتی ئۆسمانیدا مەسەلەی جیاوازیی نەتەوەیی لەنێو گەلانی ئەو دەوڵەتەدا بەتوندی رەتدەکردەوە و هەوڵی دەدا ئەو گەلانە لە ئوممەتی ئیسلامیدا یەکبخات (لەژێر دروشمی یەکێتی ئۆسمانی یا پان ئۆسمانیزمدا.ج].

ئیسلامەتی چەکێکی بەهێز بوو بەدەست دەروازەی بالاوە بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی سوڵتان بەسەر گەلانی ئیمپراتۆریی ئۆسمانیدا. هەروەها بیروباوەڕی ئیسلامەتی چەکێکی کاریگەر بوو بۆ سەرکوتکردن و لەنێوبردنی هەر ئیدیۆلۆژییەکی نەتەوەیی و جوداخوازی. کورد چ کۆچەر چ نیشتەجێ کە لە ولاتێکی چیاییدا دەژی و بەهۆی نەبوونی رێگاوبانەوە نەك تەنها لە جیهانی دەرەوە، بەڵکوو لە دەوروبەری خودی خۆیشی دابڕابوو، هیچ تێڕوانینێکی ئەوتۆی دەربارەی نەتەوە و دەسەلات و دەزگای دەوڵەتی نەبوو. تەنها خەلیفەی موسوڵمانان واتە سوڵتانی تورك ئەو هێماو سیمبۆڵە بوو کە مرۆڤی کوردی بە جیهانی تورکییەوە گرێ دەدا.

لاوانی کورد کە لە فێرگەکانی ئەستەموول دەیانخوێند و لەو دەوروبەرەدا لە خوێندن دەبوونەوە، زەمینەیەکی چاك بوون بۆ چاندنی بیروباوەڕی ئیسلامەتی کە هەموو بوارەکانی خوێندنی گرتبووەوە. خوێندکارانی قوتابخانەکانی ئەستەموول، گرنگ نەبوو رۆڵەی چە

گەلێکن، وەکوو موسوڵمانێکی بیر وشك خوێندنیان تەواو دەکرد و باوەڕیان بەوە قایم بوو کە پێغەمبەری موسوڵمانان دەتوانێ هەموو قانوون و زاگۆنە سروشتییەکان تێك بدا بۆ سزادانی بێباوەڕان. هەروەها بە لای ئەوانەوە هیچ زانستێك ناتوانێ بەبێ ئایین و لە دەرەوەی ئایین هەبوونی خۆی بپارێزێ. ئەو رووناکبیرە کەمانەی کە باوەڕیان بە هەبوونی نەتەوە و جیاوازیی نەتەوەیی هەبوو، نەیاندەوێرا بەرهەڵستیی و دژایەتی داب ونەریت و یاسا باوەکانی سەردەم بکەن و لێی لادەن.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی کۆمەڵەی یەکێتی و پێشکەوتندا بنکەی سیاسەتی دەسەڵاتداریی تورکیا لە رەگ و ریشەوە گۆڕا. ئەم گۆڕانکارییە یەکسەر و پێش هەموو بوارێك لە قوتابخانە و فێرگەکاندا رەنگیدایەوە، چونکە قوتابخانەکان کرانە چەکێکی کاریگەر بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی نەتەوەپەرستی و پانتورکێتی. بۆ چەسپاندنی بیروباوەڕ و دەسەڵاتی خۆیان، تورکە لاوەکان کۆمەڵێ خانەی مامۆستایان بۆ پێگەیاندنی مامۆستایان دامەزراند و تەنها تورك و ئەندامانی رێکخراوەکەی خۆیانیان تێدا وەردەگرت (١٩).

ئەم فێرگانە دەستەیەك کادیریان پێگەیاند کە بە شێوەیەکی تەکنیکی ئامادە کرابوون و ببوونە مامۆستا لە قوتابخانە و دەزگاکانی فێرکردندا. ئیدیۆلۆژیای نەتەوەپەرەستی و تورکچێتی زاڵبوو بەسەر پرۆگرامەکانی ئەم فێرگانەدا. ئامانج و دروشمی سەرەکی فێرکردن و راهێنان لەو سەردەمەدا لەوەدا بوو کە هەموو موسوڵمانانی دەوڵەتی ئۆسمانی بکرێن بە تورك. دەرچووانی ئەو فێرگانە بزاڤێکی پەروەردە و

راهێنانیان دەست پێکرد. ئەم کارەشیان بە ڕۆحێکی نەتەوەپەرەستییەوە بەڕێوە دەبرد و وەچەیەکی ڕەگەزپەرەستیان بۆ تورکە لاوەکان پێگەیاند، کە ئامادە بوون دەست بە چەك بیری تورکایەتی بپارێزن و لە دژی گەلانی ناتورك بجەنگن. بەهۆی ئەم سیاسەتەوە و بۆ بەرپەچدانەوەی بیروباوەڕی نەتەوەیی لەنێو ڕۆڵەکانی گەلانی ناتورکی دەروازەی باڵادا ئەم هەستە پەرەی سەند و تەشەنەی کرد.

هەر بەو شێوەیەش بزاڤی نەتەوەیی کوردە لاوەکان گەشەی کرد. ئامانجی سەرەکی ئەم بزاڤەش لەوەدا بوو کە کورد ڕزگار بکات لە چەوسانەوەی تورك. ئینگلیزەکان هەوڵێکی زۆریان داوە و دەدەن بیروباوەڕی جیابوونەوە و خەباتی ئازادیخوازی کورد بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆیان بەکار بێنن. بەو شێوەیە دەتوانین بڵێین سیاسەتی ڕەگەزپەرەستی تورکە لاوەکان لەلایەکەوە و پڕوپاگەندە و هەوڵی ئاژانە ئینگلیزەکان لەلایەکی ترەوە، ئەو هۆکار و فاکتەرانە بوون کە کۆمیتەکانی سەربەخۆیی کوردیان هێنایە کایەوە. ئەم کۆمیتانە لە سەرەتادا تەنها دەرچوانی فێرگەکانی ئەستەمووڵ و کوردە ڕووناکبیرەکانیان لە ڕیزەکانی خۆیاندا کۆدەکردنەوە. ئەم لاوانە هەوڵیان دەدا مافی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد لە چوارچێوەی تورکیادا وەدەست بێنن. ئەم بزاڤە لەگەڵ گڕگرتنی ئاگری شەڕی جیهانیدا تەشەنەی کرد (٢٠). بەڵام بەرهەڵستیی توندی تورکە لاوەکان و ڕێکخراوی "تورك ئوجاغی" (٢١) کە چەکی سەرەکی پڕوپاگەندەی تورکە لاوەکان بوو بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی پانتورکێتی لە وڵاتانی تری ڕۆژهەڵاتدا، کوردی ناچار کرد پەنا ببەنە بەرخەباتی نهێنی و

لەدواییدا پاڵی پێوەنان خۆیان بخەنە ئامێزی ئینگلیزەوە، کە لافی پارێزگاری مافی گەلانی چەوساوە لێدەدەن.

دوای بڵاوبوونەوەی چواردە بەندەکەی ویلسن، کوردەلاوەکان سەرلەنوێ دەنگیان بڵند کردەوە و هاتنەوە سەر شانۆی چالاکی سیاسی و کۆمەڵە و رێکخراویان دامەزراند و داوای سەربەخۆیی کوردیان کرد. هەر لەوکاتەدا بوو چەند کۆمیتە و کۆمەڵەیەکی کورد لە ئەستەمووڵ دەستیان بە خەبات و چالاکی سیاسی کرد. بەنێوبانگترینی ئەو کۆمەڵ و رێکخراوانە، کۆمەڵەی پێشخستنی کوردستان (کوردستان تعالی جمعیتی) (٢٢) و کۆمەڵەی ئازادیی کوردستان (استقلال کوردستان جمعیتی) (٢٣).

هەروەها کوردە لاوەکان بۆ بڵاوکردنەوەی بیر و بۆچوونەکانیان چەند رۆژنامەیەکیان بە کوردی بڵاوکردەوە وەکوو ژین (٢٤) و کوردستان (٢٥). ئەمە بێجگە لە هەندێ نامیلکە و دیوانی شیعر و ئەدەبیاتی کورد. شایانی باسە کە لە رابردوودا نووسین و بڵاوکردنەوە بە زمانی کوردی لە تورکیا قەدەغە بوون.

لەم رۆژانەدا چوار رێبازی سەرەکی لە بزاڤی کوردا بەدی دەکرێن. هەریەکێ لەو رێبازانە نوێنەرایەتی گرووپێ دەکات وهەوڵ دەدا بەرژەوەندییەکانی ئەو گرووپە بپارێزێ. نوێنەرانی رێبازی یەکەمین رووناکبیرانی کوردن کە داوای رزگارکردن و سەربەخۆیی تەواوی کوردستان دەکەن. گرووپی دووەمین لەو سیاسەتمەدارە کوردانە پێکدێ کە هەوڵ دەدەن مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لە چوارچێوەی تورکیادا وەدەست بێنن و لەژێر ئاڵای تورکیادا بمێننەوە و بەوە قایلن کە زمانی

توركی زمانی ڕەسمی بێ لە کوردستاندا. ئەمانە بە ژمارە گەلێ کەمن. ڕێبازی سێیەمینیش لەو سیاسەتمەدارە کوردانە پێکهاتووە کە داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردییان لەژێر چاودێری و پارێزگاری ئێراندا دەکرد. تەنانەت هەندێ لە هەڵگرانی ئەم بیرۆکەیە لەگەڵ ئەوەدا بوون کە هەمان ئاڵای ئێران بکرێ بە ئاڵای ئەو دەوڵەتە کوردییە، لەکاتێکدا هەندێکی تریان تەنها دەیانویست هەندێ گۆڕانگاری لە ئاڵاکەی ئێراندا بکەن وەکوو ئەوەی تەنها خۆرێکی تێدا بهێڵنەوە. چەند سەرکردەیەکی دەسەڵاتداری کورد کە ڕۆڵێکی دیاریان لە کاروباری دیپلۆماتیدا هەبوو لە ڕیزەکانی ئەم گروپەدان. سەرکردەی ئەم ڕێبازە شەریف پاشا بوو کە گەلێ پلە و پایەی بڵندی لە دەزگاکانی دەروازەی باڵادا بینیوە و سەرۆکی شاندی تورکیا بوو لە کۆنفرانسی فێرسایدا، هەر لەوێش دەستی لە نوێنەرایەتی تورکیا هەڵگرت و خۆی بە نوێنەری کوردستان بە بەشدارانی کۆنفرانسەکە ڕاگەیاند. هەر لەوکاتەشدا شەریف پاشا وتوویژ لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئێراندا (مشاور الممالك) لەو بارەیەوە دەکرد. بەڵام ئەندامانی سەر بە ئینگلیزی کابینەی وەزیرانی ئێران دژی ئەو بۆچوونە و گفتوگۆکانیش بوون. گروپی چوارەمینیش لەو سیاسەتمەدارە کوردانە پێکدەهات کە داوای کوردستانێکی سەربەخۆ و خاوەن ئاڵای تایبەت بە خۆیان دەکرد کە زمانی فەرمیشی زمانی کوردی بێ بەڵام لەژێر چاوەدێری و مەنداتی ئینگلیزدا بێ. ئەندامانی ئەم گروپە گەلێ سەرکردەی نێودار و سەرۆك هۆزیان تێدا بو،و وەکوو شێخ عەبدولقادر کە ئێستا دژی ئینگلیزە و سەرکردایەتی بزاڤی کوردان لە باکووری کوردستاندا

دەکات. هەروەها پیاوی وەکوو موستەفا پاشای کوردی و گەلێکی تر لە نێودارانی کورد لە ریزی ئەم گروپەدا چالاکی دەنوێنن.

ئەم رێباز و کۆمەڵانە کوردە لاوە رۆشنبیرەکانیان لە ریزەکانی خۆیاندا کۆکردۆتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی لە شاری ئەستەمووڵ دەژین، چونکە لە خودی کوردستاندا بزاڤی نەتەوەیی کورد لە پێش شەڕی جیهانییەوە لەلایەن ئاژانە ئینگلیزەکانەوە جۆش دەدریٚ کە بەنێوبانگترین و چالاکترینیان مێجەر سۆنە. ئەم کابرایە چەند ساڵێکی لە ئێراندا بردۆتە سەر و فارسی بە رەوانی دەزانیٚ. مێجەر سۆن لە گەرمەی بزاڤی تورکە لاوەکاندا خۆی کرد بە کوردستاندا لەژێر نێوی بازرگانێکی ئێرانیدا بەنێوی حاجی عەلی شیرازی (٢٦)و لە نێوچەی گوڵعەنبەر (٢٧) کە تورکەکان پێی دەڵێن هەڵەبجە، باری لیٚ خست.

گوڵعەنبەر یا گوڵعەمبەر مەڵبەندی خێڵی گەورەی جافە کە ژمارەی ئەندامانی دەگاتە هەشت هەزار مرۆڤ. مێجەر سۆن میوانی مەحموود پاشای جاف بوو کە تەنها سەرۆك وخاوەن دەسەڵات و پایەبەرزی ئەم خێڵەیە. دوای ئەوەی مێجەرسۆن پلە و پایەیەکی بەرزی لەنێو جافەکاندا بەدەست هێناو پەیوەندی لەگەڵ پیاوماقووڵ و دووربینەکانیاندا بەست و بوو بە جێگەی باوەڕ و متمانەیان، کەوتە رێکخستنی بزووتنەوەی لاوە کوردەکان. هەر دوای داگیرکردنی بەغدا لەلایەن سوپای ئینگلیزەوە، مێجەرسۆن دەستی کردە بڵاوکردنەوەی رۆژنامەی "تێگەیشتنی راستی" (٢٨) بە زاراوەی کوردەکانی باشووری کوردستان. ئەم رۆژنامەیە لە کوردستاندا دەنگی دابووەوە و رۆڵێکی گەورەی لە بزواندنی هەستی نەتەوەیی کوردا دەبینی.

رۆژنامەی "تێگەیشتنی راستی" زۆر زیرەکانە ئامادە دەکراو شارەزاییەکی باشی لە هەست و نەست و باری دەروونیی کورددا هەبوو. رۆژنامە کوردییەکانی ئەستەموولْ نەیاندەتوانی ئەو رۆڵە بگێڕن کە رۆژنامەکەی مێجەر سۆن دەیگێڕا. چونکە ئەوەندەی ئەو زانیاری و هەواڵ و بەڵگەی دەست دەکەوت، کوردە لاوەکان خەونیشیان پێوە نەدەبینی، بۆیەکا چالاکی و زانیارییەکانی ئەمان لە هەواڵە گشتییەکان و دەزگا ئاواڵەکان بەولاوە تێنەدەپەڕین.

سۆن لە رۆژنامەکەیدا مێژووی بزووتنەوەی کوردی لێکدەدایەوە و گەلێ نموونە و بەڵگەی لەبارەی سیاسەتی توندوتیژ و بێبەزییانەی تورکەوە بەرامبەر بە کورد دەهێنایەوە و تۆمار دەکرد. هەروەها وتار و باسی دەربارەی مێژووی کورد و کوردستان و نێودارانی کورد، بەتایبەتی ئەوانەی بە دەستی تورك لەنێوبراون، بڵاودەکردەوە. هەروەها باس و خواسی هەوڵ و تەقەلا مێژووییەکانی خێڵ و هۆزە کوردەکانی دەخستە پێش خوێنەران، بەتایبەتی باسی ئەو هەولانەی ئەو هۆزانە دەیاندا بۆ رزگاربوون لە باج و سەرانەی دەوڵەت.

لێرەدا ئەوەشی لەبیر نەدەکرد بۆ خوێنەرانی باسی ئەو هێرشە سەرکوتکەرانەی تورکیش بگێڕێتەوە کە دەکرانە سەر ئەو هۆزانە لە نێوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستاندا. هەمووئەو لایەنانە زۆر شارەزایانە بە گەلێ بەڵگە و نموونەی زەقەوە دەخرانە پێش خوێنەرانی رۆژنامەکە وەکوو مێژووی بزووتنەوەی ئازادیخوازیی گەلی کورد. ئا بەم شێوەیە مێجەر سۆن ئەوبزاڤەی پێگەیاند کە ئەوڕۆ داوای سەربەخۆیی کوردستان دەکات لەژێر چاوەدێری ومەنداتی ئینگلیزدا.

سەرهەڵدانی بزاڤی نیشتمانیی لە ئەنادۆڵ و هەوڵ و تەقەلای ئینگلیز بۆ بەکارهێنانی خێڵە کوردەکان لەدژی بزاڤی کەمالییەکان، دەگەڕێنەوە بۆ ئەو سەردەمە. بەڵام کەمالییەکان بەسەر کوردەکاندا سەرکەوتن و پەیمانیان لەگەڵدا بەستن و بەم شێوەیە پەیوەندی نێوان هەردوولا سەردەمێکی ئاشتی بەخۆیەوە بینی. بەهۆی بزاڤی کەمالییەکانەوە هەموو پەیوەندییەکانی رێکخراوە کوردییەکانی ئەستەمووڵ لەگەڵ بزووتنەوەی کوردا لە خودی کوردستاندا بچڕان، چونکە کەمالییەکان دەستیان بەسەر ئەو پۆستانەدا دەگرت کە لە ئەستەمووڵەوە دەهاتن و لەنێویان دەبردن. بەم شێوەیە هەواڵ و ئاگادارییەکان نەدەگەیشتنە دەستی کوردە لاوەکان. رێکخراوە کوردییەکان تەنها لەو نێوچانەی لەلایەن ئینگلیزەوە داگیر کرابوون، دەیانتوانی هەندێ چالاکی بنوێنن. ئەم بارەش رێگەی بۆ ئینگلیز خۆش دەکرد بۆ ئەوەی بە یەکجاری کۆنترۆڵی بزووتنەوەکە بکەن و دەست بگرن بەسەریا. گەلێ لە کوردە لاوەکان کە نەیاندەویست لەتەك ئینگلیزا هاوکاری بکەن، وڵاتیان بەجێهێشت و روویان کردە هەندەران. بەم شێوەیە بزاڤی کوردستانی باکوور رێگایەکی تایبەتی گرتە بەر. بەڵام دیپلۆماتە ئینگلیزەکان لە هەوڵ و تەقەلای خۆیان نەکەوتوون لەپێناوی بەکارهێنانی ئەو بزاڤەدا بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆیان. گرنگترین ئەو ئامانجانەیش هەڵبەتە چەسپاندنی دەسەڵاتی بریتانیایە لە باکووری میسۆپۆتامیادا. ئینگلیزەکان لە کوردستانیش پەنایان دەبردەبەر هەمان سیاسەت کە دەسەڵاتیانیان لە میسۆپۆتامیادا پێی پاراستبوو، بەڵام باری کوردەواری و دوژمنایەتی و ململانێی هۆزەکان

وجیاوازی و ناکۆکی بەرژەوەندییەکانی گروپە جۆربەجۆرەکان، ئینگلیزیان ناچار کرد چەندین جار سیاسەتیان لە کوردستاندا بگۆڕن و هەر جارەی پشت بە گرووپێك ببەستن و لایەنگیری لە ڕێبازێ بکەن.

باری کۆمەڵایەتی کورد و پایە و دەسەڵاتی مەزنی سەرۆك هۆز و پیاوە ئاینییەکان لە کۆمەڵگای باوکسالاریدا و ناکۆکی و دوژمنایەتی هەمیشەیی خێڵ و تیرەکان، جگە لە ئابووری هەمیشە گۆڕاوی هۆزە کۆچەرەکان، هەموو ئەمانە هەلی باشیان بۆ ئینگلیز رەخساندووە. لەبەر ئەو هۆیانە سیاسەتی ئینگلیز دەتوانێ بە ئاسانی کار بکاتە سەر دروستکردنی کۆمەڵە و گروپی جیاواز و پێگەیاندنی سیاسەتمەداری گوێڕایەڵ و لایەنگر و، تەنانەت کارکردنە سەر رەوتی بزاڤی کوردیش. بۆیەکا دەبێ نەك تەنها لەگەڵ باری ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردا ئاشنا بین، بەڵکوو دەبێ زانیاری باشمان لەبارەی سیاسەتمەدار و گروپە سیاسییەکانی کوردیشەوە هەبێ. هەروەها دەبێ بزانین نوێنەرایەتی کام هۆز و خێڵ و تیرە دەکەن و بەرژەوەندی کێ دەپارێزن. بۆ ئەم مەبەستە وا لە خوارەوە هەندێ زانیاری دەربارەی ئەو سەرکردە کوردانە کە ئەمڕۆ لە کوردستاندا رۆڵی سەرەکی دەبینن، دەخەینە بەر دەستی خوێنەران و هەوڵ دەدەین چالاکییەکانیان هەڵبسەنگێنین.

ناوچەکانی باشووری کوردستانی تورکیا (مەبەستی باشووری کوردستانی ئەورۆیە.ج) کە ئەمڕۆ لەلایەن ئینگلیزەوە داگیرکراون، لە دەوری سەید تەها (٢٩) دوژمنی سەرسەختی تورکیا و دارەدەستی ئینگلیز کۆبوونەتەوە. نێوبانگ و دەسەڵاتی سەید تەها گەلێ ناحەزی بۆیان دروست کرد کە بەهێزترینیان شێخ عەبدولقادرە (٣٠). شێخ

عەبدولقادر خۆی بە یەکخەری کوردستانی باکوور دادەنێ و پەیوەندییەکی بەهێزی لە گەڵ کەمالییەکاندا هەیە. بەهۆی پیلانەکانی شێخ عەبدولقادرەوە حکوومەتی تورک کەوتە راونانی سەید تەها و چەند جارێك لە کاتی خۆیدا لە زیندانی توند کرد و بۆ ئەستەموولی دوور خستەوە.

سەید تەها لەنێو کوردا گەلێ پایەدار و بەنێوبانگە. دەسەڵاتدارانی تورك کە یەکەم جار ویستیان دەستگیری بکەن، دوو سەد جەندرمەیان بۆ ئەو مەبەستە ناردە سەری. بەڵام کوردەکان کاتێ زانییان سەید تەها گیراوە، هێرشیان بردە سەر جەندرمەی تورك و سەید تەهایان رزگار کرد. ئەوجا فەرمانڕەوایی تورك بڕیاریان دا پەنا ببەنە بەر فڕوفێڵ و چوارسەد جەندرمەیان بۆ دەستگیرکردنی رەوانەی شەمدینان کرد. ئەمجارەش دوای دیلکردنی سەید تەها، لایەنگرانی هەوڵیان دا رزگاری بکەن و دەوری هێزەکەی دەوڵەتیان گرت. بەڵام سەرکردەی ئەو هێزە هەڕەشەی ئەوەی لێکردن کە ئەگەر یەك تەقە لە هێزەکەی بکرێ، ئەوا یەکسەر ئەو بە دەستی خۆی سەید تەها دەکوژێ. دوای ئەم هەڕەشەو گوڕەشەیە سەید تەها داوای لە پیاوەکانی خۆی کرد ئارام بگرن و بڵاوەی لێبکەن. یەکسەر بە گیراوی برا بۆ مووسڵ.

بە گرتنی سەید تەها ئاژاوە و بگرەو بەردە لەنێو کوردەکانا زیاتر پەرەی سەند، بۆیەکا والی مووسڵ ناچار بوو ئازادی بکاو بینێرێتەوە بۆ کوردستان. ئەم راونان و ئەزیەتدانەی سەید تەها لەلایەن تورکەوە، وای لێکرد ببێتە دوژمنێکی سەرسەختی دەسەڵاتی تورك. ئینگلیزەکان کە ئاگایان لەم بگرەو بەردەیە هەبوو و لەم رووداوانەی دواییدا بە

باشی کەڵکیان لە دوژمنایەتی سەید تەها لەگەڵ تورکەکاندا بۆ بەرژەوەندی خۆیان وەرگرت. هەر لەم کاتەشدا بوو ئینگلیزەکان یارمەتی سمکۆیان (٣١) دەدا و لایەنگرییان لە هێرشەکانی دژی حکوومەتی ئێران دەکرد. سمکۆ دەیویست حکوومەتێکی کوردی سەربەخۆ لە باکووری کوردستاندا دابمەرزێنێ (٣٢). سەید تەها پەیتا پەیتا لەنێوان سمکۆ و فەرماندەی لەشکری ئینگلیزدا هاتوچۆی دەکرد و پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولای بەتین دەکرد و چەك و یارمەتی لە بەغداوە بۆ سمکۆ و هەڤاڵانی دەهێنا. لەم رۆژانەدا سەید تەها چالاکانە لەدژی کەمالییەکان وەستاوە و بووەتە کۆسپێك لە رێگەی بڵاوکردنەوەی دەسەڵاتیاندا لەناوچەی پڕ لە نەوتی مووسڵدا.

یەکێ لەسەرکردە بە نێو بانگەکانی تری کورد شێخ مەحموودی کوڕەزای کاك ئەحمەدی شێخە، کە یەکێك لە سەیدە بە نێوبانگەکانی بەرزەنجەیە وا رەچەڵەکی خۆیان دەبەنەوە سەر ئیمام عەلی و فاتیمەی ژنی و لای سوننە و یەعەش رێزێکی زۆریان هەیە. شێخ مەحموود کوڕی سەید رەسووڵە و دەسەڵاتێکی زۆری لە هەموو ناوچەی شارەزووردا هەیە (٣٣). ئەم ناوچەیە گوڵعەنبەر و سلێمانی تاوەکوو کەرکووك دەگرێتەوە. شێخ مەحموود لەنێو کوردەکاندا رێز و پایەیەکی یەگجار گەورەی هەیە و بە پیاوێکی پیرۆزی دادەنێن. مێژووی بنەماڵەی شێخ مەحموود هۆی ناحەزی و دوژمنایەتییان بەرامبەر بە دەسەڵاتدارانی تورکیا روون دەکاتەوە. حکوومەتی تورك کە بە چاوێکی پڕ لە گومانەوە دەڕوانێتە بزاڤی نەتەوەیی کورد، هەمیشە مەترسی لە دەسەڵات و نێوبانگی ئەم بنەماڵەیە هەبوە و هەوڵی داوە هێز و نێوبانگ و دەسەڵاتیان لەنێو کوردەکاندا کەم بکاتەوە.

بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش پەناری بردۆتە بەر پیلان و فڕوفێڵە باوەکانی رۆژهەلات. سەید رەسوولّ (راستیەکەی شێخ سەعیدە.ج) و چل کەس لە خزم و کەس‌وکار و دەست و پێوەندەکانی راگوێزرانەوە بۆ مووسلّ و رێگەیان پێنەدرا بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی. دەسەلاتدارانی تورك نەیاندەوێرا بە ئاشکرا و راشکاوەیی دژی بنەماڵەی شێخ مەحموود بوەستن، بۆیەکا بڕیاریان دا ئاژاوەیەك لەنێوان ئەمان و دانیشتوە عەرەبەکانی شاری مووسلا بنێتەوە.

لەگەلّ ئەوەی ئەو گەرەکەی بۆ نیشتەجێبوونی شێخ سەعید و دەستە و دایەرەکەی تەرخان کرابوو، لەلایەن هێزێکی پاسەوانی تایبەتییەوە دەپارێزرا، لەکاتی ئاژاوەکەی ئەم پاسەوانانە نەك تەنها شێخ و پیاوەکانیان نەپاراست بەڵکوو دایانە پالّ عەرەبەکان. لە ئەنجامی ئەم کارەساتەدا هەموو کوردەکان کوژران و خێزانەکەی شێخیش بەر ئەم کۆمەڵکوژییە کەوت. لەم کارەساتەدا تەنها شێخ مەحموود کە تەمەنی دە سالّ بوو لەگەلّ یەکێك لە خزمەکانیا خۆی گەیاندەوە کوردستان (٣٤). ئەم کۆمەڵکوژییەی شێخ سەعید و هەڤالانی توورەیی و بێزارییەکی بێ‌ئەندازەی لە سەرانسەری کوردستاندا تەقاندەوە و کوردەکان سوێندی ئەوەیان خوارد کە هەموو دانیشتوانی مووسلّ لەنێوبەرن و گەمارۆی ئەو شارەیان دا. بەلام حکوومەتی تورکیا سوپایەکی زۆری ناردە مووسلّ و کەوتە نێوان هەردوو لاوە و توانی کوردەکان هێور بکاتەوە.

شێخ مەحموود بە خۆیشی گەلێ جەزرەبەی بەدەست تورکەوە چێژا بوو. لەگەلّ ئەوەشدا لە کاتی شەڕی جیهانیدا بە هەزار سوارەوە لە

دەروێش و موریدەکانی چووە بەرەکانی شەڕ لە سووریا لە دژی سوپای فەرەنسی دەجەنگی و یارمەتییەکی گەورەی سوپای تورکی دەدا (٣٥). شێخ مەحموود لەو شەڕەدا وەکوو رابەرێکی موسوڵمان لە دژی گاوران دەجەنگی و هانی خەڵکی دەدا لە دژی بێباوەڕان بەشداری لە "جەنگی پیرۆز"دا بکەن و ئیسلام بپارێزن. لێرەشدا کێشە و ئاڵۆزی لەنێوان شێخ مەحموود و فەرماندەی سوپای شەشەمی تورکدا سەریان هەڵدا، کاتێ داوا لە شێخ مەحموود کرا بچێتە شاری مووسڵ، بەڵام شێخ قایل نەبوو بچێتە ئەو شارەی کە باوکی تێیدا بەو شێوە دڕندانەیە کوژرا. دوابەدوای ئەمە شێخ لە سلێمانی دەستگیر کراو بە یاخیبوون لە جێبەجێکردنی فەرمانی سوپای تورک گوناهبار کراو لە زیندانی مووسڵ تاوەکوو بەهاری ساڵی ١٩١٧ قایم کرا.

کاتێ ئینگلیزەکان دوای داگیرکردنی بەغدا بەرەو مووسڵ هەڵکشان و لەبەر ئەوەی تاکتیکی ئەو دەمەیان ئەوە بوو پشتگیری لە بزاڤی عەرەبەکان لەدژی تورک بکەن، بۆ فەرماندەی سوپای شەشەمی تورکیش عەلی ئیحسان پاشا ئاشکرا بوو کە عەرەبی دانیشتووی مووسڵ پێشوازی لە ئینگلیز دەکەن و هیوای تورک لە مووسڵدا نەماوە، ئەو کاتە بڕیاری دا پەنا بباتە بەر کورد. بۆ ئەم مەبەستە شێخ مەحموودی لە زیندان ئازاد کرد و بە هەموو شێوەیەك دڵنەوایی دایەوە و پێشنیاری بۆ کرد بچێتەوە سلێمانی و هێزەکانی دژ بە ئینگلیز کۆ بکاتەوە و سەرکردایەتی بەرهەڵستیی لەبەرامبەر داگیرکەران بکات. دوای ئەم کەین و بەینە بە دە رۆژ سوپای ئینگلیز شاری مووسڵی داگیر کرد. شێخ مەحموودیش دەستی کردە کۆکردنەوەی هێز و رێکخستنی بەرهەڵستی دژی ئینگلیز، بەڵام ئەمان

توانیان زوو دەستگیری بکەن و بۆ بەسرەی دوور بخەنەوە و بۆ ماوەی دوو ساڵی رەبەق لەویٚ لە قەڵایەکدا زیندانیان کرد (٣٦).

کاتیٚ پلانی دامەزراندنی کوردستانیٚکی سەربەخۆی یەکگرتوو بە سەرۆکایەتی سمایل ئاغای سمکۆ کە ئینگلیزەکان هەوڵیان بۆ دەدا سەری نەگرت، جاریٚکی تر شیٚخ مەحموودیان لە زیندان ئازاد کرد و ناردیانەوە بۆ کوردستان و لە شاری سلیٚمانی هەر بە خۆیان کردیانەوە بە مەلیکی کوردستان (٣٧).

فەرماندەی سوپای ئینگلیز بەتەما بوو کوردستانی سەربەخۆ دژی کەمالیەکان بەکاربیٚنیٚ، بەلام شیٚخ مەحموود قایل نەبوو پلانەکانی ئنگلیز جیٚ بە جیٚ بکا و لە رەشەمیٚی ١٩٢٣دا پەیوەندییەکانی نیٚوان هەردوولا تیٚکچوون و شەوی سیٚ لەسەر چواری مارت شیٚخ مەحموود و زۆربەی دانیشتووانی سلیٚمانی شاریان بەجیٚهیشت و پەنایان بردە بەر ساریداغ (٣٨). کە دەکەویٚتە باکووری رۆژئاوای سلیٚمانی‌یەوە. بەگویٚرەی هەندیٚ هەواڵی تر لە سنووری ئیٚران پەڕیوەتەوە و پەنای بردۆتە بەر هۆزی هەورامان. گفتوگۆکانی شیٚخ مەحموود لەگەڵ حکوومەتی ئەنقەرەدا لەبارەی ئۆتۆنۆمییەوە بۆ کوردستان، هۆیەکی سەرەکی تیٚکچوونی پەیوەندییەکانی بوو لەگەڵ ئینگلیز (٣٩). لەم رۆژانەدا شیٚخ مەحموود هەڵویٚستی چاوەڕوانیی گرتۆتە بەر و گومان لەوەدا نیە کە کەمالییەکان دەتوانن بیکەنە هاوپەیمانیٚکی دڵسۆزی خۆیان ئەگەر چاویٚك بخشیٚننەوە بە سیاسەتیاندا لەمەڕ دۆزی کورد.

شیٚخ عەبدولقادر کوڕەزای شیٚخ عوبەیدولای بەنیٚوبانگە و بارەگا ومەڵبەندی بنەماڵەکەیان شەمزینان بوو. شیٚخ عوبەیدولا ریٚز و

پایەیەکی یەگجار گەورەی لەنێو کوردەکاندا هەبوو، هەر وەکوو پێغەمبەرێك سەیریان دەکرد و زەوی‌وزارێکی زۆری هەبوو. تورکە لاوەکان کە بە گومان و رقەوە دەیانڕوانیە هەر هەستێکی نەتەوەیی لای گەلانی ناتورك، بەو پلەو پایەی بنەماڵەی شێخ نارەحەت بوون و هەوڵیان دەدا لە هێز و دەسەڵاتیان کەم بکەنەوە. بۆیەکا شێخ عەبدولقادریان لە ئەستەموول نیشتەجێ کردبوو و لە بزاڤی کوردیان دابڕیبوو. شێخ گەلێ پلەو پایەی بڵندی لە دەزگاکانی دەروازەی باڵادا پێ بەخشرا بوو. لەم ساڵانەی دواییدا ئەندامی ئەنجومەنی سینات (مەجلیسی ئەعیان) ی عوسمانی بوو. شێخ عەبدولای خزمی (راستیەکەی کوڕی شێخ عەبدولقادر بوو.ج) سەرپەرشتی زەوی‌وزارەکانی لە شەمزینان دەکا و لەسەر داواکاری شێخ عەبدولقادر خەباتێکی بێ‌وچان لەدژی بنەماڵەی سەید تەها دەکات. شایانی باسە ململانێ و پێشبڕکێی بنەماڵەی سەید تەها لەگەڵ بنەماڵەی شێخ عەبدولقادردا لەسەر دەسەڵاتە بەسەر کوردەکاندا. لەم رۆژانەدا کەمالییەکان هەوڵ دەدەن نێوبانگ و دەسەڵاتی شێخ عەبدولقادر لە باکووری کوردستاندا دژی هەوڵ و تێکۆشانی سەید تەها بەکار بێنن.

لە سەرکردە نێودارەکانی تری کورد دەبێ نێوی شێخ حوسامەدین و شێخ نەجمەدینی برایشی ببەین کە دەسەڵاتی ئاینییان بەسەر هەموو کوردستاندا دەڕوا، بەتایبەتی شێخ نەجمەدین کە لای کورد بە پیاوێکی پیرۆز نێوبانگی رۆیشتوە و نێوی شایان لێناوە.

سمایل ئاغای شکاك سمکۆ هەرچەندە نوێنەری کوردی ئێرانە، بەلام هەمیشە رۆڵێکی زۆری لە چارەنووسی کوردستانی تورکیادا

بینیوه. سمکۆ لە هۆزی شکاکە کە لەنێوچەکانی نێوان دەریاچەی ورمێ و سەڵماسەوە تاوەکوو سنوورەکانی تورکیا بڵاوبوونەتەوە. عەلی ئاغای شکاك کە دەکاتە باپیری سمکۆ بە هاوکاری لەگەڵ شێخ عوبەیدوڵا لە دوا ساڵەکانی فەرمانڕەوایی ناسرەدین شا و لەژێر دروشمی جەنگی پیرۆزدا دژی شیعە، بەشێکی زۆری ئازەربایجانی تاوەکوو دەوروبەری شاری تەورێز داگیر کرد. ئەوەی شایانی باسە داگیرکردنی ئازەربایجان هەمیشە شوێنێکی گرنگی لە پلانە فراوانخوازی و دوژمنکارییەکانی تورکدا هەبوە. دوای خەباتێکی سەخت دژی حکوومەتی ئێران عەلی ئاغا گیرا و لەسێدارە درا. چارەنووسی جافەر ئاغای باوکی سمکۆ و برا گەورەکەشی هەر بە هەمان شێوە بوو و هەردوکیان سەریان تێدا چوو. هەر ئەم رووداوانە بۆ خۆیان بەس بوون بۆ ئەوەی سمکۆ ببێ بە دوژمنی سەرسەخت و باوەکوشتەی دەسەڵاتدارانی ئێران. لە دەسپێکی شەڕی جیهانییەوە سمکۆ لەسەر شانۆی رووداوەکانی ئەو نێوچەیە پەیدا دەبێ. لە سەرەتادا لەگەڵ هێزەکانی رووسیادا هاوکاری دەکا و دژی تورك دەجەنگێ.

مێژووی ئەم رووداو و چالاکییانە زۆر ئاڵۆزە و مرۆڤ ناتوانێ بە باشی لێیان تێبگات ئەگەر کورتەیەکی سیاسەتی تورکیا لەمەڕ ئازەربایجان و پیلانەکانی ئەڵمانیا لە کوردستان و هەموو ئێران لەکاتی شەڕی جیهانیدا نەخرێنە بەردەستی خوێنەر. لێرەدا تەنها ئەوەندە دەڵێین کە تورکیا و ئەڵمانیا تەنانەت پێش ئەوەی تورکیا بەشداری کردنی خۆی لەو شەڕەدا رابگەیەنێ، هەوڵیان دەدا ئاژاوە

لەنێوان خێڵەکانی کوردستان و هێزەکانی رووسیا بنێنەوە. تورك و ئەڵمان یەکێ لە نەتەوە پەرستە ئێرانییەکانیان بە نێوی میر حیشمەت دەستنیشان کرد بوو بۆ ئەوەی سەرپەرشتی چالاکییەکانی کورد دژ بە رووسیا بکات. ئەو سیاسەتە زیانی دەگەیاندە پایە و دەسەڵاتی سمکۆ، بۆیەکا ئەمیش بڕیاری دا خۆی بداتە پاڵ رووسەکان. سمکۆ سالآنی شەڕی جیهانیی بە هەل زانی بۆ بە هێزکردنی دەسەڵات و توانای خۆی و زوو زوو هەڵوێستی دەگۆڕی و ئەم بەر و ئەو بەری دەکرد و هەر جارەی لایەنگیری لە لایەك لە لاکانی شەڕ دەکرد و هەمان مەترسی بۆ دوژمنان و هاوپەیمانەکانی پێکدەهێنا. هەر لەکاتی ئەو شەڕەشدا بوو پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا پەیدا کرد، چونکە ئینگلیزەکان لە هەوڵی ئەوەدا بوون کورد وەکوو کۆسپێك راستبکەنەوە لەبەردەم بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی تورك و ئەڵماندا لە هەموونێوچەی رۆژهەڵاتدا. دوای بەرپابوونی شۆڕش لە رووسیا و کشانەوەی ئەو وڵاتە لە شەڕی جیهانی، سمکۆ سەربەخۆییەکی تەواوی بە دەست هێنابوو.

لێرەوە خەباتی سمکۆ لەدژی حکوومەتی ئێران دەستی پێکرد. دەسەڵاتدارانی ئێرانیش هەموو هەوڵیان بۆ ئەوە بوو کە سمکۆ بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە و بە هەر شێوەیەك بێ لە پایە و دەسەڵاتی کەم بکەنەوە. کاتێ شۆڕشی کەمالییەکان لە تورکیا دەستی پێکرد کۆمەڵی ئەفسەر و سەرباز کە نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان لە دەوری سمکۆ کۆببونەوە (٤٠). ئەو کاتە هێزەکەی سمکۆ زیاتر لە سوپایەکی میری دەکرد، چونکە ئەو ئەفسەرانە کە ساڵەهای ساڵ بوو لە ریزی

سوپادا کاریان دەکرد هێزەکانی سمکۆیان ڕێکدەخست و مەشقیان بە پیاوەکانی دەکرد و بە هۆی پەیوەندییە کانی بە فەرماندەی سوپای ئینگلیزیشەوە دەیتوانی چەك و جەبەخانەی باشیان بۆ پەیدا بکات.

لەو کاتەدا سەید تەها پەیتا پەیتا لە بەغداوە تۆپ و تفەنگ و پارە و تەنانەت راوێژکاری ئینگلیزیشی دەگەیاندە لای سمکۆ. هەر لەو کاتانەشدا بوو کە هێزەکانی سمکۆ چەند جارێك بەسەر سوپای ئێراندا سەرکەوتن و گەلێ چەك و جبەخانەیان وەچنگ هێنا کە بە گوێرەی هەندێ سەرچاوە بریتی بوون لە هەشت تۆپهاوێژ و چەند چەکێکی ئۆتۆمات وسێ هەزار تفەنگ.

ئەم سەرکەوتنانە سمکۆیان زیاتر بە هێز کرد و هەر دوا بە دوای ئەو سەرکەوتنانە جاڕی سەربەخۆیی کوردستانی داو خۆی بە مەلیکی کوردستان راگەیاند و ئاڵای تایبەتی خۆی هەڵکرد. ئاڵاکەی سمکۆ بریتی بوو لە دوو ئامێری چیایی کە بە شێوەی خاچ لە یەکیان دابوو و لەسەری نووسرابوو "کوردستانی ئازاد" (٤١). ئەم رووداوانە لە بەهاری ساڵی ١٩٢٢دا روویان دابوو، بەڵام لە ئۆگست (ئاب)ی هەمان ساڵ سوپای ئێران بەسەر هێزەکانی سمکۆدا سەرکەوت و بنکەکەیان لە " چارەك قەڵا" داگیر کرد و سمکۆ بە خۆیشی ناچار کرا پەنا بباتە بەر کوردستانی تورکیا. لەوێش هەوڵی کۆکردنەوەی هۆزەکانی نێوچەی وانی دا، بەڵام کەمالییەکان بەرانگاری بوونەوە و لێرەش تووشی شکستی هات. بۆ ماوەیەك باس و خواسی سمکۆ لە ئارادا نەما، بەڵام سەرکەوتنی ئینگلیز لە باشووری کوردستاندا کەمالییەکان ناچار دەکات بیر لە دروستکردنی بەرەیەکی کوردی دژ بە ئینگلیز

بکەنەوە. بۆ بە دیهێنانی ئەو مەبەستەش کەمالییەکان بڕیاریان داوە کەڵك لە سمکۆ و شێخ مەحموود وەربگرن. بە گوێرەی هەواڵەکانی ئەم دواییە سمکۆ لەگەڵ کەمالییەکان ئاشت بۆتەوە و چالاکییەکی زۆر دەنوێنیٚ بە کۆکردنەوەی کوردەکانی باکووری ئێران و ڕێکخستنی هێزەکانیان.

ئەم باسەی ئێمە ئەو بەشەی مەسەلەکە ناگرێتەوە، تەنها ئەوەندە دەڵێم کە بزووتنەوەی کوردی تورکیا بێگومان کارێکی زۆر دەکاتە سەر باری کوردستانی ئێران. هەواڵی دەستکەوتەکانی بزاڤی کوردی تورکیا دەگاتە کوردەکانی ئێران و پێشبینی و ئاسۆکانی کوردستانێکی ئۆتۆنۆمی هێناویانێتیە جۆش (٤٢). ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە دەسەڵاتدارانی ئێران هەروەکوو جاران هەوڵ دەدەن چەکی کوردەکان داماڵن و بیانخانە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی ناوەندی دەوڵەتەوە و بەتوندی هەمووبیرێکی سەربەخۆیی کورد سەرکوت دەکەن. لەبەر ئەو هەمووهۆیانە کوردەکان دوای سمکۆ دەکەون. بزووتنەوەکەی گەلیٚ ئاڵۆزی و بگرەو بەردەی بۆ ئازەربایجانی ئێران هێناوەتە کایەوە. کوردەکانی ئێران بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەو کۆبوونەوەیە دەکەن کە بڕیارە لە داهاتوودا لە وان ببەستریٚ بۆ ڕاڤەکردن و لێکدانەوە و گفتوگۆ دەربارەی دۆزی کورد و داهاتووی وڵاتی کوردان، کوردستان. هەواڵەکان وا رادەگەیەنن کە هەموو سەرکردەکانی بزاڤی کورد لەم کۆبوونەوەیەدا بەشدار دەبن.

## پەراوێزەکان:

١- مەبەستی لاهووتی لە زاراوەی "کوردستانی تورکیا" هەموو ئەو ناوچە کوردییانەیە کە کاتی خۆی لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئۆسمانیدا بوونە و لەلایەن دەروازەی باڵاوە بەڕێوە براونە و ئەو سێ بەشەی کوردستان دەگرێتەوە کە ئەمڕۆ لکێنراون بە تورکیا و عێراق و سوریاوە.

٢- لەم بارەیەوە بڕوانە م. پاڤلۆڤیچ، ململانێ لەسەر ئاسیا و ئەفریقا، کە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی زانستیی رۆژهەڵاتناسیی رووسیا، مۆسکۆ ١٩٢٣. ل ٧٨-٨١ بە زمانی رووسی(و.ر).

٣- لەوە دەچێ وەرگێڕی وتارەکە بە هەڵە وتەکانی لاهووتی وەرگێڕابێ، چونکە سەرجەمی باسەکە لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا ناگونجێ. لێرەدا مرۆڤ ناتوانێ هۆی راستەقینەی ئەم بۆچوونە سەد دەر سەد دەستنیشان بکات، چونکە دەقە فارسییەکەمان لەبەر دەستدا نیە. رەنگبێ مەبەست لەوەبێ وەکوو لەنێو نووسەرە بیانییەکاندا باوە کە کورد بە درێژایی مێژوو دەوڵەتی سەربەخۆی یەککگرتووی خۆی نەبوە. خۆ ئەگەر وا نەبێ ئەوا گەلێ سەیرە بیرو بۆچوونێکی وا لە وڵاتێکی وەکوو رووسیادا بڵاوبکرێتەوە، چونکە لەو وڵاتەدا سەدان رۆژهەڵاتناسی وەکوو ژابا، لێرخ، ئەبۆڤیان، ئیگیازارۆڤـ ، ئەڤریانۆڤ ، مینۆرسکی، نیکیتین، گەردەلێڤسکی گەلێکی تر دەیان باس و

لێکۆڵینەوەیان دەربارەی کورد و کوردستان  تاوەکوو ئەو کاتە تۆمار کردبوو و هەموو لەسەر ئەو باوەڕە یەکبوون کە کورد خاوەن کولتوورێکی ڕەسەن و خۆماڵییە. وادیارە لە گەرمەی شۆڕشی بەلشەڤیکاندا هەموو ئەو بەرهەمانە پشت گوێ خرابوون و بە بەرهەمی سەردەمی ئیمپریالیزم و بورژوازی لە قەڵەم دەدران و لەبەرامبەر ئەو قوتابخانە بەئەزموونە، هەوڵ دەدرا قوتابخانەیەکی نوێی ڕۆژهەڵاتناسیی لە چوارچێوەی بیری دەسەڵاتدارانی نوێدا بنیات بنرێ.

٤- شەرەفخانی بدلیسی لە ٢٣ی شوباتی ساڵی ١٥٤٣دا لە شارۆچکەی کریهرودی نزیك شاری قومی ئێراندا هاتۆتە دونیاوە، چونکە باوکی میر شەمسەدینی بدلیسی لە ساڵی ١٥٣٥دا لەژێر گوشاری سوڵتان سولەیمانی قانوونیدا ناچار بوودەست لە فەرمانڕەوایی بدلیس هەڵگرێ و خۆی بداتە پاڵ شای سەفەوی کە یەکسەر کردی بە فەرمانڕەوای کریهرود. شەرەفخان بە منداڵی سێ ساڵی لە کۆشکی شا توهماسبدا بردە سەر و لەگەڵ میرزادە و زارۆیانی دەسەڵاتدارانی ئێراندا لە قوتابخانەی کۆشکی شاهانە دەیخوێند و گەلێ پایە و پلەی بڵندی لە ئێراندا وەدەستهێنا، بەڵام لە ساڵی ١٥٧٨ گەڕایەوە سەر تەختی میرێتی بۆ بدلیس و بۆ ماوەی دە ساڵ لەگەڵ سوڵتان موورادی سێیەمیندا لە هەموو هێرشەکانی دەوڵەتی ئۆسمانیدا بۆ سەر قەوقاز و ئێران بەشداری کرد. لە تەمەنی ٥٣ ساڵیدا دەستی لە تەختی میرێتی بۆ کوڕەکەی هەڵگرت و بۆ خۆی دەستی کردە نووسینی مێژووی کورد. لە ١٣ی ئابی ١٥٩٧ لە نووسینی بەرگی یەکەمی کتێبەکەی بە نێوی "شەرەفنامە" بووەوە و دەستی کردە نووسینی

بەرگی دووەمین کە نێوی "خاتمە"ی لێنا و لە ئەیلوولی ١٥٩٨ تەواوی کرد. تاوەکوو ئێستا نازانرێ شەرەفخان کەی کۆچی دوایی کردووە. یەکێك لە نەوەکانی دەڵێ لەساڵی ١٦٠٣/ ١٦٠٤ کۆچی دوایی کردووە. بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی شەرەفخانی بدلیسی و شەرەفنامەوە بڕوانە، شەرەفخانی بدلیسی، شەرەفنامە، هەژار کردوویە بە کوردی، بەغدا ١٩٧٣. هەروەها بڕوانە: دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو، بەغدا ١٩٨٣.

٥- ئەم بۆچوونەی لاهووتی لە راستییەوە دوورە، چونکە بەراوردێکی سەر پێی زمانی کوردی لەگەڵ زمانی تورکی و بە تایبەتی فارسیدا ئەو راستیەمان بە راشکاوەیی بۆ دەردەخا، کە زمانی کوردی چەندە زمانێکی پاراوە، لەکاتێکدا وشە و زاراوەی بێگانە زمانی فارسییان بە دەردێکی خراپ بردوە. هەڵبەتە نابێ مرۆڤ ئەو راستییەش لە یاد بکات کە هیچ زمانێك لە جیهاندا ناتوانێ بە داخراوی و دابڕاوی لە تەك دەوروبەردا بژێ و گەشە بکات. گومان لەوەدا نیە کە لاهووتی ئەم بیروباوەڕەی لەسەر بناغەی شیعری شاعیرانی کلاسیکی کورد و نووسینی کوردی چارەکەی یەکەمی ئەم سەدەیە لە لا پەیدا بووە. ئەو کاتە بەکارهێنانی وشەی فارسی و عەرەبی و تا پلەیەکیش تورکی و تەنانەت شیعر و هۆنینەوە بەو زمانانە و ڕەچاو کردنی کێش و یاساکانی شیعری عەرەبی و فارسی بەڵگەی رووناکبیری و زانایی بوون، بۆیەکا شیعرەکانیان پڕن لە وشەی عەرەبی و فارسی.

٦- لێرەشدا لاهووتی کەوتۆتە هەوڵەوە، چونکە لە هیچ سەرچاوەیەکی مێژووییدا باسی کۆچێکی وا نەکراوە، ئەمە لە لایەکەوە. لە لایەکی تریشەوە پرۆسەی بە شیعەکردنی ئێران بە گشتی

به بەشێکی کوردی ئێران به تایبەتی له کاتێکی درەنگدا دەستی پێکردووه و کوردێکی زۆری عەلەویش له باکووری کوردستاندا دەژین. بۆ دەستنیشانکردنی سنوورەکانی نێوان تورکیا و ئێران تەنها دیاردە سروشتیەکان رەچاو دەکران، بۆیەکا دەبینین هەمان هۆزی کورد دابەش کراوه بەسەر دوو وڵاتدا و له پاش شەڕی یەکەمی جیهانیش بەسەر سێ وڵاتدا. هەر لەبەر ئەوەشه پەیوەندی توند و تۆڵیان لەگەڵ یەکدا هەیەچونکه ئەندامی یەك گەڵ و هەندێ جار یەك هۆز تەنانەت یەك بنەماڵەشن.

٧- رەنگبێ ئەورۆ هیچ پێویست بەوه نەکات که مرۆڤ خۆی زۆر بەم جۆره بۆچوونانەوه خەریك بکات.تەنها ئەوەندە دەڵێم که زمانی کوردی و فارسی یەك زمان نین، بەڵکوو دوو زمانن سەر به یەك خێزانی زمانان که پێی دەڵێن خێزانی زمانه هیندو ئەوروپاییەکان. ئەم خێزانەش بۆ خۆی دەیان لق و پۆپی لێدەبێتەوه وەکوو گرووپی زمانه سولافییەکان و زمانه جەرمانییەکان و زمانه لاتینییەکان و زمانه ئێرانییەکان (که کوردی و تاجیکی و پشتو و بەلوچی و ئۆسیتی و فارسی دەگرێتەوه). پەیوەندی کوردی و فارسی هەمان پەیوەندییه که لەنێوان پۆڵۆنی و رووسی، ئیتاڵی و ئیسپانی ئیتاڵی و ئینگلیزی و ئەڵمانیدا هەیه. کێ دەتوانێ بڵێ پۆڵۆنی رووسیه و ئیسپانی ئیتاڵییەو ئینگلیزی ئەڵمانییه ؟ هەڵبەته کەس ناتوانێ. ئایه لاهووتی که گەلێ جار به شاعیری میللی تاجیکستان به خەڵك دەناسێنرا قەت وێراوێتی بڵێ تاجیکی فارسییه؟ هەڵبەته نا، چونکه استدلالی تاجیکستان ئەو کاته کۆماری سۆڤیەتی و ئێستاش دەوڵەتی سەربەخۆیه و گەلی

تاجیکیش شانازی بە زمان و کولتووری خۆیەوە دەکات. تاوەکوو ئێستاش هەندێ جار بە مەبەست یا بە بێ مەبەست گوێمان لێدەبێ کە جیاوازی لەنێوان کوردی و فارسیدا نیە. ئەمەش وتەیەکی نابەجێیە، چونکە ئەگەر دوو کورد بە کوردییەکی پاراو بئاخڤن ئەوا مرۆڤێکی فارس لە هەندێ وشەی هاوبەش بەولاوە هیچیان لی تێناگات.

٨- لێرەدا مەبەست لەو کوردانەیە کە شاعەبباسی سەفەوی بە زۆر رایگوێزانەوە بۆ خورسان. هەندێ نووسەری کورد بێ ئەوەی باسی سەرچاوەی زانیارییەکانیان بکەن ژمارەی ئەو کوردانە بە پازدە هەزار خێزان لە قەڵەم دەدەن. نووسەرێکی کورد ژمارەیان بە چل و پێنج هەزار خێزان دەقەبلێنێ. ئەگەر ئەم ژمارانە لەبەر رۆشنایی پێوان و یاسا دیمۆگرافییەکان لێکبدەینەوە کە دەڵێن ژمارەی دانیشتوان هەموو بیست و سی ساڵێك دوو ئەوەندەی خۆی دەبێتەوە و ئەگەر ئێمە ئەو بیست سی ساڵەش بکەین بە چل و پەنجا ساڵ و پێنج و شەش پەتای قڕکەر و هێرشی تەفر و توناکەرشی بخەینە سەر هێشتا دەبێ ئەوڕۆ ژمارەی کورد لە خوراسان لە دە ملیۆن کەمتر نەبێ. ئەمەش هەڵبەتە لە راستییەوە گەلێ دوورە. لەم بارەیەوە بڕوانە: محمد رسول هاوار، سمکۆ، ئیسماعیل ئاغای شوکاك، وبزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، چاپخانەی ئاپێك، ستۆکهۆڵم ١٩٩٦، ل ٣٥. هەروەها: عەبدوڵا قەرەداغی (مەلا عەلی)، راگوێزانی کورد لە مێژوودا، سوید ١٩٩١، ل٣٩، ٤٢. رۆژهەڵاتناسی رووس خاتۆ ئۆلگا ژیگالینا لەبارەی کوردەکانی خوارسانەوە دەڵێ (زیاتر لە دوو سەد و پەنجا هەزار کورد لە کاتی سەفەوییەکانەوە لە خوارسان وەکوو نیشتەجێ و نیمچە

کۆچەر دەژین. شا عەبباس پازدە هەزار خێزانی کوردی لە باکووری خوارسان نیشتەجێ کرد بەتایبەتی لەسەر سنوور لە ئەسترابادەوە بەرەو رۆژهەلات تاوەکوو قۆچان. مەرجێکیشی بۆ ئەم کوردانە دانا ئەویش پاراستنی سنوورەکنی باکووری خوارسان بوو لەبەرامبەر هێرشەکانی تورکمەن و ئوزبەکەکان. کوردە نیمچە کۆچەرەکان کە لەنێوچە شاخاوییەکانی باکووری خوراسان گوزەرانیان دەکرد دە لە سەدی کوردەکانی ئەو ئوستانەیان پێکدێنا.

کوردەکانی خۆراسان سەر بە دوو یەکێتی هۆزان بوون ئەویش زەفەرانلو و شادیلو بوون. ئەندامانی زەفەرانلو کە بە ژمارە زۆرتر بوون لە خاننشینی قوچان و شیروان و نێوچەکانی دەوروبەریاندا گیرسابوونەوە. ئەندامانی شادیلوش لەنێوچەی بوجنورد نیشتەجێ بووبوون. نێوچەکانی بلاوبوونەوەی کوردان لە خوراسان لە راستیدا خان نشێنێکی نیمچە سەربەخۆیان پێکدێنا (لە دەرەگەز و قەلات)، کە لە بیستەکانی ئەم سەدەیە دا لەنێوچوو. (ئۆ. ئی. ژیگالینا، بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە ئێران لە سالانی ١٩١٨ - ١٩٤٧ دا، مۆسکۆ ١٩٨٨. ل ١٠. ) لە پەراوێزی ئەو وتانەیدا خاتۆ ژیگالینا دەلێ "لەنێو کوردا دووبۆچوون هەیە لە بارەی راگوێزانی ئەو کوردانەوە بۆ خوراسان. یەکەمیان ئەوەیە کە ئەو کوردانە بەهۆی بزێوییانەوە لەلایەن تەیمووری لەنگەوە لە سوریاوە بۆ خوارزم و بوخارا گوێزراونەتەوە. ئەم کوردانە مردنی تەیمووری لەنگ و بەرپابوونی شەڕ و شوڕیان لەنێوان کوڕەکانیدا بە هەل زانی وبۆ ئەوەی بگەڕێنەوە سەر خاك وزێدی خۆیان، بەلام بەشێکیان نێوچەکانی دەرەگەز و قۆچان و

بورجنوردیان بە باش زانی بۆ مەڕومالآت و بەخێوکردن لە خۆراسان مانەوە. لە گۆڕ بۆچوونی دووەمین لە کاتی شا سمایلی سەفەویدا نزیکەی سی هەزار خێزانی کورد بۆ نێوچەکانی دەرەگەز و بورجنورد و قۆچان راگوێزران و ئەرکی پاراستنی سنووریان لەبەرامبەر تورکمەنەکاندا پێ سپێردرا. ئەم کوردانە دوای راگوێزانیان بۆ ئەو نێوچانە دەستیان کرد بە نیشتەجێبوون. دوو هۆی سەرەکی لە پرۆسەی نیشتەجێبوونی کوردی خۆراساندا رۆڵیان بینی یەکەمیان هەبوونی زەوی وزار وئاوی بێ خاوەنی زۆر و دووەمیش وادیارە دراوسێتیان لەگەڵ تورکمەناندا هاتو چۆ و بەهار و هەواریانی سنووردار کردبوو". (ئۆ. ژیگالینا، هەمان سەرچاوەی نێوبراو، ل١٥٤).

٩- لە گەرمیان بەم بازرگانانەیان دەگوت "دێوەرە" و تاوەکوو کۆچی جووەکانی کوردستان بۆ ئیسرائیل ئەم کارە پیشەی ئەوان بوو. بەڵام لە پەنجاکانەوە ئیتر دوکاندارەکانی شارۆچکەکان بە خۆیان ئەم کارەیان دەکرد. شت و مەکەکانیان بە زینی ماینەکەیاندا هەڵدەواسی و بریق و باقی میرو کوژەکە ودوگمە و قۆپچە و زەنگیانەوە..... هتد سەرنجی منداڵ و ژنانی دێیان بۆ لای خۆیان رادەکێشاو لە دێوەرە دەئالآن. لەگەڵ پەیدابوونی رێگاوبان وئۆتۆمۆبیلدا ئەم دیاردەیە وەکوو گەلێ دیاردەی تری ژیانی کوردەواری لەنێو چوو.

١٠- بە داخەوە دەقی ئەم شیعرانەم لەبەردەستدا نین کە لاهووتی کردوونی بە نموونە و بەڵگە بۆ بۆچوونەکانی خۆی. لە دەقە رووسییەکەشدا ئەو شیعرانە کراونە رووسی. وادیارە وتەکەی رۆژهەلآتناسی ئەرمەنیش ئەبۆڤیان کە دەڵێ "هەموو کوردێ شاعیرە! "

منی نەگرتۆتەوە، بۆیەکا هەوڵم داوە واتای شیعرەکان بە خوێنەران بگەیەنم.

١١- ناونیشانی شیعرەکەی یاقووب کرماشانی بە رووسی "میر"ە. وشەی میریش لە زمانی رووسیدا دوو واتای هەیە ئەویش "ئاشتی" و "جیهان"ـە. پێموایە لێرەدا مەبەستی ئاشتییە چونکە لەگەڵ شیعری جەنگدا بەراوری دەکات.

١٢- لێکدانەوەی زانستیانەی ئەدەبی کوردی بە هەموو جۆرەکانییەوە و بەرهەمی شاعیرانی کوردی سەدەکانی رابردوو دەتوانێ گەلێ لایەنی مێژووی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری کوردمان بۆ روون بکاتەوە. لەم بوارەدا تەنها بەرهەمی چەند شاعیرێکی کورد کە بە پەنجەی دەست دەژمێررێن، وەکوو ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی ونالی و مەحوی و پیرەمێرد و گۆران و چەند شاعیرێکی تر خراونەتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە و وتار و باس و نامەی دکتۆرایان لەسەر نووسراوە. بەداخەوە هێشتا بەرهەمی زۆربەی شاعیرانی کورد چاوەڕوانی لێکۆڵینەوەی قووڵ و هەمە لایەنەن.

١٣- لە راستیدا پێش شەڕی یەکەمی جیهانیی و بە تایبەتی لە "بەهاری کورتی ئازادی" دا دوای شۆڕشی تورکە لاوەکان لە ساڵی ١٩٠٨دا هەندێ نووسین بە کوردی لە رۆژنامەکانی "کورد" و "پەیمان" و گۆڤارەکانی "رۆژی کورد" و "هەتاوی کورد" و "یەکبوون" بلاوکرانەوە. مخابن لەگەڵ گڕگرتنی ئاگری ئەوشەڕەدا هەموو رێکخراوە کوردییەکان لە کار کەوتن، چونکە زۆربەی هەرەزۆری خوێنەوارانی کورد راپێچران بۆ بەرەکانی جەنگ و رۆژنامە و گۆڤارەکانیش تاوەکوو کۆتایی ئەو شەڕە پەکیان کەوت و نەکەوتنەوە کار.

١٤- به داخەوە ئەم بارە واتە پێشخستنی بەرژەوەندی خێڵ و هۆزو بنەماڵە و عێڵ و ناوچە وهەوڵی جێ بە جێکردنی فەرمانی ئاغا و سەرۆك و هۆز و دەرەبەگی کورد لەلایەن ئەندامانی هۆز و خێڵەوە بێ یەك و دوو تاوەکوو ئەورۆش لە گەلێ ناوچەی کوردستاندا هەر بەردەوامە و زیانێکی زۆر دەگەیەنێ بە بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوایەتی کورد و کێشەی زۆر لەبەردەم پرۆسەی چەسپاندنی یەکێتی نەتەوەیی کوردا دروست دەکات. ئەمەش بەرهەمی دوو پرۆسەی بە یەکەوە گرێدراون. لە لایەکەوە سیاسەتی داگیرکەران کە هەموو هەوڵێك دەدەن کورد لەو بارەدا بهێڵنەوە و لەم بوارەدا هەرچیان لە دەست بێت دەیکەن بۆ رێگە گرتن لە بڵاوبوونەوەی خوێندەواری وپێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی کە دەبنە هۆی هەڵتەکاندنی بنخانی سترکتووری خێڵایەتیو پەرەسەندنی بیری نەتەوەیی و گەشەکردنی پرۆسەی یەکێتی نەتەوەیی کورد.

دەوڵەتانی داگیرکەر هەمیشە هەوڵیان داوە ئەو پێکهاتەیە بە هێز بکەن و هەستی خێڵێتی وناوچەگەری لەنێو هۆزە کوردییەکاندا جۆش بدەن و بیانکەن بەگژ یەکدا، تەنانەت ئەو رژیمانەی کە لاف نوێکردنەوەو راماڵینی سیستەمی خێڵایەتی و دەرەبەگایەتیان لێدەدا، لە کوردستاندا بە پێچەوانەوە هەلس و کەوتیان دەکرد و هەمیشە ئاغاو سەرۆك هۆز و دەرەبەگی کوردیان بە هێز کردووەو لە دژی بزاڤی رزگاریخوازی کوردیان بە کار هێناون. سەیر و سەمەرە لەوەدایە کە پارتە سیاسییەکانی کوردستانیش نەك هەوڵی لەنێوبردنی ئەم سیستەمەیان نەداوە بەڵکوو بە مەبەست یا بە ناچاری هەمیشە بوونەتە

هۆی بە هێزکردنی دەسەڵاتی سەرۆك هۆز وئاغا و دەرەبەگی کورد و هیچ کاتێ نەیانتوانیووە هۆز لە چوارچێوەی پارتدا بتاوێننەوە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە گەلێ جار هۆزەکان پارتە سیاسییەکان لە چوارچێوەی بەرژەوەندی خۆیاندا لە قاڵب دەدەن. لە هەموو ئەمانە سەیرتر باری رۆشنبیرانی کوردە کە بە توندترین شێوە رەخنە لە بیری خێڵایەتی دەگرن و بانگەشە بۆ بیری کوردایەتی و کوردستانێتی دەکەن بەڵام ئامادەنین دەست لەنێوی هۆز و خێڵ و عێڵ و بنەماڵە هەڵگرن کە نێوەکانی خۆیانی پێ دەڕازێننەوە. لە کۆتایی سەدەی بیستەمیندا هەموویان شوێنەوار و بەرهەم و ئەنجامە وێرانکەرەکانی ئەم سیاسەتە بە چاوی خۆمان دەبینین.

١٥- بابەتی رۆڵ و شوێنی ژنی کورد لە کۆمەڵی کوردەواریدا پێویستیان بە لێکۆڵینەوەی زانستیی قووڵ و هەمە لایەنە هەیە.گەلێ جار ئەم مەسەلەیە وا لە یەك دەدرێتەوە گوایە ژنی کرود لە ژنانی گەلانی دراوسێ ئازاد و سەرفراز ترە و پلە وپایەی لە کۆمەڵی کوردەواریدا بەرزترە.

پێم وایە ئەمە تەنها لایەنێکی مەسەلەکە دەخاتە روو. ئەمە زیاتر و لە بنەڕەتدا بۆچوونی گەریدە بیانییەکان بووە کە هاتوونەتە کوردستان. لە کوردستاندا زیاتر لەگەڵ کوردی کۆچەر و گوندا تێکەڵاو بوونە و ئەوەیان بینیوە کە ئافرەتی کورد بەشدرای لە ئیش وکاری رۆژانەدا دەکات و لە کاتی نەبوونی پیاواندا هەموو ئەرکەکان دەگرێتە ئەستۆی خۆی.من پێم وایە لای هەموو کۆچەرانی رۆژهەلات ژنان هەمان رۆڵیان بینییوەو، ئافرەتانی گوندەکانیش ئەرکەکانیان و

شێوەی ژیانیان لە ژنانی شار جیاواز بوونە، واتە مەسەلەکە پەیوەندی بە جۆری ژیانەوە هەیە. ژنی کورد لە شارەکانی کوردستان و دەرەوەی کوردستانیشدا بە هەمان شێوەی ژنانی رۆژهەلات هەڵس و کەوت دەکات. لێرەدا هەڵبەتە ناتوانین نێوچەی دابڕاو لە جیهان بکەین بە نموونە و دیتن و بۆچوونی لەسەر بنیات بنەین. ئەوەی دەڵێ ژنی کورد لە بارێکی باشتر لە ژنانی گەلانی دراوسێ دەژێ و رۆڵ و پلەوپایەی بەرزترە، با قڕکردنی ژنانمان لە کوردستانی "ئازاد"دا لە کۆتایی سەدەی بیستەمیندا بۆ روون بکاتەوە.

١٦- کۆمەڵەی یەکێتی و پێشکەوتن (ئیتیحاد و تەرەقی) لە ساڵی ١٨٨٩دا لەلایەن پێنج خوێندکارەوە کە دوانیان کورد بوون، عەبدوڵا جەودەت و ئیسحاق سکووتی، دامەزرا. دامەزرێنەرانی نێوی کۆمەڵەی یەکێتی ئۆسمانی (اتحاد عوسمانی جمعیتی)یان لێنا. لە دواییدا نێوەکەی گۆڕا و بوو بە کۆمەڵەی یەکێتی و پێشکەوتن. دوای خەباتێکی زۆر، زیاتر لە دەرەوەی وڵات ئەو کۆمەڵەیە لە ساڵی ١٩٠٨ دەسەڵاتی لە دەوڵەتی ئۆسمانیدا گرتە دەست و لەساڵی ١٩٠٩ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمینی لابرد. دوای ئەوەی تورکە شۆڤێنیشتەکان دەستیان گرت بەسەر رێکخراوەکەدا و سیاسەتی بە تورك کردنی گەلانی دەوڵەتی ئۆسمانیان گرتە بەر، دامەزرێنەرانی و نوێنەرانی ئەو گەلانە لێی دوور کەوتنەوە و بوون بە نەیاری ئەو کۆمەڵەیە. بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی کۆمەڵەی یەکێتی و پێشکەوتنەوە رۆڵی رۆشنبیرانی کورد لە دامەزراندنیا بڕوانە. دوکتۆر جەبار قادر، رووناکبیری کورد دوکتۆر عەبدوڵا جەودەت ١٨٦٩ ـ ١٩٣٢، گۆڤاری. کاروان. ژمارە. ٣٧. هەولێر ١٩٨٥، ل ٤ـ ١٢.

١٧- هەندێ لە نووسەران و رۆژهەڵاتناسانی رووس زاراوەی "کوردە لاوەکان"یان بەکار هێناوە کاتێ باسی ئەندامانی بزووتنەوەی رۆشنبیری وسیاسی کورد لەسەردەمی عەبدولحەمید و تورکە لاوەکاندا دەکەن. بۆ نموونە بڕوانە: ڤ. ئە. گەردلێڤکی، بەرهەمە هەڵبژاردەکان، بەرگی سێیەمین، مۆسکۆ ١٩٦٢، ل ١٢. بە زمانی رووسی.

١٨- ئەمە بۆچوونێکی نابەجێیە دەربارەی پەیدابوونی بزووتنەوەی نەتەوەیی بەگشتی وبزاڤی ئازادیخوازی گەلی کورد بەتایبەتی، چونکە لەکاتی بڵاوکردنەوەی باسەکەی لاهووتیدا بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد تەمەنی بە هیچ شێوەیەك لە نیو سەدە کەمتر نەبوو. ئەگەر راپەڕین و سەرهەڵدانەکانی میراشی بابان و سۆران و بۆتان .....هتد بابەتی بیرو بۆچوونی جیاوازبن لەنێوان رۆژهەڵاتناسانو نووسەرانی کوردا، خۆ هەموو لەسەر ئەوبۆچوونە هاوبیرن کە بزووتنەوەی شێخ عوبەیدوڵای نەهری بزاڤێکی رزگاریخوازی گەلی کوردە وئینگلیز و هێزە بیانییەکان نەك تەنها رۆڵیان لە دروستکردن و بەرپابوونیدا نەبوە، بەڵکوو هەموو یارمەتییەکان بە دەوڵەتی داگیرکەر پێشکەش کردووە بۆ ئەوەی ئەو بزووتنەوەیە سەرکوت بکەن و دژی داخوازەکانی کورد بووەستن.

بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی سەردەمەکانی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بڕوانە: م. س. لازارێڤ، هەمان سەرچاوەی نێوبراو، ل ٣ ـ ٦.

١٩- دوای تورکە لاوەکان دەسەڵاتدارانی کەمالییش هەمان رێبازیان گرتە بەر. دوای ئەوەش بە شەست ساڵ رژێمی بەعس لە عێراق تەنها ئەندامانی بەعس وپیاوانی دەزگا سەرکوتگەرەکانی خۆی

وەردەگرت لە خانەی مامۆستایان و کۆلێجی پەروەردە و ئەکادیمیای هونەرەجوانەکان و کۆلیجەکانی وەرزش و سەربازی و پۆلیس و دەیان دەزگا و فێرگەی تر، کە دەرگاکانیان بە تایبەتی لەبەردەم رۆڵەکانی گەلی کوردا داخرابوون. تەنانەت لەم ساڵانەی دواییدا لەبەشی زمانی کوردی ئەوەی، بە وتەی خەڵکی لای خۆمان "حەبە سەوزەکەی قووت نەدایە" وەرنەدەگیرا. رژێمی بەعسی سووریاش لەم بوارەدا پێشینەیەکی پڕ لە شەرمەزاری هەیە کاتێ لە شەستەکاندا کەوتە پەیڕەوکردنی سیاسەتی "پشتێنی عەرەبی" و بێبەریکردنی کوردی سووریا لە هەموو مافەکانی مرۆڤ. رژێمی ئێرانیش لە سەردەمی شا و کۆماری ئیسلامیشدا لەو بوارەدا وەدوا نەکەوتوون و بە سەدان کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم پێشکەوتنی کوردا قوت دەکەنەوەو هەمیشە هەوڵ دەدەن کورد لە سێبەری نەخوێندەواری و هەژاری و نەخۆشیدا بمێنێتەوە.

٢٠- لە راستیدا مەسەلەکە بە پێچەوانەوە بوو، چونکە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لەرۆژانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا تووشی سستی و لاوازیی هاتبوو. زۆربەی هەرە زۆری ئەندامە چالاکەکانی کۆمەڵە و رێکخراوە کوردییەکان رەوانەی بەرەکانی شەڕ کرابوون و دروشمی شەڕی پیرۆزیش (جیهاد) کە سوڵتانی ئۆسمانی جاڕی بۆ دابوو سەری لەسەرکردەو سیاسەتمەدارە کوردەکان شێواندبوو و رق و کینەی جەماوەرانی کوردی بە لایەکی تردا ئاراستە کردبوو. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی بزاڤی نەتەوەیی کورد لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانیدا بڕوانە: دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد،

کورستان له ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٥.

٢١- لەم دواییەدا دوای سەرکەوتنی کەمالییەکان بەسەر یۆنانییەکاندا "تورك ئوجاغی" سەر لە نوێ چالاکییەکانی لە ئەنادۆڵ و ئەستەموولّدا دەست پێکردەوە.(و. ر)

٢٢- کۆمەڵەی پێشخستنی کوردستان (کوردستان تعالی جمعیەتی) لە ١٧ی دیسەمبەری ١٩١٨ دا لە شاری ئەستەمووڵ لەلایەن سیاسەتمەدارە نێودارەکانی کوردی ئەو سەردەمەوە دامەزرا. شێخ عەبدولقادری نەهری کوڕی شێخ عوبەیدوڵا سەرۆکایەتی ئەو کۆمەڵەیەی دەکرد و نێودارانی وەکوو ئەمین عالی بەدرخان و جەنەڕاڵ فوئاد پاشای برای جەنەڕاڵ شەریف پاشای بەنێوبانگ و حەمدی پاشا و شوکری بابان و گەلێکی تر لە دامەزرێنەرانی ئەو کۆمەڵەیە بوون. نووسەری کوردی هێژا کاك ئیسماعیل گوێلداش کتێبێکی باشی لەسەر ئەم کۆمەڵەیە نووسیوە و گەلێ لایەنی نەزانراوی ئەم بابەتەی بە بەڵگەی مێژووییەوە روون کردۆتەوە. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم کۆمەڵەیە و چالاکییەکانی و ئەندامەکانی بڕوانە ئەوکتێبەی کاك ئیسماعیل گوێلداش:

Ismail Goldas, Kurdistan Teali Cemiyeti, Istanbul.1991.

٢٣- کۆمەڵەی ئازادیی کوردستان (استقلال کوردستان جمعیەتی) لە کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانیدا لە قاهیرە لەلایەن سووڕەیا بەدرخانەوە دامەزراوە و زۆربەی ئەندامانی ئەو ئەفسەرە کوردانە بوون کە لەلایەن سوپای ئینگلیزەوە لەو شەڕەدا بە دیل گیرا بوون.

سەرچاوەکان باسی ئەوەمان بۆ دەکەن کە کۆمەڵەی ئازادی کوردستانیش داوای لە شەریف پاشا کرد دۆزی کورد بخاتە بەردەم کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس.

٢٤- لە راستیدا "ژین" زیاتر لە گۆڤار دەچیٚ هەرچەندە لەسەری نووسراوە رۆژنامەی حەفتانەیە (هفتەلق غزتە). یەکەمین ژمارەی لە ٧ تشرینی دووەمینی ١٣٣٤ رومی واتە ١٩١٨ زاینیدا و دوا ژمارەی واتە ژمارە (٢٥) لە ٢ تشرینی یەکەمی ١٣٣٥ رۆمی واتە ١٩١٩ زاینیی لە شاری ئەستەموولٚ بلاٌوکراوەتەوە. مامۆستای هیٚژا محەممەد ئەمین بۆزئەرسەلاٌن هەموو ژمارەکانی کۆکردەوە و لەگەلٚ تیٚتینی و پیٚشکەکییەکی فراواندا لە پیٚینج بەرگی قەشەنگدا لە شاری ئوپسالەی سوید بە چاپی گەیاند و بەوشیٚوەیە لە فەوتان رزگاری کرد. کاری راست بیٚ کاتی خۆی ئەرکی کیٚشاو هەر پیٚنج بەرگەکەی بۆ ناردم بۆ زانکۆی مووسلٚ. بڕوانە:

Jin kovara kurdi Tirki, 1918. Cildl v., Uppsala.1985.

٢٥- گۆڤاری "کوردستان"یش هەر لە ئەستەموولٚ بلاٌوکراوەتەوە و یەکەمین ژمارەی لە ٣١ کانوونی دووەمی ١٩١٩ دەرچوە. تاوەکوو ئیٚستا نازانریٚ چەند ژمارەی لیٚ دەرچوە. نووسەرانی جیاواز تاوەکوو ژمارە ١٩ یان بینییوە. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی رۆژنامەگەری کوردییەوە لە باکووری کوردستان و تورکیا بەگشتی و بۆ ئاگاداری زیاتر لەبارەی هەفتەنامەی "کوردستان"ەوە بە تایبەتی بڕوانە:

Malmisanij, Mahmud Lewendi, Li kurdistana Bakur u Li Tirkiya Rojnamegeriya kurdi (1908-1992) ikinci Basim, Ankara 1992. Rr 76. 80.

٢٦- له راستیدا مێجەر سۆن لەو گەشتەیدا لەژێر نێوی بازرگانێکی فارسدا میرزا غولام حسێنی شیرازی سیخوری کردووه نەك بە نێوی حاجی عەلی شیرازیەوه وەکوو لاهووتی لێرەدا دەڵێ. لازاریێف بە زاناترین و ئاگادارترین جاسوسی ئینگلیز لە بارەی کوردەوه لە قەڵەمی دەدا. سۆن لە ١٦ی ئابی ١٨٨١ هاتۆتە دونیاوه و لە تەمەنی ٢١ ساڵیدا سەری ئێرانی داوه. فارسییەکی باشی زانیوه و لە ساڵی ١٩٠۶ کرا بە بەڕێوەبەری لقی بانکی شاهانی ئێران لە کرماشان ولەوێ خۆی فێری کوردی کرد.لە ساڵی ١٩٠٧ دا گەشتێکی بە کوردستاندا کرد. بەرهەمی ئەو گەشتە کتێبەکەی بوو کە لە ساڵی ١٩١٢دا لە لەندەن بڵاوی کردەوه. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ئەوکتێبەی مێجەر سۆن.

E.B. Soane, To Mesopotamia and Kurdistan in Disguise, with Historical Notices of the Kurdish Tribes the Chaldeans of kurdistan. London. 1912.

بەشێکی گرنگی ئەم کتێبەی مێجەر سۆن لەلایەن زانای رووسەوه نیکیتین کە ئەوکاتە قونسوڵی رووسیا بوو لە ورمێ کرا بە رووسی و هەر لە ورمێ بڵاو کرایەوه بڕوانە. ئی. ب. سۆن، دەربارەی کورد و وڵاتەکەیان، ڤـ. پ. نیکیتین کردوویە بە رووسی وپەراوێز و تێبینی لەسەر نووسیوه. ارومیە. ١٩١٧. لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانیدا چەند ئەرکێك بە مێجەر سۆن لە باشووری کوردستاندا سپێردراوه و لە دوای شەڕیش رۆڵێکی گەورەی لە چارەنووسی ئەو بەشەی کوردستان بینی و گەلێ نووسین و لێکۆڵینەوەی لەسەر کوردستان بە ئینگلیزی بڵاوکردۆتەوه و لە ساڵی ١٩٢٣ کۆچی دوایی کردووه. بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی چالاکیی مێجەر

سۆنەوە لە کوردستاندا و رۆڵی لەسەرکوتکردنی بزاڤی ئازادیخوازی باشووری کوردستاندا بڕوانە:

کەمال مەزهەر ئەحمەد، بزاڤی ئازادیخوازی نەتەوەیی لە کوردستانی عێراق (١٩١٨، ١٩٣٢)، باکۆ ١٩٦٧، بە زمانی رووسی.

محەممەد رەسووڵ هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی یەکەم، لەندەن. ١٩٩٠ ل ٤٥٤ ـ ٤٧٧.

٢٧- ساڵنامەکانی دەوڵەتی ئۆسمانی چ ئەوانەی لە ئەستەمووڵ تۆمار دەکران و چ ئەوانەشی لە ویلایەتەکانی دیاربەکر و مووسڵ و وان...هتد بڵاودەکرانەوە گەلێ بە کەڵکن بۆ بەراوردکردنی نێوی ئەورۆی شار و شارۆچکە و نێوچەکانی کوردستان لەگەڵ ئەو نێوانەی کە لەسەردەمی ئۆسمانیدا باوە بوونە. تەنها بۆ نموونە هەڵەبجە (گوڵعەنبەر) بووەو قەڵادزە (مەعمورە الحەمید) و دوای لابردنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمینیش لە ساڵی ١٩٠٩دا تەنها بە (مەعموورە)نێوی براوە. کفری (سلاحیە) و ئەلازیگ یا ئەلیازگ (معمورە العزیز) بوونە و گەلێکی تر لەم بابەتە. لەکاتی خۆیدا بۆ روونکردنەوەی باری هەولێر لە نیوەی دووەمی سەدەی رابردوودا پەنام بردە بەر ساڵنامەکانی دەوڵەتی ئۆسمانی و گەلێ زانیاری بەکەڵکم لێ وەدەست هێنان. بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە:

الدكتور جبار قادر، أربيل في السالنامات العثمانية، بحث مقدم الى ندوة — أربيل بين الماضي والحاضر والآفاق المستقبلية، مجلة كاروان، العدد ٩١، اربيل ١٩٩٠، ص١١٦-١٢٧.

٢٨- راستییەکەی رۆژنامەکە نێوی "تێگەیشتنی راستی"یە و مێژووزان و زانای کورد پرۆفیسۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد دوای کار و

هەوڵێکی زۆر بەرهەمێکی زانستیی لەسەر ئەو رۆژنامەیە نووسی و لە کتێبێکی نایابدا بڵاوی کردەوە. بڕوانە: دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامەگەری کوردیدا، بەغدا ١٩٧٨. لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ هەندێ لەو هەوڵانە بکەم کە لەکاتی خۆیدا گەرەکیان بوو گومان بخەنە سەر هەندێ لە بەرهەم و کارە زانستیەکانی دوکتۆر کەمال مەزهەر، کە لە سی ساڵی رابردوودا زیاتر لە بیست کتێبی بە نرخ وسەدان وتار و لێکۆڵینەوەی زانستیی لە بواری مێژووی کورد و رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا لە کوردی و عەرەبی و رووسی پێشکەش بە خوێنەران کردووە. پەیوەندی من بە دوکتۆر کەمال مەزهەرەوە لە ساڵی حەفتاوە دەستی پێکرد کاتێ لە بەشی مێژووی زانکۆی بەغدا من خوێندکار و ئەو مامۆستا بوو و دەمبینی هەموو قوتابیان چەند بە پەرۆشن بۆ دەرسە پڕ لە تام و چێژ و زانیارییەکانی ئەو مامۆستا بەڕێزە.دوا بە دوای ئەوەخوێنەرێکی هەمیشەیی بەرهەمەکانی ئەو پیاوە زانایە بووم. بە دەیان مرۆڤ لەژێر دەستی ئەوبڕوانامەی دوکتۆرا و ماستەریان وەرگرت و لەنێو رۆژهەڵاتناسان و کوردناسانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران و رووسیای ئەو رۆشدا هەمیشە ئاماژە بۆ بەرهەمەکانی دوکتۆر کەمال مەزهەر وەکوو سەرچاوەیەکی رەسەنی مێژووی هاوچەرخی باشووری کوردستان دەکەن. دوکتۆر نامەی دوکتۆرا نامەکەی بە تەنیا نزیکەی هەزار لاپەڕەی پڕ لە زانیاری و راڤەکردن و لێکدانەوەیە دەربارەی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە باشووری کوردستاندا لە ساڵانی ١٩١٨ تاوەکوو ١٩٥٨. کابرایەك بە نێوی دوکتۆر محەمەد محەمەد ساڵح کە زیاتر لە سی ساڵ لە زانکۆی بەغدا مامۆستای مێژوو بووە و یەك وشەی لەسەر مێژووی کورد بڵاونەکردۆتەوە

و چەند کتێبێکی زلی لەبارەی مێژووی ئەورووپاوە نووسیوە، کە بە راستی لە گواستنەوەی زانیاری لە چەند سەرچاوەیەکی ئەورووپی بەولاوە هیچ وردەکارییەکی تێدا نیە، بە نەزانی و بە فیتی هەندێ لە نەیارانی دوکتۆر کەمال مەزهەر، هەر لەبەر ئەوەی کەمال مەزهەر پێش هەموویان بە رەنج و کۆششی خۆی و بە راستی، بوو بە پرۆفیسۆر نەك وەکوو لەنێو هەندێ کوردا بووە بە باو نێوی دوکتۆر و پرۆفیسۆر و رۆشنبیر لە خۆ بنرێ، وتارێکی لە رۆژنامەی عێراقدا بڵاوکردەوە و تێیدا نووسیبووی کە گوایە دوکتۆر کەمال مەزهەر بۆ ئامادە کردنی کتێبی "کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا" گەلێ زانیاری لە نامەی ماستەری کابرایەك بە نێوی ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد لە بارەی ویلایەتی مووسڵەوە وەرگرتوە و ئاماژەی بۆ نە کردووە.

ئەو درۆیە زوو ئاشکرا بوو چونکە کاتێ دوکتۆر کەمال ئەو زانیاریانەی بۆ دوکتۆر نامەکەی لەسەرەتای شەستەکاندا کۆ کردبووە و زۆری لە نامەی دوکتۆراکەی و دوکتۆرای ناوکەکەی و کتێبەکەی کەبە زمانی رووسی لە ساڵی ١٩٦٧ لە باکۆ بڵاوکرایەوە تۆمار کردبوو، ئەو برایم خەلیل ئەحمە دە قوتابی قوتابخانەی ناوەندی بووە لە مووسڵ بە وتەی خۆی و بە ئامادەبوونی چەند مامۆستایەکی بەشی مێژوو لە زانکۆی مووسڵ هەروەها دوکتۆر کەمال مەزهەر دوو سێ بەشی ئەو کتێبەی لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردا پێش ئەوەی ئەو برایە نامەی ماستەر ئامادە بکات بڵاوکردبووەوە. تەنها بۆ وەرگێرانە عەرەبییەکەی کتێبی کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا وەرگێڕ مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم و هەڵبەتە بە زانیاری و ئاگاداری دوکتۆر کەمال مەزهەر ئاماژەی بۆ ئەو

نامەی ماستەری برایم خەلیل کردبوو، چونکە دوکتۆر کەمال مەزهەر بۆ یەك دوو پەراوێز کەڵکی لەو نامەیە وەرگرتبووەو وەکوو مرۆڤێکی زانستپەروەر و دەست پاك ڕێگەی بە خۆی نەدابوو بیکاتە ژێر سمێڵەوە، وەکوو بە داخەوە لای هەندێ نووسەر بووە بە باو. جا چونکەدوکتۆر محەمەد محەممەد ساڵح و گەلێ لە وانەی فیتیان دابوو کوردی ناخوێننەوە، ئاگایان لەو هەموو ڕاستیانە نەبوو و کەوتنە تەڵەوە و ڕاستیی و دروستی دوکتۆر کەمال مەزهەریش کەلای خوێنەرانی جێگەی گومان نەبوو جارێکی تر دەرکەوت و تەنها ڕوو ڕەشی بۆ ئەوانە مایەوە کە هەوڵیان دەدا بە هەستێکی نەخۆشەوە لوتکەیەکی ژیانی زانستیی و ڕۆشنبیری کورد تێکشکێنن. بە داخەوە ئەو جۆرە مرۆڤانە کەدڵیان پڕە لە ڕق و کینە بەرامبەر هەموو کەسێك لە هەوڵی خۆیان ناکەون بۆ ڕەشکردن و کاڵکردنەوەی وێنەی بریقەدار و لوتکەکانی ژیانی زانستیی و کولتووریمان بۆ ئەوەی بە خەیاڵی خاوی خۆیان ئەو کاتە هەندێ تیشك بەر ئەمان بکەوێ و وێنەی ژەنگاوییان بریقەدار بێتەوە. تەنها مرۆڤی نەزان و بێ ئاگا لە ئەزموونەکانی مێژوو دەتوانێ وابیر بکاتەوە.

٢٩- سەی تەها کوڕی شێخ محەممەد سدیقی کوڕی شێخ عوبەیدوڵای نەهریە. یەکێك لە سیاسەتمەدارەکانی کورد بووە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی و لە ڕووداوەکانی ئەو ساڵانەدا ڕۆڵێکی دیاری هەبوو. تێکەڵی لە گەڵ سمکۆدا بە هێز بوو و خوشکێکی هاوسەری سمکۆ بووە، هەمیشە هەوڵی داوە پەیوەندی سمکۆ بە ئینگلیزەکانەوە بە هێز بکات. سەی تەها دوژمنی باوەکوشتەی تورك بوو و هەوڵی دەدا بەرەیەکی دژ بە تورك لەسەرکردە و سیاسەتمەداری کورد سازبکا و بە پشتگیری ئینگلیز لە دژی

تورك راوەستن. پەیوەندییەکانی بە شێخ عەبدولقادری مامی و کورەکانیەوە خراپ بوون و هەمیشە دژ بە یەك لە ململانێدا بوون. هەروەها پەیوەندییەکانی لەگەڵ شێخ مەحموودا باش نەبوون. بە تایبەتی کاتێ پەیوەندییەکانی شێخ مەحموود و کەمالییەکان گەرم بوون و ئۆزدەمیر خەریکی چالاکی بوو لەنێوچەی رەواندزدا.

٣٠- شێخ عەبدولقادر کوڕی بچووکی شێخ عوبەیدوڵای نەهرییە نەك کوڕەزای و لە ساڵی ١٨٥١ لە شەمدینان هاتۆتە دونیاوە. لە کاتی راپەڕینی ساڵی ١٨٨٠ دا کە بەسەرۆکایەتی باوکی بوو شێخ عەبدولقادر رۆڵێکی گەورەی لەبەرەی هەکاریدا هەبوو. دوای دامرکاندنەوەی راپەڕینەکە لەگەڵ باوکیا دوورخرایەوە بۆ مەککە ودوای شۆڕشی تورکەلاوەکان لە ساڵی ١٩٠٨ دا گەڕایەوە بۆ ئەستەموول و گەلێ پلەو پایەی بڵندی لە دەزگاکانی دەوڵەتدا وەدەست هێنا. ماوەیەك سەرۆکی شورای دەوڵەت بوو کە لەکاتی خۆیدا باوکی شەریف پاشا سەعید پاشای خەندان (سەعیدە قەلە و یا کورد سەعید پاشا) هەتا کۆچی دوایی کرد لە ساڵی ١٩٠٧دا سەرۆکی بوو. هەروەها ئەندامی ئەنجومەنی سیناتی (ئەعیانی) دەوڵەتی ئۆسمانی بوو. وەکوو دەزانرێ ئەنجومەنی ئۆسمانی کە بۆ یەکەمین جار لە ساڵی١٨٧٦ دا کۆبووەوە دوای شۆڕشی ساڵی ١٩٠٨ بۆ دووەمین جار لە مێژووی دەوڵەتی ئۆسمانیدا کۆبووەوە، لە دوو ئەنجومەن پێکدەهات: ئەنجومەنی نوێنەران (مەجلیسی مەبعووسان) و ئەنجومەنی پیاوماقووڵان یا پیران (مجلسی اعیان). شێخ عەبدولقادر لەنێو کوردا خاوەن پلە و پایەیەکی مەزن بوو، بە تایبەتی بە یەکێك لە رێبەرانی نەقشبەندی لەقەڵەم دەدرا. دوای شەڕی یەکەمی جیهانی بەسەرۆکی کۆمەڵەی پێشخستنی کوردستان

(کوردستان تعالی جمعیەتی) هەڵبژێردرا و لە ساڵی ۱۹۲۵دا لەلایەن کەمالییەکانەوە لەسێدارە درا. بڕوانە:

Ismail Goldas . a. g.e. ss 16 22

٣١- سمایل ئاغای شکاك (سمکۆ) کوڕی محەممەد پاشای کوڕی عەلی خانی شکاکە. باپیری سمکۆ عەلی خان لە پێناوی شای قاجاردا دژی سەرهەڵدانی شێخ عوبەیدوڵا دەوەستێ و لە تێکشکانی ئەو سەرهەڵدانەدا ڕۆڵ دەبینی. لەگەڵ ئەوەشدا لە دواییدا نێوانی لەگەڵ دەوڵەتی ئۆسمانی تێکدەچێ و لە دژی ڕادەپەڕێ و پەنا دەباتە بەر دەوڵەتی ئۆسمانی کە دەیگرێ و دەیداتەوە بە دەستی شاوە. بە گوێرەی هەندێ سەرچاوە لەژێر ئەشکەنجەدا ژیانی لە دەست دەدات. باوکی سمکۆش بە دوور خراوەیی لە دوورگەی ڕۆدوس سەر دەنێتەوەو جافەر ئاغای برای بە شێوەیەکی دڕندانە لەلایەن والی ئازەربایجانەوە دەکوژرێ. ئەم ڕووداوانە وایان لە سمکۆ کرد (سەرچاوەکان ساڵی جیاواز بە ساڵی لە دایکبوونی لە قەڵەم دەدەن. ۱۸۷۵ و ۱۸۸٤و ۱۸۸۹- هتد) ببێ بە دوژمنی باوەکوشتەی دەوڵەتی ئێران.بۆ ماوەی دوازدە ساڵ سەرۆکایەتی هۆزی شکاکی کرد و لە دژی دەوڵەتی ئێران لە دوا ساڵەکانی دەسەڵاتی قاجاری و پێنج ساڵی یەکەمی دەسەڵاتی ڕەزا شای پەهلەویدا سەری هەڵدا. لە ساڵی ۱۹۳۰ بە فێڵ کوژرا.

بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی سمکۆ و بزووتنەوەکانیەوە بڕوانە: محمد رسول هاوار، سمکۆ (ئیسماعیل ئاغای شوکاك) و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد، چاپخانەی ئاپێك، ستۆکهۆڵم. ۱۹۹٥.

٣٢- مەبەستی لاهووتی لێرەدا باکووری کوردستانی ئێرانە واتە ئەو ناوچەیەی هۆزی شکاکی لێ دەژێن. ئەوڕۆ کورد گەلێ زاراوە بۆ پێناسەکردنی بەشەکانی کوردستان بەکار دێنن، کە زۆربەی هەرەزۆری

لەگەڵ راستییەکانی جوگرافیای کوردستاندا یەك ناگرنەوە. تەنها بۆ نموونە باشووری کوردستان دەبێ کرماشان و لوڕستان و خانەقین و گەرمیان بگرێتەوە نەك هەموو کوردستانی ژێر دەستی عیراق. هەروەها خۆی و ماکۆ و ورمێ و شەڵماش و ئەمانە باکووری کوردستانن نەك رۆژهەڵات و هەمان شتیش دەتوانین لە بارەی نێوچەکانی رۆژئاوای کوردستانەوە بڵێین. کاتێ مرۆڤ باکوور و باشوور و رۆژهەڵات و رۆژئاوای کوردستان دیاری دەکات دەبێ لەسەر بناغەی کارتی کوردستان بە خۆی ئەو کارە بکات نەك لەسەر بنگەی ئەو سنوورانەی کوردستانیان پارچە پارچە کردووە.

٣٣- لێرەدا لاهووتی کەوتووتە چەند هەڵەیەکەوە، ئەوەی روون و ئاشکرایە شێخ مەحموود کوڕی شێخ سەعیدی کوڕی محەممەد بچکۆڵی کوڕی کاك ئەحمەدی شێخە. واتە کوڕی کوڕەزای کاك ئەحمەدی شێخە و باوکیشی شێخ سەعیدە نەك سەی رەسووڵ. بنەماڵەی شێخانی بەرزنجە پلەو پایەیەکی مەزنیان لەنێو کوردا هەبوەو سوڵتانی ئۆسمانی رێزێکی تایبەتی لێگرتوون. بۆ نموونە شێخ مەحموود لەگەڵ باوکیا سەردانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمیان کردووە و بۆ ماوەی چوارده مانگی رەبەق لە کۆشکی یلدزا میوانی بوونە. لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوەو هەتا سییەکانی ئەم سەدەیە شێخ مەحموود لە باشووری کوردستان رۆڵێکی مەزنی گێڕاوە. شایانی باسیشە کە شارەزوور تاوەکوو سەدەی نۆزدەهەم ویلایەتێکی فراوانی دەوڵەتی ئۆسمانی بووە و ناوەندی ئەو ویلایەتەش شاری کەرکووك بووە.

٣٤- بەگوێرەی زانیارییەکانی مامۆستا هاوار، ژمارەی کوژراوان لە هەردوولا ٧٠ کەس بووەو ژمارەی بریندارانیش ١٠٠ کەس. ژمارەی پیاوەکانی شێخ سەعید کە لەم کارەساتەدا کوژراون ١٣ کەس بوون کە

شێخ سەعید و شێخ ئەحمەدی کوڕیشی تێدا بوون. شێخ مەحموود بریندار کرا. ئەو کاتە واتە لەسەرەتای ساڵی ١٩٠٩دا تەمەنی شێخ مەحموود بە ٢٦ یا ٢٧ دانراوە. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی کارەساتەکەی مووسڵ و ڕۆڵی شێخ مەحموود لە بزاڤی نەتەوەیی کوردا بڕوانە: م. ر: هاوار، شێخ مەحموودی قارەمان ...، ل ١٤٣. ١٧٤.

٣٥- ڕاستییەکەی شێخ مەحموود لە شەڕی شوعێبەدا لەبەرەی جەنگی عێراقدا لە دژی ئینگلیز شەڕی کردووە. لەناوچەکانی پێنجوین و مەریوانیش لە دژی سوپای رووسیا شەڕی کردووە. نەك لەبەرەی سوریا لە دژی سوپای فەرەنسا وەکوو لاهووتی دەڵێ. ٣٦. لێرەدا زنجیرەی ڕووداوەکان لە لای لاهووتی تێکدەچێ و تێکەڵ و پێکەڵ دەبێ، چونکە شێخ مەحموود دوای شەڕی بازیان لە ١٧ جوزەیرانی ١٩١٩ دەستگیر دەکرێ و لە بەغدا ئینگلیز فەرمانی خنکاندنی دەدەن، بەڵام فەرمانەکە دەگۆڕدری بە دە ساڵ زیندان و دوور خستنەوە بۆ هێندوستان. لە ساڵی ١٩٢٢ ناچار دەبن شێخ مەحموود بێننەوە بۆ سلێمانی و لە ٣٠ ئەیلوولی ئەو ساڵەدا گەیشتۆتە ئەو شارە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، بزووتنەوەی نەتەوەیی ... ل ١٠١.

٣٧- ئینگلیزەکان جارێکی تریش نێوی حوکمداریان لێ نا، بەڵام شێخ مەحموود نێوی مەلیکی کوردستان مەحموودی یەکەمی لە خۆی ناو لە نۆڤەمبەری ١٩٢٢دا کابینەی وەزیرانی پێکهێنا.

٣٨- ڕاستیەکەی شێخ مەحموود چووە سورداش و ئەشکەوتی جاسەنەی کردە بنکەی خۆی و لە دواییدا چوە دێی پیران کە نزیکەی سی کیلۆمەترە لە سنووری ئێرانەوە. هەر لەم کاتەدا بوو شێخ نامەی بۆ

نوێنەرانی دەوڵەتە ئەورووپاییەکان نارد و نارەزایی و تووڕەیی خۆی بەرامبەری بە سیاسەتی ئینگلیز لە کوردستاندا دەربڕی و داوای لێکردن پەیمانەکانی خۆیان بە جێ بێنن.

٣٩- هەر لەم کاتانەشدا بوو کەمالییەکان هەوڵیان دەدا بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە باشووری کوردستان لە دژی سیاسەتی ئینگلیز بە کار بێنن و بۆ ئەم مەبەستە پەیماننامەکیان لەگەڵ شێخ مەحموودا بەست کە تێیدا (دانیان بەسەربەخۆیی باشووری کوردستاندا بە ڕێبەرایەتی شێخ مەحموود دەنا و بەڵێنی ئەوەیان دەدا کە بە هیچ شێوەیەك دەست نەخەنە کاروباری نێوخۆی حکوومەتی شێخ مەحموودەوە لە سلێمانی. هەر لەو پەیماننامەدا باسی ئەوەش کرا بوو کە دەبێ ئەنجومەنی نوێنەران لەو شارەدابمەزرێ. تەنها لە کاتی شەڕدا حکوومەتی تورکیا دەتوانێ هێزە چەکدارەکانی کوردستان بە کار بێنێ). بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: کورد ئۆغلۆ، کورد و ئیمپریالیزم، بلوتێنی رۆژنامەگەری رۆژهەڵاتی نێوەڕاست، ژمارە ١٣ ـ ١٤، تاشقەند، ١٩٣٢. ل ٩٤ ـ ١١٨. (بە زمانی رووسی). کەمالییەکان ئەمەیان لە کاتێکدا دەکرد کە کەوتبوونە گیان سیاسەتمەدارانی کورد کە بۆ سەربەخۆیی کوردستان هەوڵیان دەدا. ئەم پەیوەندییەی شێخ مەحموود بە کەمالییەکانەوە هەڵەیەکی سیاسی کوشندە بوو و ئینگلیزییەکان قەت لە بیریان نەکرد.

٤٠- سەرچاوە ئینگلیزییەکان ژمارەی ئەو ئەفسەر و سەربازانە بە ٤٠٠ کەس دەقەبڵێنن. هۆی کۆبوونەوەیان لە دەوری سمکۆش لەوەدا بوو کە نەیاندەویست بدەنە پاڵ کەمالییەکان. (ئۆ. ژیگالینا، هەمان سەرچاوەی نێوبراو، ل ٥٢.

٤١- هەر لەوکاتەدا بە وتەی خاتوو ژیگالینا، لە گۆر زانیارییەکانی ئەرشیفەکانی یەکێتی سۆڤیەت، سمکۆ خۆی بە مەلیکی کوردستان راگەیاند و کابینەی وەزیرانی دامەزراند و یەکێك لەسەر کردە بە نێوبانگەکانی هۆزی شکاك و دەستە راستی خۆی هۆمەر خانی کرد بەسەرۆك وەزیران و وەزیری جەنگ. هەروەها دەستووری کوردستان ئامادە کراو حکوومەتی کوردستان هەوڵی دامەزراندنی پەیوەندی دیپلۆماتی لەگەڵ دەوڵەتاندا دەدا. بەڵام ئەو هەوڵانە بێ ئەنجام بوون. گۆڤاری کوردستان یش ئۆرگانی حکوومەتی کوردستان بوو بەڵام بەداخەوە خاوەن پینووس لە دەوری مەلیکی کوردستان لە چەك هەڵگران گەلی کەمتر بوون و تەنها یەك ژمارەی گۆڤارەکە بڵاوکرایەوە. (ئۆ. ژیگالینا، هەمان سەرچاوەی نێوبراو، ل ٥٥.)

٤٢- لێرەدا لاهووتی وینەی ژیانی سیاسی ئەو رۆژانەمان بۆ دەکێشی کاتێ لایەنگرانی موستەفا کەماڵ کە پیویستیان بە پشتگیری و یارمەتی کورد هەبوو، بە هەموو لایەکدا بەلێنیان دابەش دەکرد و پەیمانیان دەدا گوایە ئەوان ماف کورد دەدەن و لە تورکیادا تەنها کورد وتورك ماف قسەکردن و داخوازییان هەیە. هۆیەکانی ئەم کەین و بەینەش هەڵبەتە ئاشکران، چونکە کۆنفرانسی لۆزان هێشتا بە ئەنجام نەگەیشتبوو و کێشەکان و بە تایبەتی کێشەی ویلایەتی مووسڵ واتە باشووری کوردستان جێگەی پێشبڕکێ و ململانێی بوو لەنێوان ئینگلیز و کامالییەکاندا کە هەردوو لایان بەهەموو شێوەیەك هەوڵیان دەدا بازرگانیی بە داخوازییە رەواکانی گەلی کوردەوە بکەن. هەڵوێستی کورد بۆ هەردوو لایان گەلێ گرنگ بوو. کاتێ موستەفا کەماڵ و هاوڕێکانی بۆیان دەرکەوت کە باشووری کوردستانیان

دۆڕان و ناچار بوون دەستی لێبشۆن ئەوکاتە رووی راستەقینەی خۆیان بۆ کورد دەرخست و بێبەزییانە کەوتنە گیانی کوردی باکوور و سیاسەتی تواندنەوە و سەرکوتکردنیان گرتە بەر کە تاوەکوو ئەوڕۆش گەلی کورد لە باکووری کوردستان پێوەی دەتلێنەوە. لە هەمان کاتدا هەردوولایان بۆیان دەرکەوت کە گەمەکردن بە بزاڤی نەتەوەیی کورد یاریکردنە بە ئاگر و دەبێ خۆیانی لێ دوور بگرن. بۆیەکا کەوتنە بەستنی پەیماننامە و رێکەوتن و مۆرکردنی پرۆتۆکۆل دژی بزووتنەوەی نەتەوەیی ئازادیخوازی گەلی کورد و هەمیشە ئامادەبوون بچن بە دەنگی یەکەوە بۆ دامرکاندنەوەی بزاڤ و سەرهەڵدانەکانی کورد. بە دوور و درێژی لە بارەی هاوکاری دەوڵەتانی داگیرکەرەوە دژی گەلی کورد بڕوانە ئەو باسەی لە یەکەمین کۆنفرانسی جیهانیی مێژووی کوردا لە شاری لۆزان لە تەمووزی ١٩٩٥دا پێشکەشم کرد و دوایی لە گۆڤاری (رابوون)دا بە دوو ئەلقە بلاو کرایەوە. دوکتۆر جەبار قادر، هاوکاری دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان دژی گەلی کورد، گۆڤاری. رابوون. ژمارە ١٦ و ١٧ سوید ١٩٩٦.

سوپاس زۆرم بۆ کاك عومەر فارس کە ئەرکی کێشا و نووسینەکەی منی لە WP گۆرییە سەر Microsoft Word.

هەروەها دەبێ سوپاسی کاك "بێکەس" یش بکەم کە هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئەوەی ئەم نامیلکەیە بگاتە دەستی خوێنەری ئازیز.

# پاشکۆی سێهەم

## شیعرە کوردییەکانی لاهووتی

١. در جواب سلیمان خان زنگنه موسی نارنجی
٢. بۆ نەژاد کورد

### شیعری یەکەم:

### در جواب سلیمانخان زنگنه موسی نارنجی(١)

نوتق و کەلامەن،......

ئیفتیخار شەخس، نوتق و کەلامەن
کەلام، وەدیعەی حەیی عەللامەن
شێوەی خاسانەن، نە بەهر عامەن
کەلام، وەدیعەی جان ئەفەرینەن
کەلام، ئیلهام رۆحولئەمینەن
نە هەر کەلامێ نەغز و سەواوەن
کەلام بێحیکمەت، زایە و خراوەن

کەلام خەواس، غەیرلە عەوامەن
عەوام کەی قابیل نوتق و کەلامەن؟
مەردوم عەوام زەربولمەسەلەن
مەعنای "کەلئەنعام" بەل هەم ئەزەلەن
کەلام ئینسان بایەد مەتین بو
عاقل پەسند بو، حیکەمت قەرین بو
پەیغەمبەر کە تاج "لەولاک"ش بەردەن
وە کەلام ئیسبات نبووەت کەردەن
وە کەلام مووسا، نە فرعەون پیش بی
وە خەلق بیگانە، وە خودا خویش بی
کەلام بی باعیس ئیجاد بەشە
کەلام بی موعجیز پاك پەیغەمبەر
نەبی وەت: "فەخر مەکەم وە کەلام
کەلام ملووك، ملووکولکەلام"
خەلق کەلام کەرد چون حەیی سوبحان
ئی مەنسەب خاس، دا وە سولەیمان
رەسم سانییە ئیسمش بی پەیدا
"تنزل الاسما و من الاسما"
هاوار هەمسەران ! هەم دیوانە بیم
دیوانەی کەلام ئی فەرزانە بیم
لە نو چون تووتی نوتقم خامووش بی
شەکەرفشانی وێم فەرامووش بی

یە، کەلام نیەن، سیحر حەڵاڵەن
چەشمەی تەسنیمەن، ئاو زوڵاڵەن
ماشەڵڵا ژی نوتق سولەیمانیە
لەی ئاغاییە، لەی سوڵتانییە
لەی دوڕئەفشانی، لەی خوەش کەلامی
سەعدی سانی، سانی نیزامی
عەیب نیەن کە بی، بیابان نشین
نە فەخر لە مەکان و من المکین
ژەوبوونە سەحرا کەردەن وە یانە
تا بزانون گەنج ها لەو وەیرانە
"لاهووتی" بەس کە دوڕئەفشانی‌یە
مەدح و مەنقەبەت سولەیمانی‌یە

## شیعری دووهەم:
## بۆ نەژادی کورد (٢)

لە دەردا وەطەن جەرگم بریانەن
هەناسەم سەردەن دیدەم گریانەن
ژ کوورەی سینەم شەرار مەخیزۆ
لە کانی چاڤم خووناو مەڕیزۆ
توام بمرم لەم داخ و دەردا
لەم خوار و زاری، لەم بەردالّبەردا
ئێران نەژادان وە دووڕەنگ نەبوون
وەها موبتەلای عار و نەنگ نەبوون
هەیداد هەی بێداد، کورد بێدار نیەن
لە نەژاد خوە خەوەردار نیەن
فەلەك ئەرکانت ژ هەڤ جودا بوو
چەرخت چەنبەر بوو کاخت فەنا بوو
تا کەی بەنیکان جەفا مەکەری
تاکەی پەردەی بەخت پاکان مەدەڕی ؟
ئەم قەوم غەیوور چلۆن بێیار بوون
وەکوو ئەسیران زەلیل و زار بوون
ئێران شەهەنشای هەموو دنیا بی
حوکمش لە هەموو عالەم ڕەوا بی

عەدل و مەرحەمەت، لوتف و شەفەقەت
ئینساف و ئیحسان، دین و مرووەت
عیلم وشوجاعەت، قانوون و کەرەم
جوود و سەخاوەت، شمشیر و قەڵەم
وەفا و مەحەببەت، میهمان نەوازی
لە رووی حەقیقەت، نەکوو مەجازی
حیلم و حەوسەڵە، بەخشش وە ژێردەس
وەها کو راحەت مەژیا هەر کەس
راست و راستپەرەست، دوژمن درۆ
حەق و حەقشناس، حەقبین و حەقجۆ
زاڵم فەناکەر، درۆ ریسواکەر
دەرد مەزڵوومان وی عەدڵ دەواکەر
مەخسووسەن سفات ئەهل ئیران بۆ
قەت مەشهوور وە ناۋ وان دلیران بۆ
حەتاکو بیەن یەك دڵ و یەك جان
عالەمشان ئاوەرد وە ژێر فەرمان
ئاخر لە غەفڵەت، مەیل وەنیفاق بوون
لە بیدانیشی، بیئیتیفاق بوون
هەر کەس ژ غەفڵەت، ژ رێکی راکەرد
فەلەك جەمعشان ژ هەم جودا کەرد
لەورا کو نەما ئیتیفاقشان
بیە مایەی نەنگ ئەم نیفاقشان

له شەڕا عەرەب، لە زوڵما رومیان
گرتن بە زیللەت، کوللێك بوزورگان
ئێران هەمیشە میری مەکەردا
لە مەیدان شەڕ شیری مەکەردا
لەوڕا کو بەهەم ببوون بە دخواهان
ئەسیر بوون بە دەست هەنێك روباهان
وەکوو جسمێکا ژ هەم جودا بوو
بەندبەندش لەهەم، سیوا سیوا بوو
هەروەها ئێران موتەلاشی بوو
قیسمەت قیسمەت بوو، وە جیا واچوو
وەها زەلیل بین ئیران نەژادان
کورد و لوڕ و فارس نیکو نیهادان
کو نەسل خوەیان فەراموش کەردەن
لە جەهلا حەڕف دوژمن گوش کەردەن
ئێران بە مەسەل وەکوو جیسما بوو
کورد و لوڕ و فارس، لە وی ئەعزا بوو
ئەگەر ژ بەدەن ئەعزا جودا بوو
ئەڵبەت ئەو بەدەن مەحو و فەنا بوو
مەخسووسەن کوردان قەلب ئێرانەن
توخمات کەیان، نەسل شیرانەن
ئەگەر چەند روژی زار و زەبوون بوون
ئەسیر وەدەست دوژمن دوون بوون

دی بکەن لە نەو یەك ئیتیحادی
...ئیران............... نەژادی [؟]
دا خوەیان لە ئەم بەندە رەها کەن
هەم تورك، هەم عەرەب، لە خەوفا راکەن
کوردان بەم شەرەف، بەم قەدیمیا
چلۆن فەخر دەکەن بەم یەتیمیا ؟
سا ئیستە بەی میهرە لەم دەردا[؟]
کەس وەها نەژاد خوە کەم نەکەردا
وەها ئەسارەت پاگیرشان بوو
گویا پەی خوەیان لەویرشان بوو
کورد هەر ئێرانی، ئیران هەر کوردن
کورد بە لۆغەت وە مەعنای (گورد)ن
لە ئیرانیەت فەرد واحیدەن
تاریخ دنیا هەموو شاهیدەن
هاوار هەی کوردان هەی نامداران
هەی قەوم قەدیم ئیران مەداران
ئەم ئەسارەتا دەرد نیفاقەن
دەردا ئەسارەت دەواش تفاقەن
هاوار هەی کوردان، هەی وەبەخت وێتان
دوژمن فەن و فیت وەمەکەی ویتان
بۆ فەنای ئەم قەوم هەشت هەزار سالە
دوژمنان ئەیکەن خالە و ناخالە

کوردان مندالآن خاك ئیرانەن
"مەدی"نەژادان، دوودەی کەیانەن
هاوار هەی کوردان هەی نەسڵ شیران
توخمات کەیان دوودەی دلیران
واتەی لاهووتی هۆش و گوش بکەین
زەمزەمەی نیفاق فەرموش بکەین
ئەگەر مەخوازین نەجاتتان بوو
ئیتیفاق مایەی حەیاتتان بوو

لاهووتی خان*

## پەراوێزەکان:

١) محمد عەلی سوڵتانی، حدیقه سوڵتانی، جلد سوم، چاپ اول، نشر سها، تهران، ١٣٧٩، ٢٠٠٠، صفحه ٦٧ تا٧١. بەداخەوە کاك محەممەد عەلی سەرچاوەی دۆزینەوەی شیعرەکەی لاهووتی رانەگەیاندووە.

٢).ئەبولقاسم خان، گۆڤاری ژین، چاپی ئەستەموول، ژمارە ٢٥، ساڵی پێنجەم، لاپەڕە ١٨ تا ٢١.

- ئەم شیعرانەم بەسەرەتایەکەوە لە ژمارە ٣٩ و ٤٠ی گۆڤاری گزینگ (هاوین و پایزی ٢٠٠٣) چاپی سویدیدا بڵاوکردۆتەوە.

# پاشکۆی چوارەم

## ئەبولقاسمی لاهووتی (١٩٥٧ - ١٨٨٧)
## بەبۆنەی چاپی هەڵبژاردەی شیعرەکانیەوە

**سەعید نەفیسی**

ناوی لاهووتی، یەك لە بیرەوەرییەکانی ئەدەبی سەردەمی زووی منە – سەردەمی گەنجیەتی وکەم خوێندەوارییم و ئەو کاتانەی وا دەمویست ببم بە شاعیر و نووسەر. ئەودەم، تاقە رێبەرێك کە بەهرەی ئەدەبیی منی دەرخست زەوق و شەوقم بوو بە نیسبەت شیعرەوە لەگەڵ خۆشەویستیم بۆ کتێب. ئەوانەی وا لە جیهانی سایکۆلۆجیدا گەورە بوون (؟) دەزانن، یەکەمین نیشانەی بەهرە وحاڵەتی زاتی لە قوتابیدا، بریتییە لەوخواستەی کە رۆژێك لە رۆژان شوێنی شاعیرێك بگرێتەوە وا خۆشی ویستووە و شوێنی لێ هەڵگرتووە، راست وەك ئەویندارێکی پەرێشان کە بیەوێ لە باوەشی دڵدارەکەیدا بحەسێتەوە، منیش شتێکی ئەوتۆ بووم و بیرم لە هیچ دیاردەیەکی دیکە نەدەکردەوە. بیرەوەرییم لە شیعرەکانی لاهووتی، هی ئەو سەردەمانەیە(١). ئەوکات، من تەنیا سێ شاعیری هاوچەرخم دەناسی: سەید ئەشرەفەددینی حوسێنی گیلانی(٢)، مەلیکوشوعەرا محەممەد

تەقی بەهاری مەشهەدی (۱۹۵۱-۱۸۸۶) (۳)و ئەبوالقاسمی لاهووتی کرماشانی (۱۹۵۷-۱۸۸۷). ئەوانەش وا هاوتەمەنی منن، ئەو سێ کەسەیان بە باشی لەبیرە. لاهووتی تەنیا هەشت ساڵ پێش من هاتبووە جیهان(۴)، بەڵام بە هۆی ئەو راستییەوە کە ئەو لە نۆزدە ساڵانەوە دەستی کر بە شیعر گوتن(۵)، ئیتر لەو کاتانەدا کە من یەکەم هەنگاوم لە جیهانی ئەدەبیاتدا هەڵدێناوە ئەوببووە شاعیرێکی ناسراو(۶).

لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، لاهووتی هاوڕێ لەگەڵ ژمارەیەك لە خەباتکارانی رێبازی ئازادی، چوو بۆ تورکیا، دوای شەڕ، گۆڤاری "پارس" چاپی ئەستەموول کە یەکێك لە باشترین گۆڤارە ئەدەبییەکانی ئەو دەم بوو، هەندێ جار شیعری لاهووتی بڵاودەکردەوە(۷) و جاروبارە دەگەیشتە ئێران. کاتێکیش لە تورکیا گەڕایەوە ئێران و جارێکی دیکە (۸) چوو بۆ ئازەربایجان، شیعرەکانی هەندێ جار دەگەیشتە دەستی ئێمە. کاتێ لە ساڵی ۱۹۳۲دا بۆ یەکەم جار لە مۆسکۆ چاوم پێی کەوت، ۱۳ ساڵ بوو لە یەکیەتی سۆڤیەت دەژیا و بیست ساڵیش بەسەر ئەودەمانەدا تێدەپەڕی کە من بۆ یەکەم جار شیعری لاهووتیم خوێندبوەوە. رووداوەکانی جیهان، شێواز و رێبازی جیاوازیان گرتبووەبەر.

ئەو شاعیرەی من لە ساڵی ۱۹۳۲دا، بۆ یەکەم جار لە مۆسکۆ بینیم تەنیا شاعیرێکی ئێرانی بە بۆچوونی شۆڕشگێڕانە و لایەنگری ئازادی یاخود سووکە شاعیرێك نەبوو کە باسی ئەوینی نیشتمانپەرەستیی ئێرانییەکان بکات. لەوێ لە سۆڤیەت ئیتر ناوی لاهووتی بە هەموو لایەکدا بڵاوببوەوە، وڵاتە ئازادکراوەکانی دیکەش(۹) ناوی لاهووتییان

بەرگوێ کەوتبوو و کارە هەڵبژاردەکانی وەگەڕابوونە سەر چەندین زمان. پاشان لە ساڵی ١٩٣٦، لە هاوینە گەشتی ئەم دواییەی خۆم بۆ مۆسکۆدا، چاوم بە شاعیرێکی ناودار کەوت و لەگەڵیدا وتووێژم کرد. باوەڕ ناکەم هیچکام لە هاوولاتییەکانم هەستی راستەقینەی لاهووتی بە نیسبەت ئێرانەوە وا بناسن کە من دەیناسم. خۆشەویستی شیعر و بۆچوونەکانی لاهووتی لای من، راستییەکی تێیدایە: شیعری لاهووتی باشترین نموونەی شیعری فارسین و دەبێ شاعیرانی دیکە لە باری فۆرم و هەروەها لە باری ناوەرۆکەوە پێ بنێنە جێ پێی ئەو. هۆی بۆچوونەکانیشم ئەو راستییانەی خوارەوەن.

زۆربەی زۆری شاعیرانی هاوچەرخ لە نیشتمانی ئێمەدا، بۆنی شیعریان هەڵنەمژیوە. ئەو خەڵکانە، وابیر دەکەنەوە کە مەسەلەی سەرەکی لە شیعر گوتندا، تەنیا رواڵەت واتە تەکنیکی نووسین و ئاڵۆزاندنی ناوەرۆك و کینایە و چواندنە. بەگوێرەی بۆچوونی ئەوان، هەر ئەوەندە بەسە لاسایی کێش و قافیە و توانای شاعیرانی پێش خۆیان بکەنەوە و هیچی تر ! گومان لەوەدا نییە کە شاعیرانی مەزنی ئێران بە پارێزەوە هەوا و کێش و قافیەیان بەکارهێناوە و هەر بەم شێوەیەش جیهانیان گرتووە. ئەوان ئیتر مەیدانێکی ئەوتۆیان بۆ شاعیرانی دیکە نەهێشتۆتەوە. بە زمانێکی تر بڵێین، شاعیرانی [ ئەمڕۆی] ئێران لە باری فکر و هەروەها تەکنیك و ناسکییەوەن کە تایبەتمەندیی شیعری فارسین، هیچ کاتێ ناتوانن ببن بە فیردەوسی و عومەری خەییام و سەعدی و حافز، کەوابوو دەبێ رێبازێکی دیکە هەڵبژێرن، ناوەرۆکی نەناسراو بخولقێنن، سەروای نوێ بدۆزنەوە و قافیەکان جارێکی دیکە بخەنەوە بەر ئەزموونکاری.

له کۆندا، شاعیران ئەرکی سیاسی و کۆمەڵایەتییان لەسەر شان نەبوو[!] و ئەوەی لە دڵیاندا بووبێت و بۆ خۆیان گوتبێتیان، بەسەربەستی لە شیعریشدا دەریان بڕیوە.ئەمڕۆ [ساڵی ١٩٤٦]، وێژەر و نووسەر، ڕێبەران و پێشڕەوانی بیرۆکەی شارستانیەت و بیری نوێی جیهانن، بەم پێیەش دەبێ لە ڕیزی یەکەمی پێشمەرگەی گیان لەسەر دەستدا بوەستن. ئەوە گرنگترین لایەنی شیعری لاهووتی‌یە و هۆی ئەویندارێی منیشە بە شیعرەکانی.

لاهووتی، ئەو وێژەرەیە کە شیری لە کالان کێشاوەتە دەرێ و بە سینگی ڕووتەوە کەوتۆتە گۆڕەپانی شیعرەوە لە هەموو ٥٩ ساڵی تەمەنی، نزیکەی سی ساڵی لە مەیدانی خەباتدا بەردۆتەسەر. پێشمەرگە شیعر ناڵێت (١٠)، بەڵام زۆر شاعیر هەن کە خەبات دەکەن و لاهووتی یەك لەوانەیە. لایەنێکی دیکەی کاری لاهووتی، خۆ بەختکردنیەتی لە پێناو ئەو ئاوات و باوەڕانەی وا لە شیعرەکانیدا دەری دەبڕێت. ئەوەی لە شیعری لاهووتیدا دیبینی عەینوبیللا هەر ئەو شتانەیە وا لە بیرو بڕوایدا هەیە. من لە پێوەندییەکانی نزیکی ئەم شاعیرە بە هێزەدا بووم وهەم. ژیانی لاهووتیم خستۆتە بەر سەرنج، سەردانی ماڵیم کردووە، هەموو نووسراوەکانیم خوێندۆتەوە، گوێم لە قسەکانی گرتوە و دەزانم شیعری لاهووتی، ڕەنگدانەوەیەکی تۆخی بیرو بڕواکانین.

ئەو وتووێژە دوورودرێژەی لەگەڵ شاعیردا کردوومە، باشترین نیشاندەری ئەوین، لەخۆبردوویی و شەوقی تایبەتی ئەون بە نیسبەت نیشتمانەکەیەوە. لەوەش ئاشکراتر، ڕەوانبێژییەتی لەو شیعرانەدا کە

به ئێرانیدا هەڵگرتوون. لاهووتی، ئەم مەیلە بە سۆزەی لە خێزان و منداڵەکانیشیدا خولقاندوە. سەرەڕای دوورمانەوەی لە ئێران و ئێرانی، پێوەندیی نزیکی خۆی لەگەڵ زمانی فارسیدا پاراستووە و هەمان بۆچوون و هەمان تەرکیب بەکار دەهێنێت کە لە زمانی فارسیدا بە کاری دەهێنن. بۆ راگەیاندنی بیر و بۆچوونی خۆی بە خەڵکی تاجیکستان، کەڵکی کەم لە وشە و عیبارەتی تاجیکی وەردەگرێت. ئەوەش لایەنێکی دیکەی گرنگە لە شاعیریەتی لاهووتیدا کە بۆتە هۆی ئەوەی شیعرەکانی لەنێو خەڵکی تاجیکستان و ئۆزبەکستاندا خۆشەویست بن. گەلێك گرنگە کە لاهووتی ئیجازە نادات خەڵکی تاجیکستان بنەمای نووسینی پێشینیانی خۆیان لەبیر بەرنەوە. چۆنیەتی بۆچوون و قسەکردنی لاهووتی، تەواو ئێرانی‌یە و ئەوەش گرنگایەتییەکی دیکەی بەکارهێنانی زمانە لەلایەن ئەوەوە. نموونەی باشی وشە و عیبارەتی جوانی شیعری فارسی لە نووسینەکانی لاهووتیدا بەدیدەکرێت.

ئەوانەی سەرنجیان دابێتە نووسینەکانی لاهووتی، دەزانن لە ماوەی مانەوەی تورکیادا، تەنیا شتێك کە پێی بڕابێت، گلەیی و شکات و خەم و دڵساردییە. شاعیر، لەوێ وەك پەپوولەیەك وایە لە قەفەزدا راگیرابێت یاخود لە باڵندەیەکی ئەسیر دەچێت. بەڵام ئەوەی لە یەکیەتی سۆڤیەت پێی بڕاوە، شەوق و هەست و خەبات لە رێگای ئیش و کاری خۆی وبیرەوەریی ئێرانە و هیوای گەڕانەوەیەتی بۆ وڵات. شاعیر، هەمیشە یەکیەتی سۆڤیەتی بە نیشتمانی دووهەمی خۆی زانیوە وەك ئاکامێك، شەوق و هەست، خۆشەویسترین باوەڕ و ئاواتەخوازیی بۆ جیهانێکی

باشتر و رازاوەیی وشە، هەموو لێرە سەریان هەڵداوە. رۆحی ئێرانیچییەتی لاهووتی لە هەندێك لە باشترین شیعرەکانیدا دەرکەوتووە. لەوانەن: "مەرگی موجاهید"(١١)، "وەلامێك بۆ فریوکاران"(١٢)، "وەحدەت و تەشکیلات"(١٣)، "وەسیەت"(١٤)، "ئێرانی من"(١٥)، و "وەلامێك بۆ رۆمەن رۆلان"(١٦).

شیعری لاهووتی، یەك یەك یاخود سەرجەم، چەندین جار لە یەکیەتی سۆڤیەت چاپ کراون. کۆمەڵەی شیعرەکانی تەنانەت لە شاری "تەورێز"یش چاپ کراوە (١٧)، زۆر شیعری وەرگەڕاوەتە سەر زمانە جیاجیاکانی یەکیەتی سۆڤیەتی بە زمانی رووسییەوە. لەم دواییەدا چاپی تازەی باشترین شیعرەکانی بە ناوی "کارە هەڵبژاردەکان" لە ٤٦٢ لاپەڕەدا لە مۆسکۆ چاپ کراوە و هەندێك لە باشترین شیعرەکانی گرتۆتەبەر. چاپی تازەی ئۆپێرێتی "کاوەی ئاسنگەر (١٨) لەم دواییەدا لە تاران بڵاوبۆتەوە.

ئێستا کە چاپی تازەی "کارە هەڵبژاردەکانی" لاهووتی کەوتۆتە بازاڕەوە، دەتوانم بە وردی و روونییەکی زیاترەوە لێیان بڕوانم. هەر بۆیەش بە پێویستم زانی ئەم سەرەتایە بنووسم. هەروەها پێشنیاری خوێندنەوەی کتێبەکەی، بە هەموو خوێنەرێك دەکەم. هیوادارم ئەمڕۆ، کە ئێرانی خۆشەویستی ئێمە وەك گەمییەکی بێ گەمیەران کەوتۆتە جەرگەی کارەساتەوە (١٩)، نەفەسی پڕ هەستی ئەم شاعیرە مەزنەی ئێران، شوێنی پێویست لەسەر برا ئێرانییەکانمان دابێنێت. هەروەها بە هیوام رۆحی بە جەرگی و ئازایەتی ئەم شاعیرە مەزنە کە لە نووسینەکانیدا شەوق دەداتەوە، لاوانی ئێرانی بخاتە سەر راستە رێگای خەبات.

لایەنێکی دیکەی ژیانی لاهووتی کە دەبێ لێی بکۆڵرێتەوە، دۆستایەتی و نزیکایەتییەتی لە "ئیحسانوڵلاخانی دۆستدار"، ئەندامی "کومیتەی موجازات" و رێبەری باڵی چەپی بزووتنەوەی جەنگەڵ. ئیحسانوڵلاخان (١٩٤١ ـ ١٩٨٤؟) زۆر واهەیە لەو سەردەمەدا تێکەڵ بزووتنەوەی جەنگەڵ بووبێت کە لاهووتیش دوای کوژرانی ئەفسەرە ئێرانی و سوێدەییەکان ویستی بچێت بۆ "رەشت" و نەیتوانی. درەنگتر، دوای هەرەسی بزووتنەوەکە، ئیحسانوڵلاخان کە بە هەڵە تاوانی کوشتنی میرزا کوچك خانی دەدرێتە پاڵ دەچێتە سۆڤیەت و پاش ماوەیەك شرت و گوم دەکرێ. پێوەندیی ئەو دوو کەسایەتییە جێگەی سەرنجی تایبەتی یە. هەروەها، بە بڕوای من، دەبێ وتار و شیعری لاهووتی لە رۆژنامەی "شفق سرخ"ی عەلی دەشتی دا بڵاوبووبێتەوە و پێداچوونەوەی ژمارەکانی ئەو رۆژنامەیە، کارێکی پێویستە.

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ:

١) سەعیدی نەفیسی، ئەدیب ونووسەری ناسراوی ئێرانی (١٩٦٦ـ١٨٩٥). ماوەیەك پێوەندی گەرم و گوڕی لەگەڵ پێشکەوتنخوازان و تەیاری چەپی ئێراندا هەبوە و چەند جارێك سەردانی یەکیەتی سۆڤیەتی کردووە.ئەم وتارە، بەرهەمی ئەو سەفەرانە و چاوپێکەوتنی لاهووتی یە لە وڵاتی سۆڤیەت.

٢) سەید ئەشرەفەددینی حوسێنی، شاعیر و رۆژنامەنووسی ئێرانی و سەرنووسەری رۆژنامەی "نسیم شمال" (١٣١٣–١٢٨٨).

سەید ئەشرەف، شوێنی زۆری میرزا عەلی ئەکبەری صابیر (هۆپ هۆپ) شاعیری شۆڕشگێڕی ئازەربایجانی لەسەرە و ئەویش بەشبەحاڵی خۆی، شوێنی لەسەر لاهووتی داناوە.

[3]) شاعیر، نووسەر، توێژێنەر و ڕۆژنامەنووسی گەورەی ئێرانی. "بەهار" لە پێوەندییەکی نزیکی دوکتۆر سەعید خانی کوردستانیدا بوو و لە ڕێگای ئەوەوە شارەزایی لە ئەدەبیاتی کوردیش پەیدا کردبوو. یەکەم کەسێك کە شیعرە تەزویرە ئاراستەکەی: "هورموزگان ڕمان، ئاتران کوژان - وێشان شاردەوە گەورەی گەورەکان"ی لەنێو ئێرانییەکاندا بڵاوکردەوە، "بەهار بوو. بەهاریش شیعرەکەی لە زمانی دوکتۆرسەعید خانەوە بیستبوو. وابزانم ئەم شیعرە یەکەم جار خوالیخۆشبوو حوزنی موکریانی باسی لێ کردبێت.

[4]) نەفیسی لە ساڵی ١٨٩٥دا هاتۆتە جیهان و هەشت ساڵ پێش ئەو، دەکاتە ساڵی ١٨٨٧، واتە لاهووتی لە ساڵی ١٨٨٧دا، لە دایك بووە. بەڵام ساڵی لە دایکبوونی لاهووتی لە هەندێ سەرچاوەدا، بە ١٨٨٥ نووسراوە و من بە کەڵك وەرگرتن لەوانە، ساڵی لە دایکبوونی لاهووتیم لەسەرەتای وتاری "سەبارەت بە خۆم" (گزنگ ژمارە ٢٧) ١٨٨٥ نووسیوە. سەرچاوەکانی بەردەستی من وەك دیوانی چاپی تاران، ساڵی ١٨٨٥ دەسەلمێنن بەڵام نەفیسی ئەم ساڵەی بە ١٨٨٧ ناو بردوە.

[5]) دەبێ ئەم نۆزدە ساڵانە تاریخی چاپ و بڵاوبوونەوەی یەکەم شیعری لاهووتی بێت لە ڕۆژنامەی "تەربیەت" چاپ کرماشاندا. دەنا وەك لە زمان خودی شاعیرەوە دەبینین، لاهووتی هەر لەسەرەتاکانی

مێرمنداڵی و سەردەمی شەڕەگەڕەکی منداڵانەوە شیعری هۆندۆتەوە. (بڕوانە گزینگ ژمارە ٢٧).

٦) بە بڕوای من هۆی ناودەرکردنی لاهووتی و کەم ناویی "نەفیسی" تەنیا لە مەسەلەی ساڵ و مانگدا نابێ بدۆزرێتەوە. لاهووتی وەك خەباتگێڕێکی بەجەرگ - بە قەڵەم و بە قەدەم کەوتبوە خزمەتکردنی کۆمەڵگاوە و لە هەموو کۆڕ و کۆمەڵێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی - ئایینیدا، چالاکی دەنواند. ئەوەش ببووە هۆی ڕێز و حورمەت لەلایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە.

٧) لاهووتی خۆی بۆ ماوەیەك سەرنووسەری گۆڤاری "پارس" بوو.

٨) دەبێ نیازی لە "جارێکی دیکە"، بەشدرایکردنی لاهووتی لە شەڕی مەشرووتەخوازاندا دژ بە ئیستیبداد" بێت لە ساڵی ١٩٠٧دا جاری دووهەمیش ئەو کاتەیە وابە ئیجازەی "موخبیرولسەڵتەنە" گەڕایەوە نێو ریزەکانی جەندەرمە و لە شاری "شەرەفخانە" ئازەربایجان دامەزرا.

٩) ولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات واتە "هۆردووگای سوسیالیزم".

١٠) لای کەم ئەو بۆچوونە بۆ پێشمەرگەی کورد ڕاست نییە، کورد زۆر پێشمەرگەی شاعیری هەن وەك چۆن شاعیری پێشمەرگەشی هەر هەیە.

١١) پارچەشیعری "مرگ مجاهد": ئەم شیعرە سەبارەت بە کوژرانی "حەیدەر عەموئۆغلی" شۆڕشگێڕی ناوداری ئازەربایجان لە سەردەمی مەشرووتەی ئێرانە: سپاه شاه، در سمت جنوب جادەی تهران. قشون ملی اندر شهر رشت و جنگل گیلان.

١٢) شیعری "پاسخ به اغواگران" له راستیدا وەڵامی ئەو قسانەیە کە رژێمی پەهلەوی بڵاوی کردبووە، گوایە لاهووتی لە سۆڤیەت هەڵاتووە و چووە بۆ هیندستان: بشد با مرد مشهوری در ایران. ملاقی، شخص ناپاکی از اعیان. (بڕوانە وتارەکەی مامۆستا حەسەن قزڵجی، پاشکۆی شەشەم).

١٣) "وحدت و تشکیلات" وا هەیە لەنێو خەباتکارانی تەیاری چەپی ئێراندا، ناسراوترین شیعری لاهووتی بێت: ئەم شیعرە لەسەر شێوازی نوێ هۆنراوەتەوە:

"سر و ریشی نتراشیده و رخساری زرد

زرد و باریك چونی

سفرەای کرده حمایل، پتونی بر سر دوش

ژندەای بر تن وی..."

تا دەگاتە ئەو شوێنەی کە دەڵێ:

"چاره، رنجبران وحدت و تشکیلات است". مۆسکۆ فوریە ١٩٢٤.

١٤) شیعری "وصیت": لاهووتی شیعرێکی بە ناوی "وصیت نامە" هەیە کە لە رووسییەوە تەرجەمەی کردووە و هۆنراوەی "تاراس شوچنکۆ"یە: "چون میرم خوابانید یاران ـ مرا زیر زمین"، بەڵام دڵنیام ئەو شیعرەی وا سەعید نەفیسی ئاماژەی پێکردووە ئەوە نییە و زۆر وا هەیە شیعری "پنجه انتقام" بێت: گوئید زمن ستمگران را/ گویند وداع مادران را، مۆسکۆ ١٩٢٤. یاخود شیعری "کلمه شهادت رنجبری": "شهادت میدهم بر اینکه من از ملت کارم.." نخجوان، فوریە ١٩٢٢. ئەم شیعرە، بە بڕوای من، هەوێنی شیعرە ناسراوەکەی مامۆستا هەژارە بە ناوی "تەڵقینی کوردی".

۱۵) شیعری "ایران من"، دارماڵی نۆستاڵژی و بیری دووریی له ئێرانه، بەڵام له جەنگەی شەڕی دووهەمی جیهانیدا گوتراوه و تێیدا هێرش کراوەتە سەر هیتلەر و له لایەکی دیکەوه لێنین و ستالین ڕێزیان لێ گیراوه:

بشنو اواز مراازدور، ای جانان من!
ای گرامیتر زچشمان خوبتر از جان من !
اولین الهام بخش و آخرین پیمان من !
کشور پیر من اما پیر عالیشان من
طبخ من ! تاریخ من! ایمان من ! ایران من !

(استالین اباد، مارس ۱۹۴۳).

۱۶) شیعری "به رومن رولان" بۆ نووسەری ناسراوی فەرەنسی "ڕۆمەن ڕۆلان" گوتراوه که دەبێ نامەی بۆ لاهووتی نوسیبێت و ئەویش بەم شیعره وەڵامی دابێتەوه:

به نامه‌ات، وطنم را نوشته‌ای آزاد
به رخ ز دیده‌ام از شادی آب می‌آید
من آن مبارز ایرانیم که از وطنم
فقط بیادم دار و طناب می‌آید

۱۷) کۆمەڵه شیعری "دیوان اشعار لاهووتی" یەکەم کۆمەڵه شیعرەکانی لاهووتی بوو، که له ساڵی ۱۳۲۰/ ۱۹۴۱ دا له ئێران و له شاری تەورێز بڵاوکرایەوه. ئەم کتێبه بچووکه، "محمد لوی عەبباسی" چاپی کرد. عەبباسی هەمان ئەو کەسەیه وا دەرنگتر چوو بۆ سۆڤیەت و له گەڕانەوەدا بۆ یەکەم جار "شەرەفنامەی بدلیسی" له تاران بردە ژێر چاپ. نوسخەی شەرەفنامەی چاپی عەبباسی، ئۆفسێت کراوی نوسخەی چاپی "فەرج الله زکی الکردی "یه و خۆی سەرەتا و هەندێ

پەراوێزی لێ زیاد کردووە. نوسخەیەك لە دیوانی لاهووتی چاپی تەورێز، تا ساڵی ١٩٧٠ ش کە من لە زانکۆی ئەدەبیاتی زانستگەی تاران دەمخوێند، لە کتێبخانەی ی زانکۆ پارێزراوبوو و بە رواڵەت تاقە نوسخەی ئەم کۆمەڵە شیعرە بووکە لە کتێبخانە گشتیەکانی ئێراندا مابووەوە و نەکەوتبووە بەر زەربی ساواکی شا. لە ساڵی ١٩٣٥یشدا کۆمەڵە شیعرێکی لاهووتی بە ناوی "هزار مصراع" لە مۆسکۆ بلاوکرابووەوە.

١٨) کاوەی ئاسنگەر، لە راستیدا شانۆنامەیەکە بە شیعر و جگە لەوەی لەگەڵ سەرجەمی شیعرەکانی لاهووتیدا بلاوکراوتەوە، چاپی سەربەخۆشی هەیە.

١٩) ئەم وتارە لە ساڵی ١٩٤٦، واتە لە ساڵی دامەزرانی کۆماری ئازەربایجان و کوردستان و بێ دەسەلاتیی رژێمی محەممەد رەزاشا لە جەنگەی شەڕی دووهەمی جیهانیدا، بلاوکراوەتەوە. چاپی وتاری ئەوتۆ لە ساڵانی دواتری ئێران بۆ کەس نەدەگونجا. سەرەڕای ئەوانەش، نەفیسی چاو لە راستییەکان دەقووچێنێ و ئێرانی ئەوساڵانە بە "گەمیەی بێ گەمیەوانی نێو جەرگەی کارەسات" دەشوبهێنێ. وەرگێراوی کوردی ئەم وتارەی سەعید نەفیسی سەرەتا لە ژمارە ٢٩ (پایزی ٢٠٠٠) ی گۆڤاری گزینگ چاپی سویددا بلاوکراوەتەوە.

# پاشکۆی پێنجەم

## لاهووتی ( ١ )

**موینبور رەحمان**

**سەرچاوە: ئەنسیکلۆپێدیای ئیسلام**

**چاپی نوێ، بەرگی ٥**

لاهووتی، ئەبوالقاسم، شاعیر و شۆڕشگێڕی ئێرانی، لە ٤ی مانگی دیسەمبری ١٨٨٧ لە کرماشان هاتە دنیا، کوڕی پینەچییەکی هەژار بوو. بە گەنجی چووە ریزی خەباتی مەشرووتەخوازی ئێرانەوە و دوای ئەوەی محەممەد عەلیشا لە ساڵی ١٩٠٨دا هەوڵی گەڕانەوەی حوکمی ئیستیبدادی دا، لە شاری رەشت بەشدرایی شەڕی دژ بە لایەنگرانی شای کرد. پاش دامەزرانەوەی مەشرووتە لە ساڵی ١٩٠٩دا، چووە ریزی جەندرمەوە و وردە وردە پلەی تا "مێجەر"ی بەرز بووەوە. لەوێ، تاوانی خراپەکاریی درایە پاڵ و حوکمی ئیعدامی بۆ دەرچوو، بەڵام توانی هەڵبێت و بچێتە شاری سلێمانی لە سنووری تورک (عیراقی ئێستا).

لە ساڵی ١٩١٥دا گەڕایەوە شارەکەی خۆی و کێشرایە ناو بزووتنەوەیەکی دژ بە هێزەکانی هاوپەیمانەوە کە هێرشیان کردبووە

سەر ئێران. هەر لەو کاتەدا، ڕۆژنامەی "بێستوون"ی لە کرماشان دەرکرد و حزبێکی کرێکاریشی دامەزراند (٢). پاشان سەرلەنوێ لەگەڵ دەسەڵاتداریەتیدا کەوتە کێشەوە و کۆچی کرد بۆ ئەستەمووڵ.

لە ئەستەمووڵ لە قوتابخانەی ئێرانیان دەرسی دەگوتەوە و گۆڤارێکی فارسی - فەرەنسی بەناوی "پارس" دەردەکرد. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٢١دا ئیجازەی گەڕانەوە بۆ ئێرانی پێ درا و لە جەندەرمریدا دامەزرایەوە. زۆری پێ نەچوو کە سەرۆکایەتی ڕاپەڕینێکی بێ ئەنجامی کرد لە تەورێز، و دوای تێکشکان هەڵات بۆ یەکیەتی سۆڤیەت (مانگی فیبرەوەری ١٩٢٢). لە یەکیەتی سۆڤیەت، چالاکیەکانی لاهووتی لە پەیوەندی ژیانی سیاسی و کولتووریی تاجیکستاندا بوو–ئەوشوێنەی کە دوای ساڵی ١٩٢٣ لێی گیرسایەوە. بوو بە یاریدەدەری کۆمیساریای خوێندن و سەرۆکی شانازیی یەکیەتی نووسەرانی تاجیك. حکوومەتی سۆڤیەتی نیشانی زۆری خەڵات کرد کە یەك لەوانە میدالیای لێنین بوو. لاهووتی لە ١٦/ ٣/ ١٩٧٥ لە مۆسکۆ کۆچی دوایی کرد. لاهووتی گرنگترین شاعیری کومۆنیستی ئێران بوو و بە ڕاستی وەك بناغە دانەری شیعری سۆڤیەتی تاجیك زانراوە.

شیعرە سەرەتاییەکانی لە چاپەمەنی دەورەیی سەردەمی مەشرووتە - وەك حبل المیتن، ایران نو و شەرق دا بڵاوبوونەتەوە. لە شیعرەکانی پێش ساڵی ١٩٢٢ی دا، هەستی لایەنگریی خۆی بە نیسبەت کرێکار و وەرزێرانەوە دەربڕیوە. دواتر، مانەوەی هەمیشەیی لە سۆڤیەت مەیلی بە نیسبەت یەکیەتی سۆڤیەت بەهێزتر کرد وهونەرەکەی بە شێوەیەکی

پێشکەوتوانە مۆرکی بەرپرسیایەتی سیاسی و ئەدەبی بەرانبەر بە حکوومەتی سۆڤیەتی لێدرا. شیعری "کرێمل" (واتە کرێملین) کە لە ساڵی ١٩٢٣دا گوتراوە، یەکەمین نیشانەی بەر چاوی ئەو گۆڕانکارییە بوو. شاعیر، بەدکارییەکانی تزاری وەبیر دەهێنایەوە، چەوسانەوەی ئەمپریالیستی و سەرمایەداری مەحکووم دەکرد و سەرکەوتی شۆڕشی سوسیالیستی رووسیای بەخێر دەهێنا.

شیعرەکانی دواتری لاهووتی زیاتر سەبارەت بە ژینگەی نوێی بوون بەڵام ئەوبابەتانەش لە پەیوەندی ئێراندا بوون، هەرگیزلە کەمییان نەدا: شاعیر کەڵکی لە هەردوو فۆڕمی سوننەتی و نوێ وەردەگرت و کێشی غەیرە سوننەتی بەکار دەهێنا کە بە رواڵەت ئیلهامی لە نموونە ئەدەبیە رووسییەکان وەرگرتبوو. لاهووتی هەروەها شیعری گۆڕانی (سروود)ی دەگوت و ئۆپێرا "کاوەی ئاسنگەر"ی نووسی، کە یەکەمین ئۆپێرایەك بووله تاجیکستان بەڕێوە بېرێت. تێکۆشانی ئەدەبی لاهووتی باڵی کێشایە گۆڕەپانی تەرجەمە، کە بە شێوەیەکی هەڵبژاردە، شوێنەواری شێکسپیر، پوشکین، گورکی و مایاکۆفسکی دەگرتەبەر. وشەکانی ساکار و بێگرێوگۆڵ و زمانی بەکارهاتووی شیعرەکانی، کەم و زۆر هاوشانی زمانی ئاسایی خەڵك بوو.

## بیبلیۆگرافی:

کوللیاتی لاهووتی، ٦ بەرگ، دووشەنبە ١٩٦٠/٣، ر. ئ. ی، ٨ (١٩٣٤)، ٥٥-٣٤٩؛ ئ. ج. براون، چاپەمەنی دەورەیی و شیعری ئێرانی هاوچەرخ، کەمبریج ١٩١٤ ؛محمد تقی بەهار، تاريخ مختصر

احزاب سیاسی ایران ، تاران ۱۳۲۳ ی کۆچی هەتاوی؛ حسین مکی، تاریخ بیست ساله ایران، ۲، تاران، ۴ـ ۱۳۲۳ی کۆچی هەتاوی؛ ل. ی. کلیمۆڤیچ، مێژووی ئەدەبی نوێی سۆڤیەت، مۆسکۆ ۱۹۴۷؛ ج. لێنزۆوسکی، رووسیا و رۆژئاوا لە ئێران ۱۹۴۸ ـ ۱۹۱۸، نیویۆرک ۱۹۴۹؛ [گۆڤاری] ئەدەبیاتی سۆڤیەتی، ژمارە ۹، مۆسکۆ ۱۹۵۴، لل ۴۲ـ ۱۳۸؛ مونیبور رەحمان، شیعری فارسی دوای شۆڕش، عەلیگره ۱۹۵۵؛ ئـ . پاگلیا رۆ و ئـ . بەوسەنی، مێژووی ئەدەبیاتی فارسی، میلان ۱۹۶۰؛ مێژووی ئەدەبیاتی هاوچەرخی تاجیکستانی سۆڤیەتی، مۆسکۆ ۱۹۶۱؛ ف.ماکالسکی، ئەدەبیاتی هاوچەرخی ئێران، بەرگی ۱، کراکۆف ۱۹۶۵؛ ئەدەبیات تاجیکی، دوشەنبە ۱۹۶۶؛ یـ . ریپکا، (؟)، مێژووی ئەدەبی ئێران، دۆردرێخت ۱۹۶۸؛ ج. پرۆسێك (ئێدیتۆر)، قامووسی ئەدەبیاتی رۆژهەلات، لەندەن ـ نیویۆرک ۱۹۷۴، بەرگی ۳، ئیسفەهان، بێ تەئرخ.

۱) من ئەم وتارەم لە دەقی ئینگلیزی ئەنسیکلۆپێدیای ئیسلام وەرگرت کردمە کوردی ئەوەش سەرچاوە:

Monidur Rahman, The Encyclopaedia of Islam, NeW Edition,Vol. v, Leiden, E.J. Brill 1986.

۲) نیاز، حزبی سوسیال دیموکراتی ئێرانە کە بناغە دانەرانی بریتی بوون لە محمد تەقی خانی پسیان و میرزا حسین خانی معاونی کرماشانی، هەروەها شۆڕشگێڕی بە ناوبانگی ئازەربایجانی حەیدەر عەمونۆغلووش هاوکاریی دەکردن. بۆ ئەم بابەتە بڕوانە: محمد عەلی سوڵتانی، احزاب سیاسی و انجمن های شهری در کرمانشاه، ج۱، نشر سها، تهران، ۱۳۷۸ (۱۹۹۹)، ص ۱۳٤. کاك کلیم الله توحدی دەڵێ

محمد تەقی خانی پسیان کە کوردی قۆچان کوشتیان، خۆی کورد بووە. بۆ ئەم بابەتەش بڕوانە: کلیم الله توحدی، حرکت تاریخی کرد به خراسان، ج٥، نشرمهبان، مشهد، ١٣٧٧ (١٩٩٨)، صص ٩٧و ٢٣٨. وەرگێڕ.

# پاشکۆی شەشەم

## لاهووتی شاعیری بە ناوبانگی کورد*

**نووسینی حسن قزلجی**

### پێشەکی:

**خوسرەو پیربال**

هاوینی ساڵی ١٩٨٢ لە کتێبخانەی گشتی سلێمانی چەند هەفتەیەك بە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی ساڵانی پەنجاکان و شەستەکاندا دەچوومەوە. کاتێك نۆرە هاتە سەر گۆڤاری "هیوا" کە یانەی سەرکەوتن لە بەغدا، لەنێوان ساڵانی ١٩٥٧ - ١٩٦٣دا، دەریکردووە، لە ژمارەی ١ی ساڵی سێهەم، تەشرینی دووهەمی ١٩٥٩، لاپەڕەی ٤٦-٥١دا بابەتێکم بە ناوی "لاهووتی شاعیری بە ناوبانگی کورد" کەوتە بەرچاو کە مامۆستا حەسەنی قزڵجی نووسیبووی. پێشتر چەند جار شیعر و ژیاننامەی لاهووتیم خوێندبووەوە، بەڵام نەمزانی بوو کە لاهووتی کورد بووە وبە زمانی کوردیش شیعری نوسیوە و بڵاوکردۆتەوە. ئیدی نووسینەکەی مامۆستا قزڵجیم بە خەتی خۆم لە دەفتەرێکدا نووسییەوە. پاشتریش هەرچیم دەربارەی لاهووتی کەوتبێتە بەرچاو و بە گرینگم زانیبێت لای

خۆم یادداشتم کردووه. دواتریش چەند شیعری کوردی ئەوم دەستخست کە لە کاتی خۆیدا بڵاویکردبوونەوە. لەم ساڵانەی دواییدا لە چەند کتێب و وتار و لێکۆڵینەوەی کوردیدا، لاهووتی هێنراوەتە باس و لێکۆڵینەوە و ئەوە دووپات کراوەتەوە کە لاهووتی کورد بووە و بە کوردیش شیعری وتووە، بەڵام لە هیچ کام لەو وتار و لێکۆڵینەوانەدا لە پارچە شیعرێکی بەو لاوە هیچ شیعری کوردی دیکەی ئەو بڵاونەکراوەتەوە. منیش لە لای خۆمەوە بڕیارمدا بە پێی ئەو زانیاریانەی کە لای خۆم دەربارەی لاهووتی یادداشتم کردوون، لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە ژیان و شیعرە کوردییەکانی بنوسم و ئەوەی بە پێویستی دەزانم دەربارەی بیخەمە روو. پێشم باشتر بوو، سەرەتا نووسینەکەی مامۆستا حەسەنی قزڵجی کە (ئێستا) چل و دوو ساڵی بەسەر دا تێپەڕیوە و هیچ کام لەو نووسەر و لێکۆڵەرەوە کوردانەی کە لەم دواییەدا دەربارەی لاهووتیان نووسیوە ئاگاداری نین، بە هەندێك روونکردنەوە سەرلەنوێ بڵاوبکەمەوە. لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە سوپاسی مامۆستا "سدیق ساڵح"ی هاوڕێم بکەم کە چەند مانگ لەمەوپێش کۆپییەکی نووسینەکەی مامۆستا قزڵجی بۆناردم.

لاهووتی ناوی ئەبولقاسمە، ساڵی ١٨٥٥ لە شاری کرماشان لە دایك بووە. باوکی ناوی "ئیلهامی"یە، لە باکووری کرماشان موڵکێکی زۆری بووە. سەردەمی قوتابخانە وسەرەتای خوێندنی رۆشن نییە. لە هەوەڵی گەنجییەوە دەستی کردووە بە شیعر وتن. لە خەم و خەفەتی لەناوچوونی دارایی و سامانی، نازناوی شیعری خۆی بە لاهووتی داناوە. زۆر ئارەزووی بووە شیعرەکانی بخاتە بەردەم و دەستی خەڵك.

بۆ ئەوەڵین جار شیعری خۆی لە رۆژنامەی "ایران نو"دا چاپ کردووە، ساڵی ١٩٠٩ و ١٩١٠.

ماوەیەك "علومی دینی"خوێندوە، لە پاشان بە رێنیشاندانی کەس وکار و برادەرانی، ساڵی ١٩٠٤ چۆتە رشتەی پۆلیسی ئەو وەختەوە کە پێیان وتوە "ژاندارمری". سەبارەت بە لێهاتن و کارامەیی، ساڵی ١٩١٢ گەیشتۆتە پلەی "رەئیسی"و بۆتە فەرماندەی ژاندارمری شاری "قوم". هەر لەو ساڵە دا بە بۆنەی هێندێ گێرە و کێشەوە یەکێك لەژێر دەستەکانی خۆی کوشتووە.

گرتوویانە و بردوویانەتە تاران. ماوەیەك لە زینداندا ماوەتەوە. دەرفەتی بۆ هەڵکەوتووە و رایکردووە، بە رێگای خانەقیندا هاتۆتە بەغدا. ساڵی ١٩١٤ لە بەغداوە چۆتە ئەستەموول. لە وێ دووکانێکی کتێب فرۆشی بچوکی داناوە. وردە وردە لەگەڵ رۆشنبیرەکانی ئەوێ سەری ئاشنایەتی داخستوە، تا کەس وکاری لە تارانەوە کاغەزیان بۆ نووسیوە، چونکە تاوانەکەی لەسەردەمی قاجارەکاندا بووە و ئێستا حکوومەت گۆڕاوە حکوومەتی تازە بەخشیویەتی و ئیتر بگەڕێتەوە، لە پاش پرسی دۆست و برادەرانی، ساڵی ١٩٢١ گەڕاوەتەوە تاران و سەر لە نوێ چۆتەوە رشتەی ژاندارمری. هەر ئەو ساڵە بە پایەی "رەئیس ئەووەڵ"ی بۆتە فەرماندەی ژاندارمری تەورێز.

کە چۆتە تەورێز لە کۆمەڵی "سوشیال دیموکرات" نزیك بووە و پێوەندی لەگەڵ پەیدا کردوون. ساڵی ١٩٢٢ لە شۆڕشەکەی "شێخ محەممەدی خیابانی" دا هاوبەشی کردووە. لە پاش کوژرانی خیابانی و شکانی شۆڕشگێڕەکان و هاتنی ئۆردووی تاران بۆ تەورێز، رایکرد بۆ "جولفا" و لە رێگەی "ئاراز"ەوە چوە ولاتی سۆڤیەت.

هەندێ گۆڤار و ڕۆژنامەی ئێران نوسیوویانە کە ساڵی ١٩٥٢ لە وڵاتی سۆڤیەتەوە رایکردووە و چۆتە پاکستان. لەوێ کتێبێکی نوسیوە بە ناوی "ژیانی من"ەوە، لە سۆڤیەت خراپ دواوە. ئەمە درۆ و بێبایەخ و ساختەیە. کتێبی ناوبراو ئاخر و ئۆخری ساڵی ١٩٥٣ لەلایەن کۆنەپەرەستەکانی ئێرانەوە، بە ناوی لاهووتیەوە هەڵبەستراوە و لە چەند ڕۆژنامەدا بڵاو کراوەتەوە، تا بە خەیاڵی خۆیان سۆڤیەتی پێ بەد ناو بکەن. لاهووتی مانگی ژانویەی ساڵی ١٩٥٤ لە مۆسکۆوە، بەم شیعرانە وڵامی داونەتەوە:

پیاوێکی بەناوبانگ، لە ئێرانا
تووشی ناپاکێك هات، لە گەورەکان
وتی: عەجایب! ئەمە تۆی؟
یەکی ترە لە تۆ ئەچێت، یا هەر خۆتی؟
بیستم بە وەبا مردووی،
بە دەس مەرگەوە لەناو چووی!
پێی گوت: نابینی، زیندووم؟
قسە ئەکەم، ئەبینم، ئەبزووم؟
گوتی: دەمێکە پیاوێکی راستگۆ،
خەبەری مەرگی تۆی داوە!
گوتی: شایەتی زیندوویەتی من
لە خۆم راستتر کێت دەس ئەکەوێ؟
پەیتا پەیتا کابرای نەگریس،

ئەیگوت: ئەوەی خەبەری هێنا وریایە
درۆ ناکات پیاوی چاکە،
قسەی وەك زێڕ بە نرخە!
کە ئەم پڕو پووچانەی لێ بیست،
کابرای رووسپی پێی گوت:
ئەزانم تۆ قینت لێمە،
دوژمنایەتی کۆنت هەیە
تۆ ئارەزووی مەرگم ئەکەی
بە دڵ ئەتەوێ ئازارم دەی
بەڵام بە دیقی تۆ، ماوم
زۆر بە رێزم، بەرزە ناوم
****
گێرە شێوێنی دەغەڵەکانی ئێران
وەك چیرۆکی ئەو جۆرە گەورانەیە
من لە مۆسکۆدا، شارێکی ئازاد
ئەژیم بەختیار، دڵشاد!
بەڵام دوژمن ئەڵێ: من ، من نیم!
چونکە لە پیاوێکی راستی بیستوە.
کە من بە دڵشکاوی
لە وڵاتی سۆڤیەت رامکردووە،
لە پێشا چومەتە پاکستان،
لە وێوە چومەتە هیندوستان،

گوایا لە وێ کتێبێکم نوسیوە
لە وڵاتی سۆڤیەت خراپ دواوم!!..
ئەی ناکەس کە تۆ ئەمە ئەنووسی،
پێم بڵێ! لە دەس کێ رائەکەم؟
لە دەس چوار منداڵە خۆشەویستەکانم
یا لە دەس دایکە ئەمەکدارەکەیان؟
بۆ چی لەم جۆرە وڵاتە رائەکەم
کە دوو سەد میلوێن برای دامێ
کاتێکی رامکرد لە ئێران،
لە دەس هی وەکوو ئێوە نامەداران.
من و بوختان بە وڵاتی خۆشبەختی؟
من وەك ئێوە خووم بە خەیانەت نەگرتوە
راکەم لە دۆست بۆ لای دوژمن؟
نا، نا، من وەکوو تۆ نیم کە دوژمنی ئێرانی.
راکردن لە چاوگەی بەختی ئینسان؟
دنیا ئەزانێ ئەمە درۆ و بوختانە.
تۆ خۆشت ئەزانی بەڵام لەبەر نامەردی
ناوێری راستەکەی دەربڕی.
لە بیری تۆی خوێڕی، بیر تاریکا،
زێڕە، زێڕە فەرمانی ئەمریکا!
تۆ ئەتەوێ خەڵکی وڵاتی من،
لەگەڵ خەڵکی سۆڤیەت ببنە دوژمن.

بڕۆ، بمره، خەڵکی ئەم دوو وڵاتە
هەمیشە دۆست و بران،
تێکڕا تێئەکۆشین بۆ ئاشتی،
بۆ ئینساندۆستی و برایەتی،
ئەم پڕوپووچانەت دەرئەکەوێ،
لەم ئاژاوە نانەوەدا ریسوا ئەبی
ماویەتی...

*سەرچاوە گۆڤاری "هاوار"، چاپی ئاڵمان، ژمارە ١٤ی ساڵی ٢٠٠٣، لاپەڕە ٥٣و ٥٤.

# پاشکۆی حەوتەم

## تەرجەمەی کوردی دوو پارچە شیعری لاهووتی

١) شەرابی سوور: عبدالرحمن زەبیحی

به شای‌لۆغان دەخۆم ئەودەم شەرابی سوور
کە بێتە دەر لە شەرقی ئینقلابدا ئافتابی سوور
قوربانی ئەو دەمەم کە لە خوێنی ستەمگەران
دەریایی ئینقلاب ببی پڕ حبابی سوور
چەند خۆشە ئەو زەمانە بە داژداری چەکچەداس
کوردان لە گەردنی دوژمن بکەن تەنابی سوور!
مەڕژێنە هێندە خوێنی رەنجبەر ئیمڕۆکە، خان!
رۆژی حساب ئەکێشی لە تۆ ئینقلابی سوور
پرسیاری دا بە من لە ئاتیە یی خۆی جەناب
هێنامە پێشی خەنجەرە کەم، ها جوابی سوور
ئاغا شەرابی سووری لە پێشە و لە برسیتی
چاوی پڕە کچی جوتیر لە ئاوی سوور
خۆتان بشون بە خوێنی عەدو کوردە راپەڕن

فتوای شەرعی ئینقلابە بە نصی کتابی سوور
کە نگیٚ دەبیٚ کە دەستی عیلم هەڵبداتەوە
"بێژەن" لە رووی کچە کوردان نقابی سوور

(بە هێندێك دەستکاری لە دیوانی ئەبوالقاسم لاهووتی کوردی کرماشانی تەرجەمە کراوە.)

کوردستان ژمارەی ١٨ ساڵی یەکەم شەممۆ ٤ی رەشەمەی ١٣٢٤ ٢٣ی فوریەی١٩٤٦

٢) چەکی یەکیەتی،
قانع

چەن خۆشە ئەو زەمانە لە کوێستان و خوارو ژوور
فەرقی نیە لە بەینی براو، خوشك و خاڵ و پوور
چەن خۆشە ئەونیزامە، سەراسەر هەموو وڵات
یەك رەنگ و یەك مەبەست و یەك ئاوات و پڕ لە نوور
چەن خۆشەئەو وڵاتە کە جوتیار و رەنجبەران
تیایا ئەبن بە خاوەنی حوکم و سوپای جەسوور
چەن خۆشە ئەو زەمانە کە کوێستان و گەرمیان
یەکسەر ئەبێتە جونبشی دەریای هێزی سوور
ئەی لاوی کورد! بە بیروباوڕی کوردانە یەك گرن
بورکانی ئاگرین بن، لە رووی دوژمنی غروور

بینێنه گۆڕی تارەوە ڕ ە سمی عەشیرەتی
فەرقی مەخەن لە بەینی غەنی دا هەتا مزور
سنعەت بکەن بە هێز و گریکی ولاتەکەت
رازاوەکەن شەقام و تەلار و قەسر و قسوور
لە تۆی دەروونی خاکەوە دەربێنە رۆنی رەش
خڵتەی دەمارەکانی بپاڵێون بۆ بلوور
شۆڕش بکەن لە رووی نەزانین و جەهلدا
تۆوی نیفاق و ئەجنەبی دەرکەن هەتا سنوور
(هاوکاری)! کەن بە مەرج و بناغەی ژیانی گەل
تەوحیدی فکرە، شەرتی ئەساسە، نزیك و دوور
شادم بە ئەوزەمانە کە بە داشداری رەنجبەران*
وەرزێر ئەنێتە گەردنی ئاغا، گوریسی سوور

(*) لە دێرە شیعرێکی لاهووتییەوە وەرگیراوە.
دیوانی قانع، ل٨٧.

# سەرچاوەکان

**سەرچاوەکانی نووسەر بۆ نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە:**


ارین پور، یحیی (١٩٧٨)، "از صباتانیما ـ تاریخ ١٥٠ سالچ ادب فارسی"، جلد اول بازگشت ـ بیداری، جلد دوم ازادی ـ تجدد، امیر کبیر، تهران ١٣٥٧.

اسکندری، ایرج (١٩٧٨)، "خاطرات سیاسی"، به اهتمام بابك امیر خسروی و فریدون ابوذر، بخش ١، نشر جنبش تودەایهای مبارز، فرانسه، ١٣٦٦، بخش ٢ انتشارات حزب دمکراتیك مردم ایران، فرانسه، سال ؟

ئیمامی، سید کامیل (ئاوات) (١٩٨٦)، دیوانی ئاوات سەیید کامیلی ئیمامی زەنبیلی لەسەرنووسین و ئامادەکردنی سەیید نەجمەدینی ئەنیسی، ناشر: انیسی، تاران، ١٣٦٥.

بیات، کاوە (١٩٩٧)، " کودتای لاهووتی ـ تبریز، بهمن ١٣٠٠"، نشر شیرازە، تهران ١٣٧٦.

بیات، کاوە ( ٢٠٠٠) "در کرمانشاه چە گذشت ؟"، مجلە دنیای کتاب سال پنجم، شمارە ٩ و ١٠.

بیات، کاوە (٢٠٠٠) "آنچە در کرمانشاه گذشت "، مجلە دنیای کتاب، شمارە ١٣و١٤.

توحدی، کلیم الله (١٩٩٨)، "حرکت تاریخی کرد به خراسان"، جلد پنجم، نشر مهبان، مشهد ١٣٧٧.

جەلیل، جەلیلی "هەندێ سیمای ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری کورد"، وەرگێڕانی ئەنوەر قادر محەممەد.

حەسەنیانی، عەلی (هاوار) (١٩٨٥)، "شاری ویران"، انتشارات صلاح الدین ایوبی، ورمێ ١٣٦٤ (نامەیەکی مێژوویی).

خاکسار، نەسیم (١٩٩٣)، " سفر تاجیکستان"، کتاب چشم انداز، پاریس، ١٣٧٢.

خامەای، ئەنوەر، (      )،"فرصت بزرگ از دست رفته". (جلد دوم خاطرات)، چاپ دوم، انتشارات نوید، آلمان غربی.

خودادادە، ئەحمەد (١٩٥٥)، چارە رەشی وەرزێر، عەبدوڵڵا مەردۆخ کردوویە بە کوردی، پاریس، پەراوێزی لاپەڕە ھ.

خورسەندی، هادی: سایتی ئینتەرنێتی Asgharaga. Com

حەیرانعەلیشاه، میر محمد صالح حسنی النعمتەاللهی ماهیدەشتی (١٩٨٩)، "کنز العرفان" دیوان حضرت میر محەممەد صالح الحسنی النعمتەاللهی الماهیدەشتی ـ کردی، فارسی، باتصحیح و مقابله و مقدمه و شرح احوال شاعر، به سعی و اهتمام محمد علی سلطانی، چاپ اول، تهران (١٣٦٨).

دولت آبادی، یحیی (١٩٨٣)، "خاطرات"، ج ٣ و ٤، انتشارات فردوسی و عطار، تهران ١٣٦٢.

دولتشاهی، عمادالدین (١٩٨٤)، "جغرافیای غرب ایران یا کوههای ناشناخته اوستا"، ناشر: نویسنده ، تهران ١٣٦٣.

دولتشاهی، عمادالدین (١٩٩٨)، "رستم و سهراب و به روایت اوستا"، چاپ دوم، خیام، تهران ١٣٧٧.

رائین، اسماعیل (١٩٧٨)، "فراموشخانه و فراماسونری در ایران"، جلد اول، انتشارات امیر کبیر، تهران ١٣٥٧.

رائین، اسماعیل (١٩٧٦)، "حیدرخان عمواوغلی"، چاپ سوم، انتشاران جاویدا ٢٥٣٥ (١٣٥٥).

ڕەسووڵ، عزالدین مستەفا، پێشەکی بۆ کتێبی "شاری سلێمانی" نووسین و کۆکردنەوەی ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی ڕەشە، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا.

ژین (گۆڤار) چاپی ئەستەموول، ژمارە ٢٥ ساڵی پێنجەم ، لل ١٨ تا ٢١.

ساسانی، خان ملك (١٩٧٥)، "یادبودهای سفارت استانبول"، انتشارات بابك، تهران ١٣٥٤.

سوڵتان پور، سەعید (١٩٧٩)، صدای میرا، انتشاران امیر کبیر، تهران ١٩٥٨.

سوڵتانی، ئەنوەر (١٩٩٧)، "هێلکەی دۆڕاو- پوختەی باسێك لەسەر ژیانی ئەبوالقاسمی لاهووتی کرماشانی شاعیری شۆڕشگێڕی ئێران"، پاشکۆی ڕۆژنامەی پەیام، ژمارە ١، لەندەن.

سوڵتانی، ئەنوەر (٢٠٠٣)، "لاهووتی کرماشانی ئەمجارە وەك شاعیرێکی کوردیوێژ"، گۆڤاری گزینگ، ژمارە ٣٩و ٤٠، سوید.

سوڵتانی، محەممەد عەلی (١٩٩٩)، "احزاب سیاسی و انجمنهای سری در کرمانشاه - از فراموشخانه تا خانه سیاه، دورەهای ١ تا ٥ انتخابات مجلس شورای ملی و فریادگران بر نظام دیکتاتۆری از کرمانشاه، جلد اول، نشر سها، تهران ١٣٧٨.

سوڵتانی، محەممەد عەلی (٢٠٠٠)، "حدیقه سلطانی"مؤلف و مصحح: محمد علی سلطانی، چاپ اول، نشر سها، تهران ١٣٧٩.

سوڵتانی، محەممەد عەلی (٢٠٠٠)، "پاسخ به نقد"، مجله دنیای کتاب، سال پنجم، شماره ١٣ و ١٤.

سوڵتانی، محەممەد عەلی (٢٠٠٠)، "آنجه در کرمانشاه گـذشت و نگـذشت "، مجله دنیای کتاب، شماره ١٧ و ١٨ .

سنجابی، علی اکبر خان سردار مقتدر سنجابی (٢٠٠١)، "ایل سنجابی و مجاهدت ملی ایران، تحریر و تحشیه دکتر کریم سنجابی، نشر شیرازه، تهران ١٣٨٠.

سنجابی، دکتر کریم (١٩٨٩)، "امیدها و نامیدی‌ها- خاطرات سیاسی دکتر کریم سنجابی، چاپ مرکز پخش کتاب، لندن ١٣٦٨.

شاکری، خوسرەو (١٩٨٩).

Labour Unions, Laws and Conditions In Iran 1900-1941, by Willem Floor, Occasional Papers No. 6, Reviewed by Cosroe Chayweri, Middle East Studies Association Bulletine, Vol. 23, No. 1.

شرفکندی، عبدالرحمن (هەژار) (١٩٧٠)، "بۆ کوردستان"، چاپی جەواهیری، تاران ١٣٥٨.

شفا، شجاع الدین، "گاهنامه پنجاه سال شاهنشاهی پهلوی"، ج ١، سازمان چاپ و انتشارات سهیل، پاریس.

شفیعی کدکنی، محمد رەزا (٢٠٠١)، "ادوار شعر فارسی از مشروطیت تا سقوط سلطنت"، انتشارات سخن، تهران ١٣٨٠.

شێخ الاسلامی، محمد امین (هێمن) تاریك و روون.

طبری، احسان الله (١٩٨٨)، "کژراهه- خاطراتی از حزب توده"، انتشارات امیر کبیر، تهران ١٣٦٧.

قزڵجی، حسن (١٩٥٩)، "لاهووتی شاعیری بەناوبانگی کورد"، گۆڤاری هیوا، ژمارە ١، ساڵی سێهەم، تشرینی دووهەمی ساڵی ١٩٥٩، چاپی دووبارە: پیربال، خوسرەو، گۆڤاری هاوار، چاپی ئاڵمانیا، ژمارە ١٤، ساڵی ٢٠٠٣(٢٠٠٤).

کاراپیتان، غوکاس (١٩٧٦)، "حماسە یپرم"، سازمان چاپ ایران، تهران ٢٥٣٥ (١٣٥٥).

کەریمی، عەلی (١٩٩٩)، ژیان و بەسەرهاتی عەبدولرەحمانی زەبیحی (مامۆستا عولەما)، بنکەی چاپەمەنی زاگرۆس، گوتینبرگ، سوێد، ١٩٩٩.

کەسرەوی، ئەحمەد (١٩٨٤) "تاریخ مشروطە ایران"، ج ١، چاپ ١٦، امیر کبیر، تهران ١٣٦٣(١٩٩٢).

- "تاریخ هیجدە سالە آذربایجان "بازماندە تاریخ مشروطە ایران، چاپ دهم، موسسە انتشارات امیر کبیر، تهران ١٣٧١.

کیانوری، نورالدین (١٩٩٢)، "خاطرات کیانوری"، مؤسسە تحقیقاتی و انتشارات دیدەگاە،انتشارات و اطلاعات، تهران ١٣٧١.

گزینگ (گۆڤار)، چاپی سوید، ژمارە ٢٨ (٢٠٠٠)، ٢٩ (٢٠٠٠)، ٣٩ و ٤٠ (٢٠٠٣).

گۆران، عبدالله (١٩٨٠)، سەرجەمی بەرهەمی گۆران، بەرگی یەکەم، محەممەدی مەلا کەریم کۆی کردۆتەوە، ئامادەی کردووە و پێشەکی بۆ نووسیوە، یەکیەتی نووسەرانی کورد، کۆڕی زانیاری عیراق، بەغدا.

لاهووتی، ابوالقاسم (١٩٢٣)، "کورد و کوردستان"، دوکتۆر جەبار قادر لە رووسیەوە کردوویە بە کوردی و پێشەکی و تێبینی بۆ نووسیوە، چاپەمەنی و کتێبفرۆشی گلارا (رۆتردام) هۆلەندە ١٩٩٨.

ـ (١٩٤١)، "دیوان لاهووتی"، مقدمە بقلم محمد لوی عباسی، تبریز، ١٣٢١.

ـ (١٩٥٣)، شرح زندگانی من، بقلم ابوالقاسم لاهووتی، پاکستان (؟) ١٩٣٢ (جعلی).

ـ (١٩٥٧)، "دیوان لاهووتی، اشعار سالهای مختلف"، ادارە نشریات بزبانهای خارجی، مسکو (١٩٧٨).

ـ (١٩٧٨)،"کلیات ابوالقاسم لاهووتی" با کوشش بهروز مشیری، انتشارات توکا، تهران ١٣٥٧.

ـ (١٩٧٩)، "دیوان ابوالقاسم لاهووتی (١٣٣ ـ ١٢٦٣"با مقدمە و زندگینامە کامل و زیر نویسی و شرح لغات و اصطلاحات، بە کوشش و گرد آوری احمد بشیری، انتشارات امیر کبیر، تهران ١٣٥٨.

ـ (١٩٥٤)، "سەبارەت بە خۆم" نووسینی ابوالقاسم لاهووتی، بۆ تایبەتمەندییەکانی ئەم وتارە بڕوانە پەراوێزی یەکەمی پاشکۆی ژمارە ١

معتمد الوزارە، رحمت الله خان (٢٠٠٠)، "ارومیە در محاربە عالم سوز ـ از مقدمە نصارا تا بلوای اسماعیل اقا ١٣٠٠ ـ ١٢٩٨ شمسی"، بە کوشش کاوە بیات، جلد ١، نشر شیرازە، تهران ١٣٧٩.

مونیبور، رەحمان (١٩٨٦):

Munibur, Rahman; "Lahuti", The Encyclopaedia of Islam, New Edition, Vol. v, E.J. Brill, Leiden, 1986.

مەردۆخ، عەبدوڵلا. بڕوانە خودادادە، ئەحمەد.

میرزا صالح ، غلام رضا (۱۹۸٦)، "جنبش میرزا کوچك خان جنگلی بنا بر گزارشهای سفارت انگلیس "مترجم غلام رضا میرزا صالح، نشر تاریخ ایران، ۱۳٦٥ تهران.

نفیسی، سعید (۱۹٤٦)، "ابوالقاسم لاهووتی (۱۹٥۷ ـ ۱۸۸۷)، بەبۆنەی چاپی هەڵبژاردەی شیعرەکانیەوە، بۆ تایبەتمەندییەکانی ئەم وتارە بڕوانە پاشکۆی ژمارە سێهەم.

ووستنفلد، فردیناند + ماهلر، ادوارد (۱۹۸۲)، "تقویم تطبیقی هزارو پانصد ساله هجری قمری و میلادی با راهنمای تبدیل تاریخ هجری شمسی به میلادی و بالعکس"، با مقدمه و تجدید نظر از دکتر حکم الدین قریشی، فرهنگسرای نیاوران، تهران۱۳٦۰.

وەلی، عەبباس (     ).

هدایت، مهدیقلی (مخبر السلطنه) (۱۹۸٤)، "خاطرات و خطرات ـ توشەای از تاریخ شش پادشاه و گوشەای از زندگی من"، کتابفروشی زوار، چاپ چهارم، تهران ۱۳٦۳.

# بەرهەمی دیکەی ئەنوەر سوڵتانی

**چاپکراو**

١٩٩٥ نووسینی کوردی بە ئەلف و بێی لاتینی، وەرگێڕانی سێ وتاری ئێدمۆندز و مینۆرسکی لە ئینگلیزییەوە، چاپی کتێبی ئەرزان سوید،

١٩٩٦ ٢١ دەستنووسی کوردی (یا فارسی سەبارەت بە کورد) لە کتێبخانەکانی بریتانیا، کتێبی ئەرزان، سوید،

١٩٩٧ هێلکەی دۆڕاو - پوختەی باسێك لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی لاهووتی شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، پاشکۆی رۆژنامەی پەیام، ژمارە ١، لەندەن،

١٩٩٧ ٣٥ دەستنووسی شەرەفنامەی بەدلیسی لە کتێبخانەکانی جیهان، کتێبی ئەرزان، سوید.

١٩٩٧ مێژووی ئەردەڵان ـدەستنووسێکی فارسی و تەرجەمەی کوردی، بە هاوکاری خاتوو نەسرین بوڕنا، چاپەمەنی نەورۆز، سوید.

١٩٩٨ کەشکۆڵە شیعرێکی کوردی گۆرانی - دەستنووسێکی کۆن، گردە کۆیی شێخ عبدالمومن مەردۆخی، بە سەرەتای کتێبخانەی بریتانیاوە، چاپی ترەستی سۆن بۆ کوردستان، لەندەن.

٢٠٠٢ مینۆرسکی و کورد- کۆمەڵەی شەش وتاری مینۆرسکی لەسەر کورد چاپی دەزگای چاپی موکریانی، هەولێر. بە داخەوە لە

چاپی یەکەمی کتێبەکەدا یەك لە وتارە گرنگەکانی لەکاتی چاپدا نەگیراوەتە بەر چاوو بڵاونەکراوەتەوە.

٢٠٠٣ تاقیکردنەوەی تیۆری بۆ شۆفێریی ئۆتۆمبیل (ئیمتیحانی نەزەری بە زمانی کوردی)، چاپی رەسمی مۆڵەت پێدراو لەلایەن ئاژانسی لێخوڕینی ئۆتۆمبیل ـ بریتانیا، بە هاوکاریی محەممەد گەردی و سەربەست کەرکووکی، پیاچوونەوە و ئامادەکردن بۆ چاپ: رێبوار موختار، چاپی ئاژانسی ناوبراو، لەندەن،

٢٠٠٥ رۆژهەڵاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا۔ کۆمەڵەی ١٣٠ بەڵگەنامە، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، سلێمانی، بنکەی ژین.

٢٠٠٠٤ مەکەنزی و کورد۔ کۆمەڵەی چوار وتاری د. دەیڤید مەکەنزی لەسەر زمان وئەدەبی کوردی، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، فایلی تایبەت بە مەکەنزی ، ژمارەی یەکەمی گۆڤاری "کورد ناسی"، ئاڵمانیا.

٢٠٠٥ درایڤرو کورد۔ کۆمەڵەی پێنج وتاری ج. ر. درایڤر لەسەر کورد، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، سلێمانی، بنکەی ژین.

### ئامادەی چاپ

1. هۆز و تیرە و تایفەی کورد لە کوردستانی ئەردەڵان، دەستنووسێکی سەدەی نۆزدەهەم ، دەقی فارسی و تەرجەمەی کوردی بە سەرەتا و پەراوێزەوە.

٢. جەیمز جۆیسی شاعیر، وەرگێڕانی ٥٠ پارچە شیعری جەیمز جۆیس ـ نووسەری بەناوبانگی ئیرلەندی.

٣. سڵاو لە حەیدەربابا ـ وەرگێڕای کوردی شیعرێکی بەرزی محمد حسین شەهریار شاعیری ناسراوی ئازەربایجانی، وەرگێڕان لە ئازەربایجانییەوە بە هاوکاری حەسەن ئەییووبزادە.

## کارەکانی تر

١. "کاچوو مادانی"- کۆی بیرەوەرییەکانم.

٢. راپەڕینی شێخ عوبەیدیلڵای شەمزینی- کۆمەڵە یادداشتی رۆژانەی میرزا عەلی ئەفشاری ئورومی، دەستنووسێکی فارسی.

٣. خرۆشۆف و کەمپەینی دژی ستالینی، نووسینی کاثی مەجید، وەرگێڕان لەئینگلیزییەوە.

٤. وەرگێڕانی ١٢ کتێبی منداڵان بە کوردی و ٥ کتێبی تر بە فارسی بۆ بنکەی (مانترا) لە لەندەن. ئەم کتێبانە کە هەندێکیان تائێستا بڵاوکراونەتەوە بە دوو زمان چاپ دەبن: ئینگلیزی و کوردی یا ئینگلیزی و فارسی.